# خاڵ

گۆڤارێکی هزریی ڕۆشنبیریی وەرزییە، ژمارە (٣١) شوباتی، ٢٠٢١

بە سپۆنسەری سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی

خاوەنی ئیمتیاز و سەرنووسەر
تۆفیق کەریم

٠٧٥١١٤١٢٥٤٣ - ٠٧٧٣٢٦٣٧٦٦٤
tofeqkarem@yahoo.com

بەڕێوەبەری نووسین: عادل سدیق

بەڕێوەبەری هونەریی: ڕەوشت محەمەد

ڕاوێژکاری یاسایی: بەکر حەمەسدیق

**دەستەی نووسەران**

د. ئیسماعیل بەرزنجی

ڕێدار ئەحمەد

ئیسماعیل تەها

د. مەریوان حەمەدەروێش

د. حسێن محەمەد ئیبراهیم

**دەستەی ڕاوێژکاران**

پ. د.موحسین عەبدولحەمید

پ. د. سەباح بەرزنجی

پ. د. عوسمان هەڵەبجەیی

پ.ی. د. عوسمان عەلی

پ.ی. د. ئیسماعیل بەرزنجی

م.ی. ئیدریس سیوەیلی

سایتی گۆڤاری خاڵ
www.xallkurd.com

تیراژ: ١٥٠٠
نرخ: ١٥٠٠ دینار

# ناوەڕۆك

## تەوەری ژمارە:



## بابەتی گشتی:





# سەروتار

لەم ژمارەی گۆڤاری (خاڵ)ەوە، خوێنەری هێژا چەند گۆڕانکارییەک دەبینێت کە بەسەر گۆڤارەکەدا هاتوون، ڕەنگە بچوکبوونەوەی قەبارەی گۆڤارەکە دیارترینیان بێت، هەوڵی بە زانستیکردنی بابەتەکانی و ڕوونان لە پسپۆڕان کە بەشداربن لەو تەوەرانەی دەنووسرێن لەم ژمارەوە زیاتر جەختی لێدەکرێتەوە. هەروەک سی ژمارەی ڕابردووش گۆڤاری (خاڵ) سەکۆی سەرجەم قەڵەمە بە بڕشتەکان دەبێت لە بواری تایبەتمەندی خۆیاندا، بەبێ ڕەچاوکردنی ئایدیا و پاشخانی ڕۆشنبیری و بۆچوونی نووسەر، گرنگ ئەوەیە قسەیەکی نوێ، زانیاریەکی نەگوتراو، بابەتێکی بایەخدار بە پشتبەستن بە لۆژیک و بەڵگەی زانستی و سەرچاوەی متمانەپێکراو بخرێتە ڕوو، کە گۆڤارەکەی پێ دەوڵەمەند بکرێت و خوێنەر سوودی لێ وەربگرێت.

لەگەڵ ئەوەی گۆڤاری (خاڵ) دەستەیەکی شارەزای ڕاوێژکاری هەیە و ڕاوێژیان پێ دەکرێت و دەستەیەکی نووسەرانی بەتوانای هەیە کە بۆ هەموو ژمارەیەک کۆدەبنەوە و ڕاوێژ دەکەن و تەوەری ژمارە دیاری دەکەن و بڕیار لەسەر گۆڕانکارییەکانی گۆڤارەکە دەدەن، بەڵام هێشتا پێویستی زۆرمان بە ڕاوێژکاری و پێشنیازی خوێنەرانمانە لە بوارە جیاوازەکانمدا. جیهانی ڕاگەیاندن جیهانێکی گۆڕاوە و بەخێرایی هەنگاو بەرەوپێشەوە دەنێت، (خاڵ) مەبەستیەتی بەو گۆڕانکارییانەدا ڕابگا، هەر ئەوەشە وایلێکردووە لەم تەمەنە کورتەیدا ناوبەناو کۆمەڵێک گۆڕانکاری ئەنجامدات، داوامانە لە تۆی خوێنەر یاریدەدەر و بەشدارمان بیت لە هەنگاوەکانماندا.

**خوێنەری بەڕێز:** مەبەستمانە ئاگادار بیت سەرجەم ئەو مامۆستایانەی وەک ڕاوێژکار و دەستەی نووسەرانی خاڵ بەشدارن، زەحمەتەکەیان خۆبەخشانە و بێ بەرامبەرە، ئەمەش جێگەی پێزانین و ڕێز و سوپاسکردنە. سەنتەری زەهاویش کە سپۆنسەری (خاڵ) دەکات لەم دۆخە پڕ قەیرانەی ئابووریدا، بەبێ مەرج و سنووردانان، زۆر جێگەی دەستخۆشی و تەقدیرە، بێگومان سەرچاوە و هۆکاری سەرەکی بەردەوامبوونی گۆڤاری (خاڵ)ە.

ئەو دەزگا و کەسێتی و خوێنەرە بەڕێزانەش کە بەشدارن لە کڕین و بڵاوکردنەوەی (خاڵ)، وورەی زیاترمان پێدەبەخشن و هاندەری گەورەمانن، بەهەمانشێوە ئەو دۆستانەش کە پڕۆژەکانی (خاڵ)یان لا پەسەند بووە و پشتیوانیان کردووە. سەرجەم ئەو هەماهەنگییانە بووەتە هۆی ئەوەی (خاڵ) بە شانازییەوە ببێتە مەڵۆیەک بۆ سەر خەرمانی ڕاگەیاندنی کوردی ئامانجدار و لە بواری هزر و ڕۆشنبیریشدا بووەتە مۆمێک بۆ ڕامالینی تاریکی و ڕەواندنەوەی تەمومژی ئایدیایی لەسەر بیروباوەڕی نەتەوەکەی.

## تەوەری داهاتوو

# قەیرانی ئابووری هاوچەرخ

## لەدیدگای سیستمی ئابووری ئیسلامییەوە

لە کاتێکدا جیهان بە دەست قەیران و کێشەی ئابووری و دارایی قووڵەوە دەناڵێنێت و تا دێت جیاوازی نێوان چینەکان فراوانتر و قووڵتر دەبێتەوە، سیستمی سەرمایەداریش تا دێت سەرکێشتر و پاوانخوازتر دەبێت، ئێمە دەپرسین ئەنجامی ئەم بارودۆخە بەکوێ دەگات؟ ئایا ئەم سیستمە لەهەناوی خۆیدا هەڵگری دژیەکی و کێشەی قووڵ نیە کە ئاوا لە واقیعدا بەرجەستە دەبێت؟ ئیدی کاتی ئەوە نەهاتووە مرۆڤایەتی بە دوای ئەلتەرناتیڤێکی دیکەدا بگەڕێت بۆ سەرلەنوێ دابەشکردنەوەی داهات لەسەر بنەمای دادگەریی؟ بۆیە داواکارین لە پسپۆڕان و ڕۆشنفکران لەم تەوەرانەی خوارەوە نووسینەکانیان بنێرن بۆ خاڵ:

١. دژیەکی و تێکگیرانە فیکریەکانی سیستمی سەرمایەداری و گرنگترین ئەو ڕەخنانەی ئاڕاستەی دەکرێن چین؟

٢. تا چەند چەمکی بازاڕی ئازاد و لاوازکردنی ڕۆڵی دەوڵەت لە چاودێری و خۆتێهەڵقورتاندنی لە بازاڕ بووەتە هۆی ناعەدالەتی لە دابەشکردنی داهاتدا؟

٣. ئایا ڕۆڵی کەرتی تایبەت زیاد لە قەبارەی خۆی نابێتە هۆی قۆرخکاری زیاتر تا ڕادەی چەوساندنەوە؟

٤. ڕووکردنە بازاڕی پشکەکان و ئاڵوگۆڕی دراو و قەواڵە داراییەکان چ زیانێکی بە ئابووری ڕاستەقینە و کۆی بەرهەمی ناوخۆیی گەیاندووە؟

٥. کەڵەکەبوونی قەرزی گشتی و زیادبوونی بەشێوەیەکی پێوانەیی لە جیهاندا بەرەوکوێ دەچێت؟

٦. تا چەند ئەو چارەسەرانەی دامەزراوە ئابوورییەکانی جیهان پێشکەشی وڵاتانی هەژار و پەککەوتووی دەکەن دەبێتە هۆی هەستانەوە.

٧. ئایا پێنوێنی گەشەی ئابووری (مؤشر النمو الاقتصادي) تا چ ڕادەیەک مانای خۆشگوزەرانی ڕاستەقینەی هاوڵاتیان دەگەیەنێت؟

٨. سیستمی ئابووری ئیسلامی چییە؟ ڕواڵەت و بنەماکانی کامانەن؟

٩. ـ ئابووری ئیسلامی چ چارەسەر و ئەلتەرناتیڤێکی پێیە بۆ ئەم دۆخەی جیهان؟

١٠. دادگەریی و ئەخلاق وەک دوو بنەمای سەرەکی دابەشکردنی داهات لە ئابووری ئیسلامیدا.

١١. تیۆروانینی مەقاسیدی بۆ قەرزدان، سووخۆری، زەکات، قۆرکاری، بەیتولمال، قازانج.



# تەوەری ژمارە

## لێکەوتەکانی فیکریی و کەلتوورییەکانی کۆرۆنا

## جیهان لە ئاستانەی سیستمێکی نوێدا

زیاتر لە ساڵێکە جیهان بەدەستی ڤایرۆسی کۆرۆناوە گیری خواردووە، ئەم تێکگیرانە شوێنەواری گەورەی لێکەوتووەتەوە، بە دڵنیاییەوە شوێنەواری دیکەشی لێدەکەوێتەوە و هێشتا بە کۆتا نەگەیشتووە. (خاڵ) ئەم ژمارە بۆ لێکەوتە فیکری و کلتوورییەکانی دوای هاتنی ئەم ڤایرۆسە تەرخانکردووە، کۆمەڵێک پرسیاری قووڵ و گرنگی وروژاند، بەو ئومێدەی هەڵدانەوەی ئەو دەرکەوتانە و نووسەرانی بەڕێز بتوانن توێژینەوەیان لەسەر بکەن.

خوێنەری بەڕێز:

ڕەنگە ئەم توێژینەوە و بابەتانەی لەم ژمارەدا هێشتا تینوێتیمان نەشکێنن، چونکە بابەتەکە نوێیە و تا ئێستاش بەردەوامە و مشتومڕی زۆریشی لەسەر دەکرێت، تەنانەت لە ئاستی وڵاتاندا هەیانە بە دەستی دەزگا هەواڵگرییەکانی دەزانن، هەشیانە تیشکی ڕاگەیاندنی وڵاتەکەی لەسەر سنووردار کردووە. جگە لەو پێشبڕکێ جیهانییەی کە وڵاتە پێشکەوتووەکان دەیکەن لەسەر قۆستنەوە و سوودوەرگرتن لە دەرئەنجامەکانی.

ئەم تێڕوانینەی وڵاتان لە ئاستی ڕاگەیاندنەکانیشدا ڕەنگیداوەتەوە، تەنانەت داشبەزیوە بۆ ناو بەشێک لە زانا و توێژەر و پسپۆڕانیش. بۆیە دەکرێت لەمە بەدواوەش قسەی زیاتر لەسەر دەرکەوتەکانی کۆرۆنا بکرێت، تا ئەو کاتە فەرموون لەگەڵ تەوەری ئەم ژمارەیە و بیروبۆچوونی پسپۆڕ و ڕۆشنبیر و نووسەران لەو بوارەدا.



**د.کاوە فەرەج سەعدون**
پسپۆڕی نەخۆشییەکانی سنگ و
کۆئەندامی هەناسە

# نەخۆشی ڤایرەسی کۆرۆنا (COVID 19)

نەخۆشییەکی کتوپڕە بەهۆی جۆرێکی ڤایرەسی کۆرۆنا کە ناسراوە بە ڤایرەسی کۆرۆنای نوێ، یان ڤایرەسی کۆنیشانەی سەختی کتوپڕی هەناسەی دووەم (SARS-CoV-٢)هوە تووشی مرۆڤەکان دەبێت، ئەم ڤایرەسە لە جۆری (RNA) ڤایرەسە، ئەم نەخۆشییە سەرەتا لە دیسەمبەری ٢٠١٩ ڕیپۆرت کرا لە شاری ووهانی ناوچەی هوبەی لە وڵاتی چین و لەوکاتەشەوە بەسەرانسەری جیهاندا بڵاوبووەتەوە، ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی لە ڕۆژی ٢٠٢٠/٣/١١ ئەم نەخۆشییەی وەك پەتایەکی جیهانی (Global Pandemic) ناساند، تا ڕۆژی ٢٠٢٠/١٢/٢٨ زیاتر لە ٨٠ ملیۆن کەس لە هەموو جیهاندا تووشی نەخۆشییەکە بوون و زیاتر لە ١ملیۆن و ٧٦٥هەزار کەس پێی مردوون.

ئەوەی باوەڕپێکراوە ئەوەیە کە سەرچاوەی ئەم ڤایرەسە لە ئاژەڵەوە بۆ مرۆڤ گوازراوەتەوە و لێکچوونێکی تەواو لە پێکهاتەی جیناتی نێوان ئەم جۆرە و ئەو جۆرانەی لە شەمشەمەکوێرەدا هەیە، بەڵام لەبەر نەبوونی بەریەککەوتنی پێویست لە نێوان مرۆڤ و شەمشەمەکوێرەدا وا باوەڕ دەکرێت کە ئاژەڵێکی تر نێوەندگیریی کردبێت بۆ گواستنەوەی لە شەمشەمەکوێرەوە بۆ مرۆڤ و دواتر بڵاوبوونەوەی لە نێوان مرۆڤەکاندا، کە تائێستا بەتەواوەتی ئەم ئاژەڵە نەناسراوە و توێژینەوە زانستییەکان بۆ ناسینەوەی بەردەوامە، ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی (WHO) ڕایگەیاند کە هیچ جۆرە بەڵگەیەک نییە لەسەر ئەوەی ئەم ڤایرەسە دەستکاریی کرابێت یان دروستکرابێت و بە ئەنقەست لە نێوان مرۆڤەکاندا بڵاوکرابێتەوە.

**ڕێگاکان وچۆنێتی گواستنەوە:**

گواستنەوەی ڤایرەسەکە لە مرۆڤێکەوە بۆ مرۆڤێکی تر لەڕێی بەریەککەوتنی نزیکەوە دەبێت لە نێوان مرۆڤەکاندا لە دووریی ٦پێ یان ٢مەتر و کەمترەوە دەبێت، بەهۆی ئەو پرژانەی لە دەمی کەسی تووشبووەوە دێنە دەرەوە (Droplet infection) لە دوای پژمین یان کۆکین یان قسەکردن یان هەناسەدان کە لەوانەیە بۆ چەند کاتژمێرێک بە هەڵواسراویی لە هەوادا بمێنێتەوە و دواتر کەسێکی تر ڕاستەوخۆ ئەم پرژانە وەرگرێت لەڕێی هەناسەدانەوە و بچێتە کۆئەندامی هەناسەیەوە لەوانەیە تووشی نەخۆشییەکە ببێت کە ئەمە ڕێگای سەرەکی تووشبوونە، هەروەها ئەم پرژانە لەوانەیە لەسەر ڕووی تەنەکان بنیشێت و کاتێک کەسێک دەست لەم ڕووانە دەدات دەبێتە هەڵگری ڤایرەسەکە لەسەر دەستی و داتر کە دەست بۆ لووت و دەم و چاوی دەبات ڤایرەسەکە دەنێرێت بۆ کۆئەندامی هەناسەی و تووش دەبێت، کە ئەم ڕێگایەیان کەمتر ڤایرەسەکە لە نێوان مرۆڤەکاندا بڵاودەکاتەوە، چەندین ڕێگای تر بۆ گواستنەوە باسکراوە کە گرنگییەکی ئەوتۆیان نییە لە گواستنەوەی ڤایرەسەکە لە نێوان مرۆڤەکاندا.

لەگەڵ وەرگرتنی ڤایرەسەکە زیاتر دەچێتە ناو ئەو خانانەی کە وەرگری (ACE) لەسەر دیواری خانەکەیان هەیە کە بەزۆریی خانەکانی کۆئەندامی هەناسەن لە لووت و دەمەوە بۆ خوارتر، کەسی تووشبوو دەست دەکات بە بڵاوکردنەوەی ڤایرەسەکە بەهەمان شێوە، تەنانەت چەند ڕۆژێکیش پێش دەرکەوتنی نیشانەکانی نەخۆشییەکە تێیدا، بەشێوەیەکی گشتی ماوەی بڵاوکردنەوەی ڤایرەسەکە لە نێوان (٧-١٠) ڕۆژ دەخایەنێت کە لەوانەیە لەوانەدا کە بەسەختی نەخۆشییەکەیان گرتووە زیاتر بێت، لە ڕۆژەکانی سەرەتای تووشبووندا بڵاوکردنەوەی ڤایرەسەکە لە کەسی تووشبووەوە بەهێزترە.

## نیشانەکانی نەخۆشییەکە:

لە بەشێکی مرۆڤەکاندا ڤایرەسەکە هیچ نیشانەیەک دروست ناکات (Asymptomatic infection) و تەنها لە پشکنینی تاقیگەییدا دەردەکەوێت کە ڤایرەسەکەیان وەرگرتووە، مەترسیی ئەم جۆرە تووشبوونە لە بڵاوکردنەوەیەتی لەلایەن کەسی تووشبوو کە لەوانەیە خۆی نەپارێزێت و خەڵکیش خۆیانی لێ نەپارێزن، و بینراوە کە هەمان ڕێژەی ڤایرەسەکە لە بەشی سەرەوەی کۆئەندامی هەناسەی بوونی هەیە بە بەراورد بەو کەسانەی کە نیشانەیان هەیە، ڕێژەی ئەم جۆرەی تووشبوون لەوانەیە بگاتە ٣٠-٤٠٪ی سەرجەم تووشبووانی ڤایرەسی کۆرۆنا، ئەو حاڵەتانەی تر کە نیشانەکانی نەخۆشی ڤایرەسی کۆرۆنایان هەیە قورسی نەخۆشییەکەیان بەم جۆرەیە:

- حاڵەتە سووکەکان: زۆربەی نەخۆشەکانی کۆرۆنا پێکدێنن، کە یان نییە یان کەمێک هەوکردنی سییەکانیان هەیە و ڕێژەی ٨٠٪ی نەخۆشەکانی کۆرۆنا بەم شێوەیە دەیگرن.
- حاڵەتە قورسەکان: کە تەنگەنەفەسی و دابەزینی ڕێژەی ئۆکسجینی خوێنیان هەیە و زیاتر لە ٥٠٪ی سییەکانیان تووشی هەوکردن دەبێت لەو وێنە تیشکییانەی بۆیان دەگیرێت، ئەمان ڕێژەی ١٥٪ی نەخۆشانی کۆرۆنا پێکدێنن.
-حاڵەتە ناجێگیرەکان: ئەوانەن کە سییەکانیان تووشی شکستبوون (Respiratory Failure) بووە یان تووشی شۆکبوون یان فرە شکستهێنانی ئەندامەکانی جەستە (Multiorgan Failure ) بوون، ئەمانە ٥٪ی حاڵەتەکانی کۆرۆنان.

حاڵەتی قورس یان ناجێگیر لەوانەیە لە کەسانی تەندروستیشدا ڕوودەن، بەڵام بەزۆریی لەو کەسانەدایە کە بەتەمەنن (سەروو ٦٠ساڵ) یان نەخۆشی تریان هەیە، وەک نەخۆشییە درێژخایەنەکانی سییەکان و دڵ، شەکرە، بەرزە پەستانی خوێن، شێرپەنجە، نەخۆشییە درێژخایەنەکانی گورچیلە، قەڵەویی و جگەرەکێشان.

ڕێژەی مردن بە کۆرۆنا لە نێوان ٢-٣٪یە، بەڵام ڕێژەی مردن لەو کەسانەی داخلی نەخۆشخانە دەبن زیاترە و بینراوە ٦٠٪ی ئەوانەی کە ئامێری هەناسەدانی دەستکردیان بۆ بەکاردێت گیانلەدەست دەدەن، گیانلەدەستدان بەهۆی کۆرۆناوە زۆر زیاترە لە زۆربەی نەخۆشییە درمییەکانی تر، بۆ نموونە ڕێژەی مردن بەهۆی کۆرۆنا لەچاو ڤایرەسی ئەنفلوەنزا پێنج هێندەیە.

ماوەی گۆشگرتن (Incubation Period) کە بریتییە لەو ماوەیەی ڤایرەسەکە لە لەشدا دەمێنێتەوە و گەشە دەکات پێش دروستبوونی نیشانەکانی نەخۆشییەکە، بینراوە لە نەخۆشی ڤایرەسی کۆرۆنادا بەگشتی ١٤ ڕۆژە دوای دووچاربوون بە ڤایرەسەکە کە زۆربەیان بەنزیکەیی ٤-٥ ڕۆژە.

سەرەتای نیشانەکان بە گیان ئێشە و سەرئێشە و تاو و لەرز دەستپێدەکات کە لە

هەمووی باوترە، لەگەڵ کۆکەی وشک و قورگخوران و لووتگیران و لەوانەشە سکچوون و لەدەستدانی بۆنکردن و تامکردن و نەمانی ئارەزوو بۆ خواردنی لەگەڵدا بێت، هەوکردنی سییەکان بریتییە لە بڵاوترین سیناریۆ گرنگەکانی کۆرۆنا کە نیشانەکانی کۆکە و تاو و هەناسەتوندی لەگەڵدایە و بەبوونی پەڵەی هەوکردن لە هەردوو سییەکاندا کە لەڕێی وێنەی تیشکی سییەکانەوە دەبینرێت دەناسرێتەوە.

لە ئاکامەکانی حاڵەتە قورسەکان بریتییە لە ڕوودانی شکسهێنانی سییەکان بەهۆی دروستبوونی حاڵەتی (ARDS)، هەروەها لەوانەیە کێشە بۆ دڵ و کۆئەندامی سووڕانی خوێن دروست ببێت وەک: نارێکوپێکی لە لێدانی دڵ، برینداربوونی دڵی کتوپڕ، خەستبوون و مەیینی خوێن بەتایبەتی لە لوولەکانی خوێنی سییەکان و گیرانیانیان یان دروستبوونی جەڵتەی مێشک، لە زۆرێک لە حاڵەتە قورسەکاندا بەهۆی زیادبوونی فاکتەرەکانی هەوکردن لە لەشدا حاڵەتێک ڕوودەدات کە پێی دەوترێت ڕەشەبای ماددە چالاکەکان (Cytokine Storm) کە دەبنەهۆی دروستبوونی تای بەردەوام و هەوکردنی سەختی سییەکان و خوێن مەیین و چەندین ئاکامی تری زیانبەخش، زۆربەی نەخۆشە سووکەکان بەبێ هیچ چارەسەرێک چاکدەبنەوە کە بەگشتی زۆربەی نەخۆشەکان لە ماوەی دوو هەفتەدا چاکدەبنەوە، بەڵام لە نەخۆشە قورسەکاندا چاکبوونەوە زۆر زیاتر دەخایەنێت کە لەوانەیە ٢-٣ مانگ بخایەنێت، تەنانەت دوای چاکبوونەوەش هەندێک لە نەخۆشەکان چەند نیشانەیەکیان تێدا دەمێنێت وەک: بێهێزیی، هەناسە توندی، ئارەق کردنەوە، ئازاری سنگ و کۆکە.

### دەستنیشانکردنی نەخۆشییەکە و تێستە تاقیگەییەکان:

پشکنینی خوێن لەو نەخۆشانەی کۆرۆنا کە داخلی نەخۆشخانە بوون یان حاڵەتێکی قورسیان گرتووە بریتییە لە: دابەزینی خڕۆکە سپییەکانی خوێن (Lymphopenia)، بەرزبوونەوەی نیشانەکانی هەوکردن وەک (LDH، C-reactive protein، Ferritin، ESR، D-dimer )، وێنەی تیشکیی سنگ (Chest Radiograph) لە سەرەتای نەخۆشییەکە یان لە حاڵەتە سووکەکاندا لەوانەیە ئاسایی بێت، نیشانە باوەکان لە وێنەی تیشکی ئاسایی یان تەنویری (CT Scan) بریتییە لە پەڵەکانی هەوکردن یان وەک شووشەی وردکراو دەردەکەوێت کە لەوانەیە هەردوو سییەکان بگرێتەوە بەتایبەتی بەشی خوارەوە و لاکانی سییەکان.

پشکنینی کۆتایی و تایبەت بۆ دۆزینەوەی ڤایرەسەکە پێویستە لە کەسانی گومانلێکراودا ئەنجام بدرێت، ئەویش لەڕێی پشکنین بە ئامێری (RT-PCR) بۆ ئەو نموونانەی لە بەشی سەرەوەی کۆئەندامی هەناسە وەردەگیرێت بەتایبەتی لووت، باشترین کات بۆ بەدەستهێنانی تێستێکی پۆزەتیڤ و دۆزینەوەی ڤایرەسەکە لە هەفتەی یەکەمی دوای

دەرکەوتنی نیشانەکانی نەخۆشییەکەدایە، لە هەفتەکانی دواتردا چانسی دۆزینەوەی ڤایرەسەکە بەهۆی ئەم پشکنینەوە کەمتر دەبێتەوە، کە دوای ١٥ ڕۆژ تێستەکە دەبێتە نێگەتیڤ لەو کەسانەدا کە چاکبوونەتەوە، لەوانەیە بۆ چەند هەفتەیەکیش دوای چاکبوونەوە ئەم پشکنینە هەر پۆزەتیڤ بێت کە توێژینەوە نوێکان دەڵێن ئەمە زیاتر ڤایرەسی مردووە یان پارچە ڤایرەسە کە نەخۆشەکە دەریدەدات و ترسی نییە لە تووشکردنی کەسانی تردا.

پشکنینی بەرگریی (یان سیرۆلۆجی) بەکاردێت بۆ دۆزینەوەی نەخۆشییەکە لە کۆتاییەکەیدا یان دوای چاکبوونەوەی نەخۆشەکە، چونکە ڕاددەی بەرگریی کەسەکە دەردەخات دژی ڤایرەسی کۆرۆنا (بوونی دژە تەنەکانی IgG،IgM لەخوێندا)، پشکنینەکە بۆ خوێن ئەنجام دەدرێت کە دوای نزیکەی ٣-٤ هەفتە لە پەیدابوونی نیشانەکان پۆزەتیڤ دەبێت.

## خۆپارێزیی لە دژی تووشبوون بە ڤایرەسی کۆرۆنا:

لە پێش بیرکردنەوە لە چارەسەر پێویستە کاربکرێت بۆ خۆپارێزیی لە دژی تووشبوون بەنەخۆشی ڤایرەسی کۆرۆنا، چ خۆپارێزیی گشتی بێت بۆ هەموو کۆمەڵگە یان خۆپارێزیی تایبەت بە تاکەکانی کۆمەڵگە کە ئەنجامی بدەن، زۆر بەسادەیی دەتوانیت سەلامەت بیت لە کۆرۆنا بە جێبەجێکردنی چەند ڕێنماییەکی خۆپارێزیی گرنگ، دوورکەوتنەوەی کۆمەڵایەتی بەردەوام بەوەی ماوەی ١,٥ تا ٢مەتر لە نێوان تۆ و خەڵکانی تردا هەبێت، دوورکەوتنەوە لە قەرەباڵغی، پۆشینی ماسک و دەمامک بەتایبەتی لە شوێنە قەرەباڵغەکان،ماڵەکان و شوێنەکان هەواگۆڕکێی بەردەوام و باشی هەبێت، بەردەوام دەستەکانت پاکژبکەرەوە بەشوشتن یان بەکارهێنانی ماددەی کحولی پاککەرەوە، هەرکەسێک کۆکە و پژمینی هەبوو دەبێت دایبپۆشێت بەدەستەکانی یان کلینیکس یان بە چەمانەوەی ئانیشکی بەسەر دەمیدا

## چارەسەر کردن:

دەستنیشانکردنی حاڵەتەکانی نەخۆشی ڤایرەسی کۆرۆنا تەنها لەلایەن پزیشکی پسپۆڕی هەناسەدانەوە دەبێت و بەهیچ شێوەیەک نابێت نەخۆش خۆی دەستنیشانی نەخۆشییەکەی یان ڕاددەی قورسییەکەی بکات، زۆربەی هەرە زۆری حاڵەتەکانی نەخۆشی ڤایرەسی کۆرۆنا بەشێوەیەکی سووک دەبێت و لەوانەیە هیچ جۆرە دەرمانێکی نەوێت، گرنگترین هەنگاو کە کەسانێکی نەخۆش بینێن بریتییە لە خۆجیاکردنەوە لە کەسانی تر و خۆکەرەنتین کردن لە ماڵەوە، پێویستە پشوو بدەن لە جێگادا، ڕێژەیەکی زۆر لە شلەمەنی بخۆن، خواردنی بەسوود بخۆن، ئەگەر تا هەبوو ماددەی پاراسیتۆڵ بەکاربهێنن، لە ژوورێکی تایبەت بمێنەرەوە دوور لە ئەندامانی تری خێزان، پێویستە ڕووەکان بە بەردەوامی پاکژبکرێنەوە، لە ماوەی ١٠ تا ١٤ ڕۆژدا نەخۆشەکە چاکدەبێتەوە و ئاساییە تێکەڵی خێزانەکەی و کۆمەڵگە ببێت.

وەک باسمان کرد تەنها ڕێژەیەکی کەمی نەخۆشەکانی کۆرۆنا بەشێوەیەکی قورس نەخۆشییەکە دەگرن و لەوانەیە پێویستیان بە چارەسەرێکی تایبەت یان داخلکردن بۆ نەخۆشخانە هەبێت، ئەمەش بەشێوەیەکی گشتی پشت دەبەستێت بەڕێژەی ئۆکسجین لە خوێنی نەخۆشەکاندا کە پشکنینێکی گرنگە و لەڕێی ئامێرێکی تایبەت و سادە کە لە پەنجە دەبەسترێت دەپێورێت (Pulse Oximeter)، هەرکاتێک ڕێژەی ئۆکسجین لە خوێندا دابەزێت کە نیشانەیەکی مەترسیدارە و مانای ئەوەیە کە هەوکردنێکی زۆری سییەکانی هەیە، یان نەخۆشەکە نیشانەی قورسی هەبوو وەک تای بەرز یان تەنگەنەفەسی توند و کۆکەی بەردەوام و نەتوانینی هەستان لە جێگە یان ئەنجامدانی کارە سادەکانی ژیانی ڕۆژانە پێویستە لە زووترین کاتدا سەردنی پزیشکی پسپۆڕ بکات بۆ دەستنیشانکردنی نەخۆشییەکە و ڕادەی قورسییەکەی و پاشان دانانی چارەسەری گونجاو بۆ هەر حاڵەتێک.

لە ئێستادا چەندین چارەسەر ڕێپێدراون بۆ چارەسەری حاڵەتەکانی کۆرۆنا لە دژە ڤایرەس و ئەنتیبایۆتیکەکان و ستیرۆید و دژە تەنەکان و پلازمای خوێنی کەسانی چاکبۆوە لە کۆرۆنا کە بەرگرییەکی بەهێزی دژی ڤایرەسەکە پەیداکردبێت، لەگەڵ چەندین دەرمانی تر کە پزیشکی پسپۆڕ دیاری دەکات، لە هەرە گرنگترین چارەسەرەکان بریتییە لە دابینکردنی ئۆکسجین بۆ نەخۆشەکە، کە ئەگەر ئۆکسجینی سادە ڕۆڵی نەبوو لە بەرزکردنەوەی ڕێژەی ئۆکسجین لە خوێنی نەخۆشەکەدا ئەو کاتە پێویستە نەخۆشەکە بخرێتەسەر ئامێری هەناسەدان.

### کوتان (ڤاکسین) دژی ڤایرەسی کۆرۆنا:

تا ساتی ئامادەکرنی ئەم بابەتە ٣ ڤاکسین لە جیهاندا سەرکەوتنیان بەدەستهێناوە لە تاقیکردنەوەکاندا و لەلایەن وڵاتانی جیهانەوە ڕێگەیان پێدراوە بۆ بەکارهێنان، لە نۆڤەمبەری ٢٠٢٠ هەردوو کۆمپانیای (ڤایزەری ئەمریکی) و (بایۆنتێکی ئەڵمانی) ڕایانگەیاند کە ڤاکسینەکەیان ڕێژەی ٩٥٪ سەرکەوتنی بەدەستهێناوە لە دروستکردنی بەرگریی دژی ڤایرەسی کۆرۆنا لە لەشی خۆبەخشەکاندا، ئەویش لە تاقیکردنەوەی قۆناغی سێیەم بە بەشداری ٤٤٠٠٠ خۆبەخش لە چەندین وڵاتی جیهاندا بەبێ دروستکردنی هیچ کاریگەرییەکی لاوەکی مەترسیدار، کە دواتر بەهۆی ئەم ئەنجامە بەرچاوانەوە لەلایەن وڵاتانی ئەمریکا و کەنەدا و بەریتانیا و چەندین وڵاتی تر ڕێگەی پێدراو بەسەدان ملیۆن ژەمی ئەم ڤاکسینەیان کڕی بۆ بەکارهێنانی بۆ هاوڵاتیانیان، دواتریش لەلایەن ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی (WHO) ڕێگەپێدانی کتوپڕی پێدرا بۆ بەکارهێنان، ئەم ڤاکسینە لە جۆری (mRNA Vaccine)ە و بەڕێگای ماسولکە دەرزییەکە لێدەدرێت بە دوو ژەم کە سێ هەفتە لەنێوانیاندا دەبێت، تەنها شێوازی هەڵگرتنی قورسە کە دەبێت لە پلەی (-٧٠) لەژێر سفرەوە بێت.

له ٣٠ی نۆڤەمبەری ٢٠٢٠ کۆمپانیای (مۆدێرنای ئەمریکی) ڕایگەیاند کە ڤاکسینەکەیان بەرێژەی ٩٤,١٪ سەرکەوتنی بەدەستهێناوە لە دروستکردنی بەرگریی دژی ڤایرەسی کۆرۆنا لە لەشی خۆبەخشەکاندا لە تاقیکردنەوەکانی قۆناغی سێیەم بە بەشداری (٣٠٠٠٠) خۆبەخش لە ئەمریکا و وڵاتانی تر بەبێ دروستکردنی هیچ کاریگەرییەکی لاوەکی مەترسیدار، کە دواتر لەلایەن وڵاتانی ئەمریکا و کەنەداوە ڕێگەپێدرا بۆ کڕین و بەکارهێنانی لەسەر هاوڵاتیانیان، ئەم ڤاکسینەش لە جۆری (mRNA Vaccine)ە و دەرزییەکەی بەڕێگای ماسولکە لێدەدرێت بە دوو ژەم کە چوار هەفتە لەنێوانیاندا دەبێت، شێوازی هەڵگرتنی ئاسانترە کە دەبێت لە پلەی (-٢٠) لەژێر سفرەوە بێت.

**ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی (WHO) ڕایگەیاند کە هیچ جۆرە بەڵگەیەك نییە لەسەر ئەوەی ئەم ڤایرەسە دەستکاریی کرابێت یان دروستکرابێت و بە ئەنقەست لە نێوان مرۆڤەکاندا بڵاوکرابێتەوە.**

ڤاکسینی هاوبەشی هەردوو (زانکۆی ئۆکسفۆردی بەریتانی) و کۆمپانیای (ئەسترا زینیکای سویدی-بەریتانی) لە ٨ی دیسەمبەری ٢٠٢٠ ڕاگەیەندرا کە سەرکەوتنی بەدەستهێناوە لە تاقیکردنەوەکانی قۆناغی سێیەم بەبێ دروستکردنی هیچ کاریگەرییەکی لاوەکی مەترسیدار، بە دوو شێوازی جیاواز تاقیکراوەتەوە کە بە دوو ژەم لە خۆبەخشەکان دراوە کە چوار هەفتە لەنێوانیاندا بووە، شێوازی یەکەم کە هەردوو ژەمەکە خۆبەخشەکان دۆزی تەواوی ڤاکسینەکەیان لێدراوە ٦٢٪ کاریگەر بووە، شێوازی دووەم کاریگەرتر بووە بەوەی ژەمی یەکەم نیوەی دۆزی ڤاکسینەکە بووە و ژەمی دووەم دۆزی تەواوی ڤاکسینەکە بووە کە دراوە لە خۆبەخشەکان، ئەمەیان ٩٠٪ کاریگەر بووە لە دروستکردنی بەرگریی دژی ڤایرەسی کۆرۆنا لە لەشی خۆبەخشەکاندا، بەشێوەیەکی گشتی ڕێژەی ٧٠٪ی وەک کاریگەریی گشتی بۆ ڤاکسینەکە دانراوە، وڵاتی بەریتانیا ڕێگەیداوە بە بەکارهێنانی ئەم ڤاکسینە لە نێوان هاوڵاتیانیدا، ئەم ڤاکسینەیان لە جۆری (Adinovirus) ە و دەرزییەکەی بەڕێگای ماسولکە لێدەدرێت بە دوو ژەم کە چوار هەفتە لە نێوانیاندا دەبێت، شێوازی هەڵگرتن لە هەمووی ئاسانترە کە تەنها پێویستە لە بەفرگردا هەڵبگیرێت و بۆ ماوەی ٦ مانگ بە کاریگەری تەواوەوە دەمێنێتەوە.

## ئایا کەسێک دوو جار تووشی نەخۆشی ڤایرەسی کۆرۆنا دەبێت؟

چەند حاڵەتێکی کەمی تووشبوونەوە بە نەخۆشی ڤایرەسی کۆرۆنا لە جیهاندا تۆمارکراون، بەڵام توێژینەوە فراوانەکان لەسەر ئەم بابەتە ئەوەی سەلماندووە کە هەرکەسێک نەخۆشییەکە دەگرێت و چاکدەبێتەوە بەرگرییەکی کاریگەر دژی ڤایرەسەکە پەیدا دەکات کە بۆ ماوەیەکی زۆر دەیپارێزێت لە تووشبوونەوە بە ڤایرەسەکە، کە لەوانەیە لە شەش مانگ زیاتر تاوەکو یەک ساڵ یان زیاتر بخایەنێت، بەتایبەتی ئەو توێژینەوەیەی لە زانکۆی ئۆکسفۆرد و نەخۆشخانەکانیدا لە بەریتانیا ئەنجامدرا لەسەر هەزاران کارمەندی نەخۆشخانەکانیان و دەرکەوت کە ئەوانەی بەرگرییان هەبوو دژی ڤایرەسی کۆرۆنا پارێزراوبوون لە تووشبوونەوە بە نەخۆشییەکە بۆ ماوەیەک لە شەش مانگ کەمتر نەبوو و تا ئێستاش توێژینەوەکە بەردەوامە.

## جۆرە نوێیەکەی ڤایرەسی کۆرۆنا:

لە مانگی دیسەمبەری ٢٠٢٠دا لە وڵاتی بەریتانیا ئەوە ئاشکرا کرا کە جۆرێکی نوێ لە ڤایرەسی کۆرۆنا دۆزراوەتەوە کە هەندێک گۆڕانکاریی لە پێکهاتە و ماددە بۆماوەییەکەیدا ڕوویداوە لەچاو جۆرە کۆنەکەی ڤایرەسی کۆرۆنادا، ئەم جۆرە نوێیە سەرەتا لە شاری لەندەنەوە دەستیکرد بەبڵاوبوونەوە کە پاشان هەموو بەریتانیا و چەند وڵاتێکی تری وەک: دانیمارک و هۆڵەندا و ئوسترالیای گرتەوە، ڕوودانی گۆڕانکاری لە ڤایرەس و زیندەوەرە وردەکاندا شتێکی پێشبینی کراوە بەتایبەتی ئەگەر بۆ ماوەیەکی زۆر لە لەشدا بمێننەوە، ئەوەی تا ئێستا زانراوە کە ئەم جۆرە گۆڕانکارییە تەنها بڵاوبوونەوەی خێراتر کردووە لە نێوان مرۆڤەکاندا، و هیچ جۆرە ئاماژەیەک نییە بۆئەوەی نەخۆشییەکی قورستر دروستبکات یان مردنی زیاتری لێبکەوێتەوە، توێژەرەوان دەڵێن کاریگەریی ڤاکسینەکانی دژی کۆرۆنا بەهەمان شێوەی جۆرە کۆنەکە دەبێت و ڤاکسینەکان دەتوانن بەرگریی لە لەشدا دژی ئەم جۆرەش دروستبکەن، تا ئێستاش توێژینەوە زانستییەکان لەمبارەوە بەردەوامن.

تێبینی/ بۆ ئامادە کردنی ئەم بابەتە پشت بە سایت و سەرچاوە پزیشکییە ڕەسەنەکان بەستراوە و سوود لە دەیان توێژینەوەی زانستی وەرگیراوە، تەنها زانیاریی پزیشکیی پشتڕاستکراوە لێرەدا باسکراوە، بەشێوەیەکی سەرەکی سوودم لەم سایت و توێژینەوە زانستییەکانیان وەرگرتووە:

ـ سایتەکانی:

**www.who.int / www.cdc.gov / www.nhs.uk / www.ouh.nhs.uk/ www.uptodate.com**
**www.medscape.com/ www.health.harvard.edu/ www.myoclinic.org/ www.webmd.com**


**د. محەمەد عەلی باپیر**
دکتۆرا لە زانستە ڕامیارییەکان و پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان، وانەبێژ لە زانکۆی کوردستان هەولێر.

# دەردی کۆرۆنا و
## چڕبوونەوەی دەسەڵاتی دەوڵەت

سیاسەت بە مانا فراوانەکەی واتە ئەزمونکردنی دەسەڵات. خوێندنەوەیەکی سیاسی بۆ لێکەوتەکانی پەتای کۆرۆنا واتە ڕامان لەوەی کە تا چەند و بە چ شێوەیەک ئەو پەتایە کاری کردۆتە سەر ئەزموونکردنی دەسەڵات. لێرەدا مەبەست دەسەڵاتی دەوڵەتە. بۆیە پێویستە دوو چەمکی دەسەڵات و دەوڵەت وەک ئەم بابەتە دەخوازێ پێناسەیەکی کورت بکەم. بۆئەوەی لەسەر بنەمای ئەو دوو تێگەیشتنە بەڵگە بۆ ئەو ڕایەی خۆم بێنمەوە کە پەتای کۆرۆنا بۆتە هۆکارێک بۆ بەهێزبوون و زیادبوونی دەسەڵاتی دەوڵەت.

دەسەڵات لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا بە مانا بەراییەکەی واتە؛ توانای کەسێک بۆئەوەی وا لە کەسێکی دی بکا، کارێک بکا کە کەسی دووەم خۆویستانە نەیدەکرد. بەپێی ئەم پێناسەیە دەسەڵات توانینە، دەسەڵات ئامرازە، دەسەڵات کردەیە. توانینە بەو مانایەی کەسێک توانای هەیە ویستی خۆی زاڵ بکا؛ ئامرازە بۆ گەیشتن بە ئامانجێک یا بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەک؛ کردەیە بەو واتایەی کەسێک کارێک ڕادەپەڕێنێت، شتێک دەکا، ویستێک بەرجەستە دەکات. بۆ ئەزموونکردنی دەسەڵات لانیکەم دوو لایەن پێویستن کە یەکیان دەسەڵاتی بەسەر ئەوی دیدا هەیە. کەسی یەکەم دەسەڵاتی بەسەر کەسی دووەمدا هەیە، کاتێک کەسی یەکەم توانای بەسەر کەسی دووەمدا هەبێ و بۆچوونی خۆی بەسەر وی دا زاڵ بکا؛ کەسی دووەم ببێتە ئامراز و ویستی کەسی یەکەم بەرجەستە بکا و، کارێک ڕاپەڕێنێ کە کەسی یەکەم پێیکردووە – لەبارێکدا، ئەگەر کەسی یەکەم نەبووبایە کەسی دووەم ئەو کارەی نەدەکرد.

ئەگەر لە جێی کەسی یەکەم دەوڵەت دابنێین و، لە جێی کەسی دووەم خەڵک دابنێین، ئەوکات پێناسەکە ئاوای لێ دێ؛ دەسەڵات واتە توانای دەوڵەت کە وا لە خەڵک بکات، کارێک بکەن کاتێک خەڵک خۆویستانە ئەو کارەیان نەدەکرد. سادەترین وێنە، دەسەڵاتی بەسەروەرکردنی یاسایە، کاتێک دەوڵەت وا لەخەڵک دەکا پەیڕەوی لە یاسا بکەن و، یاسایان بەسەردا دەسەپێنێ. بۆ هەموو یاسایەک کە لەلایەن دەوڵەتەوە دێ، ئەگەر سزایەک بۆ شکاندنی و پاداشتێک بۆ شوێنکەوتنی نەبووبایە دوور بوو خۆویستانە خەڵک پەیڕەویان لێکردبا؛ توانای گەیاندنی سزا و پێدانی پاداشت دوو وێنەی بەرجەستەی دەسەڵاتی دەوڵەتن، هەروەک چۆن دیاریکردنی یاسا و زامنکردنی پەیڕەوی لێکرانیشی هەر دیسان بەرجەستەبووی دەسەڵاتی دەوڵەتن. بەڵام دەوڵەت چییە؟

دەوڵەت ئەو دامەزراوە مرۆکردەیە کە بەکارهێنانی ئامرازەکانی توندوتیژی بۆ خۆی قۆرخ کردووە، بەشێوەیەک کە لە بەکارهێنانیاندا ڕەوایەتی بەخۆی دەدا و، لە ئەزمونکردنی دەسەڵاتدا بێ ڕکابەرە. ئەم پێناسەیە تێگەیشتنی زانای کۆمەڵناس ماکس ڤێبەرە. ئەگەر ئەم بۆچوونەی ڤێبەر شی بکەینەوە دەتوانین بڵێین، ئامرازەکانی توندوتیژی تێکرای هێزە چەکدارەکانی دەوڵەت دەگرێتەوە، لە پۆلیس و هێزەکانی ئاسایش و تەواوی هێزە سەربازییەکان. لە هێزی چەکداردا دەوڵەت بێ ڕکابەرە، هیچ لایەنێکی دیکەی نادەوڵەتی بۆی نییە هیزی چەکداری هەبێ. لە بەکارهێنانی هێزی چەکداردا (ئامرازی توندوتیژی) دەوڵەت ڕەوایەتی بەخۆی دەدا، بەجۆرێک کە هیچ کەس و لایەنێکی دی ئەو ڕەوایەتییەیان نیە. بۆ؟ چونکە دەوڵەت لەسەر بنچینەی یاسا ئەو ڕەوایەتییەی مسۆگەر کردووە. ئەگەر سەرنج بدەین هەرسێ بەشەکەی دەسەڵاتیش؛ دەسەڵاتی یاسا دانان، دادوەری و ڕاپەڕاندن، سەروکاریان لەگەڵ یاسا و بەسەروەرکردنی یاسادا هەیە.

دەوڵەت لە دوو توێی یاسادا دەسەڵات ئەزموون دەکا. بە واتایەکی دی، یاسا دەسەڵاتی ڕەوای دەوڵەتە.

کەواتە دەوڵەت تێکڕای پەیکەرەکانی فەرمانڕەوایی کردنە و. دەسەڵاتی دەوڵەت ئەو دەسەڵاتەیە کە لەسەروو هەموو دەسەڵاتەکانەوەیە؛ دەسەڵاتی بێ ڕکابەر و بێ هاوبەش. بۆ وێنە دەوڵەت هێزی سەربازی (چەک) یا هێزی ئابووری (چاپکردنی دراو) یا هێزی یاسا (دیاریکردنی سزا)، لەگەڵ هیچ دامەزراوەیەکی دی نادەوڵەتی لە چوارچێوەی سنوری خۆیدا بەش ناکات؛ دەسەڵاتی هەرە باڵا و بێ ڕکابەر هی دەوڵەتە - ئەمەش پێناسی دەسەڵاتی سەروەر. تەنها دەسەڵاتێکی سەروەر دەتوانێ یاسا بەسەروەر بکا. بەو واتایەی، تەنها دەسەڵاتێکی سەروەر دەتوانێ یاسا بەشێوەیەکی یەکسان بەسەر هەموو کەسەکاندا بسەپێنێت و، یاسا بەشێوەیەکی یەکسان و لەیەک کاتدا لە تەواوی پانتایی ڕووبەری جوگرافیی خۆی بچەسپێنێت. کەواتە، لە ئەزموونکردنی دەسەڵات لەلایەن دەوڵەتەوە دوو باسی پەیوەست هەن: یەک، دەسەڵاتی دەوڵەت دیوێکی جوگرافی هەیە، دەوڵەت لەچوارچێوی سنوری خۆیدا دەسەڵات بەرجەستە دەکات، سنور دەپارێزێت، یەکپارچەیی خاکی پارێزگاری لێدەکا و، یاسا بەرپا دەکات. دوو، دەسەڵاتی دەوڵەت دیوێکی مرۆییشی هەیە، وەک لەوەی ڕابرد ئاماژەم بۆ کرد، ئەزمونکردنی دەسەڵات لەلایەن دەوڵەتەوە ئەوەیە کە دەوڵەت وەک دامەزراوە بتوانێ کۆمەڵێک ئەرک ڕاپەڕێنێت لە بەڕێوەبردنی گوزەران و، پاراستنی بەرژەوەندییەکانی خەڵک. هەروەها دەسەڵاتی دەوڵەت واتە توانای دەوڵەت لەوەدا کە دانیشتوانی نێو سنوری خۆی ئاگادار بکا بەشێوەیەکی دیاریکراو مامەڵە بکەن، بۆ وێنە، پەیڕەوی یاسا بکەن، بەو مانایەی، خەڵک ئەوە بکەن کە دەوڵەت پێیان دەڵێ و خۆ دووربگرن لەوەی کە دەوڵەت لێیان قەدەغە دەکا- ئەم بڕگەیەی ئەزموونکردنی دەسەڵاتە کە من لێرە بەبەرە هەڵوەستەی لەسەر دەکەم.

ئێستا دەبێ دوو چەمکی دەسەڵات و دەوڵەت و، هەروەها دەسەڵاتی دەوڵەت بە لێکەوت لەگەڵ خەڵکدا ڕوون بن. پرسیاری سەرەکیشمان بریتییە لە ئەوە کە ئایا کۆرۆنا چ کاریگەرییەکی کردۆتە سەر ئەم پەیوەندییە؛ بە واتایەی دی، ئایا دەردی کۆرۆنا لە دەسەڵاتی دەوڵەتی زیاد کردووە یا کەم؟ ئەو چەند وێنەیەی خوارەوە وەک بەڵگە ئەو ڕایە پەسەند دەکەن کە دەردی کۆرۆنا وەک هەڕەشەیەک بۆ سەر کۆی کۆمەڵگا، دەسەڵاتی دەوڵەتی زیاتر بەناوەند کردووە و، دەسەڵاتی ڕاپەڕاندنی چڕتر کردۆتەوە. پەتای کۆرۆنا، وەک ڤایرۆسێکی بکوژ بۆتە مەترسییەکی گەورە لەسەر خەڵک، بەتایبەت دوای ئەوەی کە زانرا ئەو ڤایرۆسە گوزراوەیە و لە ڕێگەی بەریەکەوتن و تەنانەت لێکنزیکبوونەوەش ئەگەری گواستنەوەی هەیە. بۆ بەرگرتن لە تەشەنەکردن و بڵاوبوونەوەی زیاتر، پێویست

بوو ڕێکاری توند بگیرێتەبەر وەک قەدەغەی هاتووچۆ، یا بوار نەدان بە کۆبوونەوە لە شوێنە گشتییەکان، ئەوانە و کۆمەڵێک ڕێکاری دی ڕاستەخۆ کاریان کردە سەر کایە کۆمەڵایەتیی و ئابوورییەکان و ژیانی ڕۆژانەی خەڵک. بەوشێوەیە کۆمەڵێک ڕێنمایی ڕاستەوخۆ لەلایەن دەوڵەتەوە دەرچوێنران بەمەبەستی بەرەنگاربوونەوەی هەڕەشەیەکی مرۆیی. لە زۆر وڵات ئەگەر هاتباو خەڵک گوێڕایەڵ نەبووبان دەوڵەت هێزی چەکداری (ئامرازەکانی توندوتیژی) بۆ جێبەجێکردنی ڕێنماییەکانی بەکاردەهێنا؛ لە ئەگەری بەهەند وەرنەگرتنی فەرمانی دەوڵەت، خەڵک ڕووبەڕووی دەسەڵاتی ڕووتی دەوڵەت دەبوونەوە.

ئێستاش ئەوانەی سەرپێچی بکەن یان کەمتەرخەم بن بەپێی سەرپێچی و خەمساردییان سزا دەدرێن. لەبەر دوو هۆکار؛ یەکەم، چونکە گوێڕایەڵی دەوڵەت نەبوون و، ویستی خۆیان زاڵکردووە (بڕوانە پێناسەی دەسەڵات لەسەرەوە)؛ دووەم، لەبەرئەوەی بوون بە ئەگەرێک بۆ زیاتر پەرەسەندنی ئەو دەردە. واتە، بوون بە هەڕەشە بۆسەر تەندروستی تێکڕای کۆمەڵگە. بەڵام بەهێزبوونی دەسەڵاتی دەوڵەت تەنها بۆ هۆکاری ئامراز ناگەڕێتەوە (کە دەوڵەت هێزی چەکدار یا هێزی یاسایی هەیە) بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ هۆکارێکی ڕیشەیی تر، ئەوە کە، دەوڵەت مەبەستی لەو ڕێنماییانە پارێزگاری کردنە لە تەندروستی خەڵک. هۆکارە سەرکییەکە پەیوەستە بە بەرژەوەندی هەموو کۆمەڵگەوە، هەربۆیەش لە دیدی زۆرینەی ڕەهای خەڵکەوە ئەوەی کە دەوڵەت دەیکات لە قەدەغەی هاتووچۆ و، ڕێگرتن لە گردبوونەوە، کارێکی ڕەوایە. کەواتە هۆکاری ڕیشەیی بەهێزبوونی دەسەڵاتی دەوڵەت بریتییە لە ڕەوابوونی و، بە ڕەوا بینرانی لەلایەن خەڵکەکەیەوە. بۆچی؟ چونکە خەڵک لە بەرژەوەندی خۆیانیدا دەبینن لەو دەردە پارێزراوبن و، براوایان وایە پارێزراو دەبن ئەگەر هاتوو گوێڕایەڵی دەوڵەت بن – سەرنجی وتەی دەوڵەت و باوەڕی خەڵک بدە، تا باوەڕیان زیاتر بێ بە وتەی دەوڵەت، بڕیار و وتەی دەوڵەت زیاتر دەبێتە دەسەڵات. ئەمە وێنەی یەکەم بوو کە پەیوەست بوو بە سنورردارکردنی جوڵەی خەڵک؛ کۆرۆنا ئەو دەسەڵاتەیدا بە دەوڵەت ڕێبگرێ لە خەڵک لە هاتنەدەرەوە تەنانەت بۆ کار و پێویستی سەرەکی ژیانیش و، ئەو بڕوایەشی لای خەڵک دروست کرد کە دەوڵەت کارێکی ڕەوا دەکا. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە هۆکارەکانی بەرەنگاربوونەوەی کۆرۆنا ویستی دەوڵەتیان زاڵکردووە.

بەڵام ڕێگرتن لە گردبوونەوە لە شوێنە گشتییەکان واتە سنورردارکردنی بازاڕ. ئەمەش وێنەی دووەمە؛ لەگەڵ سنورردابوونی بازاڕ و قەدەغەی جووڵەی خەڵک، لە زۆر لە وڵاتان بۆ بژێویان خەڵک زیاتر چاویان لە دەستی دەوڵەتە کەلێنی بازاڕیان بۆ پڕ کاتەوە. واتە دەوڵەت ئەگەر بۆ ماوەیەکی کاتیش بێ خەرجییەکانیان لەئەستۆ بگرێ. ئەم پشتبەستنەی خەڵک بە دەوڵەت بۆ بژێوی دەسەڵاتێکیدا بە دەوڵەت کە پێشتر هاوشێوەی

نەبووە. لێرەدا دەکرێ جۆرێکی دی لە خوێندنەوە بۆ ئەزموونکردنی دەسەڵات بکرێ، سەرەرای ئەو بۆچوونەی لەسەرەوە ئاماژەم بۆ کرد، ئەم بۆچوونەش دروستە ئەگەر بڵێین دەسەڵات واتە پشت پێبەستن و پەیوەست بوون؛ ئەگەر لایەنێک پێویستییەک بۆ تۆ دەستەبەر بکات و تۆ ئەو پێویستییە لەو نەبێ لە کەسی دی دەستت نەکەوێ، ئەو لایەنە ئەزموونی دەسەڵات دەکا بەسەر تۆ دا. بۆ نمونە ئەگەر باوکێک لەڕووی داراییەوە هاوکاری منداڵەکانی بکا، بەو مەرجەی کە جگە لەو هیچ کەسێکی دی ئەو پێویستییەیان بۆ پڕ نەکاتەوە، ئەوا لە بارێکی وادا، لەڕووی داراییەوە ئەو باوکە دەسەڵاتی هەیە بەسەر منداڵەکانیدا. ئەمە بۆ زۆر کاییەی دیش هەر ڕاستە، وێنەی دەسەڵاتی پارتێکی سیاسی بەسەر موچەخۆرانیدا بێنە پێش چاو، یا بیر لە دەسەڵاتی شێخێک بکەوە بەسەر موریدەکانیدا. بەکورتی ئەگەر مرۆڤەکان شتێکیان ویست و تەنها یەک لایەن بۆی دەستەبەرکردن بەو ئەندازەیەی کە پەکیان لەسەری کەوتووە، بە هەمان ئەندازە ئەو لایەنە دەسەڵاتی بەسەریاندا هەیە. لێرەدا بە دەستەبەرکردنی ئەو پێداویستییانەی کە پێشتر بازاڕ پێشکەشی دەکردن، دەوڵەت وایکرد کە خەڵک بۆ بژێویش چاوەڕوانیان لە دەوڵەت بێ. پێشتر خەڵک ئەو چاوەڕوانی لە دەوڵەت بوو بۆ پاراستنی ئاسایش و ڕێکی پەیکەرەکانی بەڕێوەبردن و ئاشتی کۆمەڵایەتی، ئێستا داهاتی ڕۆژانە و نانەزگیشی هاتۆتەسەر – ڕۆڵی دەوڵەت بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ پەیوەست بووە. لەڕووی ئابوورییەوە ئەم پەیوەستبوونە زۆر بەرچاوە. کۆمەڵگەکان چاویان لە دەستی دەوڵەتە کە هاوکاری دارییان بکات، بازاڕ هێزی ئابووری بە ڕێژەیەکی بەرچاو کەمیکردووە. خەڵک زیاتر پشت بە دەسەڵاتی دەوڵەت دەبەستن بۆ پێوەیستییە بەراییەکانیان. دەکرێ یەکێک لە لێکەوتەکانی ئەم جۆرە لە پەیوەندی نێوان کۆمەڵگە و دەوڵەت ئەوەبێ کە هێزی لێپێچینەوە لەلایەن خەڵکەوە بۆ دەوڵەت و بەتایبەت بۆ حکومەت کەمتر بێتەوە – واتە دەوڵەت پارە دەدات و ڕەوایەتی دەکڕێ (بۆ مەبەستی ئەم نووسینە دەوڵەت و حکومەتم وەک یەک بەکارهێناوە، ئەگەرچی ئەو دووە جیاوازن، بەڵام کە سەرنج دەخەینە سەر ئەزمونکردنی دەسەڵات ئەو دووە دەبنەوە بەیەک، بەتایبەت لە دەسەڵاتی ڕاپەڕاندندا).

وێنەی سێیەم، دەوڵەت نەک هەر کۆی ئامرازەکانی توندوتیژی بۆخۆی قۆرخکردووە، بەڵکو سەرچاوەکانی زانست و زانینی دروستیشی هەر بۆخۆی قۆرخ کردووە. سەرنج بدە، ئەوە دەوڵەتە دەڵێ دەبێ دەمامک ببەستی، چونکە دەوڵەت پێیوایە دەمامک بەستن ڕێگرە لە بڵاوبوونەوەی ڤایرۆسی کۆرۆنا (ئەگەری ئەوە هەیە لەڕووی زانستی پزکیشەوە ئەمە ڕاستبێ) مەبەستی من زیاتر ئەوەیە کە ئەگەر هاتوو دەوڵەت ڕایەکی بەراست زانی و گشتاندنی بۆ کرد، هیچ کەس و لایەنێکی دی مافی ئەوەی نییە ڕایەکی جیاواز پێشکەش بکات. چونکە ئەو ڕایەی کە دەوڵەت پشتڕاستی کردۆتەوە بەتەنها نابێتە بەشێک لە

دەسەڵات، بەڵکو دەبێتە بەرجەستەبووی دەسەڵات. دەبێتە خودی دەسەڵات، دەسەڵاتێکی ڕەوا، یا لانیکەم دەسەڵاتێک کە بانگەشەی ڕەوایەتی بوونی دەکات. لێرەدا زانین نەک هەردەبێتە توانیین، بەڵکو دەبێتە دەسەڵات. با مەبەستەکەم ڕوونتر کەمەوە؛ ڕایەک هەیە دەڵێ کۆبوونەوەی خەڵک لە دەرەوە دەبێتە هەڕەشە و، مەترسییە. کاتێک ئەم ڕایە دەچێتە بواری جێبەجێکردنەوە، لە کایە کۆمەڵایەتییەکاندا کۆبوونەوە قەدەغە دەکات. ڕاستەوخۆ کاریگەری لەسەر پێکەوەیی خەڵک و ژیانی ڕۆژانەیان دروست دەکات. ئەوە ئەو زانیارییەیە کە لە شێوەی قەدەغەی هاتووچۆ خۆی بەرجەستە دەکات. زانیارییەک لە دەوڵەت بەڕاستی زانیوە دەبێتە بڕیار.

**ئەگەر پێش ئەو دەردە نارەزایەتی کۆمەڵایەتی و خۆپیشاندان لە چوارچێوەی یاسادا و بە لەبەرچاوگرتنی پاراستنی ئاشتی کۆمەڵایەتی مافێک بوون، لە سەردەمی کۆرۆنادا نەک هەر وەک ماف لاواز بوون، بەڵکو لە هەندێک باردا وەک تاوانێک مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێ.**

دەوڵەت دەڵێ دەبێ کارێک بکەی و، بە نەکردنی دووچاری سزا دەبییەوە، بۆچی؟ چونکە دەوڵەت ئەوەی کە لە بەرژەوەندی گشتیدایە دەزانێ و ئەو زانینە کۆمەڵگا وادار دەکا کە واز لە زانینەکانی خۆی بێنێ و ئەوەی دەوڵەت بەرجەستە بکات. دەنگونجێ ئەمە سنوری ئازادییەکان بەشێوەیەکی بەرچاو تەسککاتەوە، چونکە ئەگەری ئەوە هەیە لێرە بەبەرە دەوڵەت لە بواری دیکەشدا زانینی خۆی بسەپێنێ، زانینێک کە دەبێتەوە بە درێژکراوەیەک لە دەسەڵاتی دەوڵەت لە بەرانبەر تاک و کۆمەڵگەدا. هەڵە نییە ئەگەر بگوترێ زانست بۆ دەوڵەت بووە بە فۆرمێکی دیکەی دەسەڵات، دەسەڵاتێک کە هۆشیاری کۆمەڵگە دەدوێنێ و خۆی بەسەردا دەسەپێنێ.

وێنەی چوارەم، لە باسی سزادا دەردی کۆرۆنا دەسەڵاتی دەوڵەتی قوڵتر کردووەتەوە. ئەگەر پێش ئەو دەردە نارەزایەتی کۆمەڵایەتی و خۆپیشاندان لەچوارچێوەی یاسادا و بەلەبەرچاوگرتنی پاراستنی ئاشتی کۆمەڵایەتی مافێک بووبن، لە سەردەمی کۆرۆنادا نەک هەر وەک ماف لاواز بوون، بەڵکو لە هەندێک باردا وەک تاوانێک مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێ. یەک، لەبەرئەوەی دەوڵەت دەڵێ نابێ گردبوونەوە بکرێ؛ دوو، لەبەرئەوەی گردبوونەوە مەترسی بڵاوبوونەوە زیاتر دەکات. واتە ئەگەر گردبوونەوە کرا لە یەک

کاتدا، هەم فەرمانی دەوڵەت شکێنراوە، هەم گومان خراوەتەسەر ڕاستی ئەوەی کە گردبوونەوە هۆکارە بۆ پەرەسەندنی ئەو دەردە – یانی بەرهەڵستی ئەو زانستە کراوە کە دەوڵەت بەڕاستی زانیوە و گشتاندوویەتی. دەوڵەت لەبارێکی ئاوادا ڕەوایەتییەکی زیاتر بەخۆی دەدا ئەوانە سزا بدا کە یاسا شکێنی دەکەن. سەرباری سزادانیان لەبەر شکاندنی یاسا بۆ ئەوەش کە بۆ زۆرینەی ڕەهای کۆمەڵگە بیانکات بە پەند و جێی وانە لێوەرگرتن. لەبارێکی وادا دەوڵەت دەسەڵاتەکەی بەناوی پارێزگاریکردن لە کۆی کۆمەڵگا ئەزموون دەکات. ئەگەر ئەم نمونەیە دروست بێ، دەکرێ بڵێین دەوڵەت دەڵێ دوژمنێکی بکوژ هاتوتە ناو کۆمەڵگە و هەموو کەسێک دەبێ ببێتە سەربازی دەوڵەت و بۆ پاراستنی خۆی و کەسانی دیش لە جەنگێکی بەردەوام دابێ، تەنها بەو جۆرەی کە دەوڵەت ئاراستە دەدا بەرەنگاری ئەو مەترسییە ببنەوە. لە ماڵەکانی خۆتاندا سەنگەر بگرن، خۆتان کەرەنتینە بکەن، بۆ؟ چونکە دوژمنی بکوژ و نادیار بۆتان لە بۆسەدایە! بیرتان بێ، ئەوە دەوڵەتە فەرمان دەدا، کەی و چۆن و لەکوێ و بەچ ئامرازێک دەبێ بەرپەرچی بدەنەوە. خۆ ئەگەر لاساری بکەن و کەمتەرخەم بن دەوڵەت بە ئەرکی خۆی دەزانێ سزاتان بدا، چونکە تەندروستی کۆمەڵگەتان خستۆتە مەترسییەوە و سەنگەرتان دۆڕاندووە.

> **ئاڕاستەی دەسەڵات ئەگەر بە دوو باردا بووبێ، لە دەوڵەتەوە بۆ کۆمەڵگا (وەک فەرمانڕەوایی کردن) و لەکۆمەڵگەشەوە بۆ دەوڵەت (وەک لێپێچەنەوە)، ئێستا، پارسەنگی دەسەڵات زیاتر بەلای دەوڵەتدا شکاوەتەوە دەسەڵاتی دەوڵەت بەرجەستەتر و بەرهەستتر بووە.**

لە هێنانەوەی ئەو نمونەیە مەبەستمە وێنای دوخێک بکەم کە تێیدا ناڕەزایی کۆمەڵایەتی و شێوەی سزادانی لەلایەن دەوڵەتەوە، بەهۆی کۆرۆناوە کارتێکراوە. بەکورتی، کەسانێک یا کۆمەڵێک کە پێشتر مافی ناڕەزایەتی و گردبونەوەیان هەبوو، ئێستا ئەو مافەیان بوارەکەی سنوردار بووە؛ چونکە بە چوونە دەرەوە و گردبوونەوەیان دەبنە هەڕەشە بۆ سەر تێکڕای کۆمەڵگە، دەوڵەتیش بە بەرپرسیارێتی خۆی دەزانێ کە دەسەڵات بەکاربێنێ بۆ پاراستنی کۆمەڵگە، ئەگەر ئەمە ئەوەش بگەیەنێ کە خەڵک قەدەغە بکات لە گردبوونەوە و ناڕەزایەتی دەربڕین.

لە کۆتاییدا، کۆرۆنا دەسەڵاتی دەوڵەتی نەک هەر لەناوەوە و بەسەر خەڵکەکەیدا، بەڵکو لەسەر سنورەکانی و لە بەرانبەر دەوڵەتانی دیش چڕتر و بەرجەستەتر کردووە. زۆرێک لە وڵاتان سنورەکانیان دادەخەن بەبێ گەڕانەوە بۆ ڕەزامەندی دراوسێکانیان. تەنها دەوڵەت ئەو مافە بەخۆی دەدا کە سنورەکانی کەی و بەسەر کام لە وڵاتاندا دابخات و کەی بیانکاتەوە، بۆ؟ چونکە تەنها دەوڵەت دەسەڵاتی ئەوەی هەیە و، تەنها دەوڵەت ئەو ڕاستییەی لایە کە بزانێ کە بڕیارەکەی دروستە. من لە سەرەتاوە گوتم دەوڵەت لە شێوەی یاسادا دەسەڵاتەکەی ئەزموون دەکا. ئەو کەسانەی کە وەک هاوڵاتی لەچوارچێوەی سنوری دەوڵەتدان ئەگەر یاسا شکێنی بکەن لەگەڵ دەسەڵاتی سەروەردا دەرگیر دەبن. ئەمجۆرە لە دەسەڵاتی سەروەر، دەسەڵاتی بێ ڕکابەرە لە دیاریکردنی بەرژەوەندییەکانی دەوڵەت و خەڵکەکەی لە ناوەو و دەرەوەش. دەوڵەت لە ناوخۆ یاسایەک بۆ پاراستی تەندروستی بەسەر هەمواندا دەسەپێنێ، هەروەها ئەگەر پێویست بوو بۆ هەمان مەبەست سنورەکانی دادەخات. بۆیە، دەسەڵاتی دەوڵەت لەناوخۆ و دەرەوە، لەچوارچێوەی سنوری خۆیدا بۆ پاراستنی ئەوەی کە دەکەوێتە ئەو چوارچێوەیە، بە بەراورد لەگەڵ سەردەمی پێش پەتای کۆرۆنا، بەرێژەیەکی دیار زیادیکردووە. بەکورتی، ئاڕاستەی دەسەڵات ئەگەر بە دوو باردا بووبێ، لە دەوڵەتەوە بۆ کۆمەڵگا (وەک فەرمانڕەوایی کردن) و لەکۆمەڵگەشەوە بۆ دەوڵەت (وەک لێپێچەنەوە)، ئێستا، پارسەنگی دەسەڵات زیاتر بەلای دەوڵەتدا شکاوەتەوە – دەسەڵاتی دەوڵەت بەرجەستەتر و بەرهەستتر بووە.

سێ سەرنج:

یەک. مەبەست لەم نوسینە، ڕوونکرنەوەی دیاردەیەکی جیهانییە، نەک داوەریکردن لەسەر چۆنیەتی بەرەنگاربوونەوەی و ڕاست و هەڵە بەشینەوە. لێرەدا بواری ئەوەمان نابێ باس لەوە بکەین کە ئایا دەوڵەت ڕاستە یان ناڕاستە، یاخود ئەوەی کە دەیکا لە چڕکردنەوەی ئەزموونی دەسەڵاتەکەی باشە یان خراپە، بە سودی کۆمەڵگا دەشکێتەوە یا بە زیانی، چونکە نە داتای پێویستمان لەبەردەستە و نە کاتی پێویستیش. بڕیاردان لەسەر خراپ و باش، چاک و نا چاک، چەمکی سیاسیی نین و بەشێکن لە کۆمەڵە چەمکێکی دی لە زانستە مرۆییەکان و پێویستیان بە پێناسی تایبەت هەیە.

دوو. دەبێ ئەوەش بگوترێ لەگەڵ ئەوەدا کە دەسەڵاتی دەوڵەت زیاتر بەرجەستە بووە، یان ڕاستتر بڵێم، ڕاستەوخۆتر هەستی پێ دەکرێ، ئەرکێکی زۆری خستۆتە سەر دەوڵەت، ئەو ئەرکە لە دوو بواردا بە ڕوونی دەبینرێ، لە ڕووی تەندروستی و لە ڕووی ئابوورییەوە. تا چەند دەوڵەت دەتوانێ لەگەڵ ئەو دەردەدا سەرکەوتووانە مامەڵە بکات بە پلەی یەکەم بەندە بەوەوە کە تا چەند دەتوانێ پێکوتەیەکی کاریگەر بەرهەم بێنێ، تا ئەو کاتەش دێ، تا چەند دەوڵەت دەتوانێ پێویستییە ئابوورییەکانی کۆمەڵگە دەستەبەر بکات.

دەکرێ بەهۆی سنورداركردنی جووڵە و داخستنی بازاڕەوە كورت هەڵێنان دروست بێ، بۆ پڕکردنەوەی دەوڵەت دراوی زیاتر چاپ بكا، کە ئەمەش هەڵئاوسان و تەنگژەی دارایی دروست بکات، بەڵام ئەمانە کۆمەڵێک گرفتن کە دێتە بەردەم دەسەڵات، باسکردنیان دەکرێ بابەتێکی دی و سەربەخۆ بێ.

سێ، من بەمەبەست باسی دامەزراوەم نەکرد، بۆ ڕوونتر گەیاندنی مەبەست و سانا خوێندرانەوە خۆم دوور گرت لە دەستەواژ و چەمکی ئەکادیمی کە بۆ خۆیان پێویستیان بە شیکردنەوە و پێناسەی زیاتر دەبوو. ئەگەرنا دەسەڵاتی دەوڵەت کە لە ڕێی یاساوە دەناسێنرێ؛ لە کۆمەڵێک دامەزراوەی فەرمیدا بەرجەستە دەبێ. واتە کۆمەڵێک دامەزراوەی فەرمی ئەرکەکانی دەوڵەت بەپێی ڕێنمایی و ئاڕاستەی کۆمەڵێکی دی لە دامەزراوەی فەرمی ڕادەپەڕێنن. دەستور کە کۆمەڵێک یاسای لەخۆگرتووە دامەزراوەیەکی فەرمییە، بەهەمان شێوە دەسەڵاتی یاسادانان (پەرلەمان)وە دەسەڵاتی ڕاپەراندن (حکومەت) دامەزراوەی فەرمین. پێناسەی دەوڵەت بەدەر لە مەبەستی ئەم نوسینە کە لەسەرەوە ئاماژەم پێدا، ئاوای لێدێتەوە، کۆی ئەو دامەزراوانەن کە لە ناوخۆ ڕێکخراو و، لە دەرەوە دانپێدانراون، جوگرافیایەکی دیاریکراویان هەیە بە سنورێکی ناسێنراو دیاریکراوە و، خەڵێکیان هەیە کە دەسەڵاتیان بەسەردا ئەزموون دەکەن، ئابوورییەکی هاوبەش و شوناسێکی هاوبەشیان هەیە، هەروەها هێزی چەکداریان هەیە کە تەنها هۆگریان بۆ ئەو دامەزراوە فەرمیانە هەیە – سەرچاوەی دەسەڵات و سەرچاوەی ڕەوایەتی ئەو دامەزراوانە خەڵکن- بە کۆی ئەو دامەزراوانە دەوترێ دەوڵەت. ئەو جۆرە لە دەوڵەت بە چەمکی دەوڵەتی مۆدێرن، یا دەوڵەت نەتەوە گوزارشتی لێ دەکرێ.



**د.ئیبراهیم محەمەد عەزیز**
لەدایکبووی ١٩٧٨، هەڵەبجە. دکتۆرا لە سیاسەت و
پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان (٢٠١٧) لە وڵاتی بەریتانیا.

# کۆڤید-19 و کاریگەریی لەسەر سیاسەت و پەیوەندییە نێودەڵەتییەکان

کۆڤید-١٩ کاریگەری ڕاستەوخۆی لەسەر ژیانی تاک بەتاکی جیهان دروست کرد، بەجۆرێک ژیانی ئاسایی پێش کۆرۆنا و دوای کۆرۆنا گۆڕانکاری زۆری بەسەردا هاتووە. ئەم کاریگەرییەش لەسەر ئاستی هەموو دەوڵەتان و کۆمەڵگەکان هاوشێوەی یەکن بە جیاوازییەکی زۆر کەمەوە. ئێستا لەسەر ئاستی جیهان دیارنییە کە ئایا کەی و چۆن ژیان دەگەڕێتەوە بۆ پێش هاتنی کۆرۆنا، ئایا دۆزینەوەی ڤاکسینی کۆرۆنا ژیان ئاسایی دەکاتەوە؟ دید و بۆچوونمان لەم ڕوانگەیەوە نییە، بەڵکو بەئاڕاستەی ئەوەیە کە ئایا کۆرۆنا تاچەند کاریگەریی هەیە یان دەبێت لەسەر پەیوەندییە سیاسییە نێودەوڵەتییەکان؟ ئایا کۆرۆنا ڕێرەوی سیاسەتی نێودەوڵەتی و پەیوەندییەکانی گۆڕیوە؟ یان دەیگۆڕێت؟ ئایا ژیانی سیاسەتی نێودەڵەتی وەک ژیانی ئاسایی کاریگەری ئەم ڤایرۆسەی لەسەرە؟

له سیاسەتی نێودەوڵەتیدا لە سەدەی ڕابردوودا چەندین خاڵی وەرچەرخانمان هەیە کە کاریگەریان دروستکردووە لەسەر پەیوەندییە سیاسییەکان لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی و گۆڕانکاری جددیان هێنایە کایەوە و سیستمی جیهانی ئاراستەیەکی نوێی جیاواز لەوەی پێشخۆی وەرگرتووە، بەجۆرێک پەیوەندییەکانی دوای ئەم ڕووداوانە نەگەڕایەوە حاڵی پێشتری و، گۆڕانکاریی و وەرچەرخانی قوڵی دروستکرد لە بوارە جیاوازەکاندا. کەواتە دەبێت ئەوە لەبەرچاو بگرین و بزانین کە تا چەند هاتنی ئەم ڤایرۆسە بووەتە خاڵی وەرچەخان لە بواری پەیوەندییە سیاسییە نێودەوڵەتییەکاندا.

ئەگەر سەیری ئەو ڕووداوانە بکەین کە بوونەتە خاڵی وەرچەرخان و گۆڕانکاری لەسەر ئاستی نێودەڵەتی بۆمان دەردەکەوێت کە ئەو ڕووداو و قەیرانانە لە خودی خۆیاندا زۆر بەپەلە و بەزوویی کاریگەریان دەرکەوتووە و لێکەوتەی گەورەیان هێناوەتەکایەوە. ئەگەر تەماشای جەنگی یەکەمی جیهانی بکەین بۆمان دەردەکەوێت کە چۆن بووەتە خاڵی وەرچەرخان. ئەمریکای لە سیاسەتی گۆشەگیری هێنایە ناو سیستمی جیهانی هەرچەندە بێلایەن بوو لە سەرەتای جەنگەکەدا، بەڵام دوای هێرشی ئەڵمانەکان بۆ سەر کەشتی گەلێکی ئەمریکی لە ساڵی ١٩١٦دا ئەمریکا چوویە شەڕەکەوە، دوای ئەوەی وڵسن داوای لە کۆنگریس کرد کە ڕەزامەندی بدەن لەسەر بەشداریکردن لەو جەنگەدا و بووبە کاراکتەرێکی سەرەکی و ڕۆڵی جددی لە پستگیری بەریتانیا و فەرەنسا زیاتر لەڕووی ئابووریی و لۆجستییەوە وەرگرت. ئەم جەنگە و هەنگاوێکی لەم جۆرە لە ڕێڕەوی براوە بوون بوونە هۆی دارشتنەوەی هێز و دابەشکردنی دەستکەوتەکان لەسەر ئاستی نێوەدەوڵەتی. دوا بە دوای ئەم خاڵی وەرچەرخانە سیاسەتی نێوەدەوڵەتی لەچوارچێوەی ستراکچەرێکی نوێدا بۆ پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان لەڕێگەی کۆمەڵەی گەلانەوە گۆڕانکاری بەسەرداهات.١ لەم قۆناغەدا بەریتانیا و فەرەنسا بوون بەدوو زلهێز کە خاک و گەلانی ناوچەکانی دۆڕاوی شەڕیان بەتایبەتی دەوڵەتی عوسمانیان لە نێوان خۆیاندا دابەشکرد و پەیماننامەی سایکس پیکۆ لە ساڵی ١٩١٦دا ئەو دابەشکارییەی تێدا کرا.

جەنگی دووەمی جیهانی وەک خاڵێکی تری وەرچەخان سەیری دەکرێت، چونکە لەدوای خۆی گۆڕانکاری جددی لەسەر ئاستی نێودەڵەتی دروستکرد و لێکەوتەی هەبوو لەسەر هەموو کایەکان، بەدوای خۆشیدا ڕایلیزم بوو بەیەکێک لە سەرەکیترین بیردۆزەکانی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان.٢ ئەو جەنگە ئەمریکای کردە جەمسەرێکی سەرەکی سیاسەت و پەیوەندی نێودەڵەتی لە بەرامبەر یەکێتی سۆڤیەتدا. هەرچەندە لە سەرەتادا ئەمریکا بەشداری تەواوەتی ئەو جەنگەی نەکرد، بەڵام لە ساڵی ١٩٤١دا کەشتی گەلی ئەمریکا لەلایەن یابانەکانەوە هێریشیان کرایە سەر ئەمریکا بەتەواوەتی هاتە ناو

جەنگەکەوە و لە بەرژەوەندی ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی کۆتای بە جەنگەکە هات.

لە دوای جەنگەکە، جەنگی سارد لە نێوان بلۆکی ڕۆژهەڵات بە سەرۆکایەتی سۆڤیەت و بلۆکی ڕۆژئاوا بە سەرۆکایەتی ئەمریکا هاتە بوون، بۆماوەی نیو سەدە لە ململانێی قوڵدابوون. بەدەر لەمانە ئەم قۆناغە هەڵگری چەندین پرۆژە و کێبرکێی دوولایەن بوو لەسەر ئاستی جیهان وەک پرۆژەی مارشاڵ و دامەزراندنی نەتەوەیەکگرتووەکان و ناتۆ و وارشۆ و نەزەرییەی ئیحتیوای جۆرج کینان ....هتد.

ئەمانە پێمان دەڵێن کە داڕشتنەوەی سیاسەت و بەرژەوەندییەکان لەسەر ئاستی نێودەڵەتی بەرهەمی ئەو جەنگە بوو کە خاڵی وەرچەرخان بوو لەسەر ئاستی جیهان و تائێستاش لێکەوتەکان دەبینرێت.

یەکێکی تر لە خاڵەکانی وەرچەرخان لە سیاسەتی نێودەوڵەتیدا بریتی بوو لە هەرەسهێنانی بلۆکی ڕۆژهەڵات و سەرکەوتنی بلۆکی ڕۆژئاوا لە کۆتایی هاشتاکان و سەرەتای نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوو.

**لەم قۆناغەدا چەندین گۆڕانکاری هاتنە بوون لەسەر ئاستی جیهان، لەوانە:**

١. هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی سۆڤیەت.

٢. ڕووخانی دیواری بەرلین کە هێمای دابەشبوونی قوڵی سەردەمی جەنگی سارد بوو.

٣. جەنگی کەنداوی دووەم وەک سەرەتایەک بۆ قۆناغیکی نوێ لە سیاسەتی نێودەوڵەتی بە سەرۆکایەتی ئەمریکا.

٤. پەیڕەوکردنی تاک جەمسەری ئەمریکا لەسەر ئاستی سیاسەت و پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان.

٥. دەستپێکردنی سەرەتای قۆناغی یە=کەمی عەولەمە٣.

بۆشی باوک (سەرۆکی ئەو کاتەی ئەمریکا) بەڕوونی ڕایگەیاند کە لێرەوە، واتە لەم جەنگەی کەنداوەوە سەرەتای سیستمێکی نوێی جیهانی دادەمەزرێنین کە تیایدا ئاشتی و ئاسایش، ئازادی و حوکمی قانوونی تیدا بەرجەستە دەبێت.٤ لێرەوە مەبەستی بووە کە بە هەموو لایەکی ڕابگەیەنێت کە ئەم قۆناغە لە سیستمی نوێی جیهانی ئەمریکا وەک تاکە جەمسەر سەرۆکایەتی دەکات. بەتایبەت دوای ئەوەی بەهۆی نەمانی یەکێتی سۆڤیەت لەم ناوچەیە بۆشاییەکی نێودەوڵەتی دروست ببوو.

---

3. Robert Kaplan, "Coronavirus Ushers in the Globalization We Were Afraid Of," Bloomberg, March 20, 2020.

4. Annita Lazar and Michelle M. Lazar, "The Discourse of the New World Order: 'Out-Cast-ing'the Double Face of Threat," Discourse & Society 15, no. 2–3 (May 2004): 223–42, https://doi.org/10.1177/0957926504041018. P.225-226

لە سەرەتای هەزارەی سێ یەم خاڵێکی تری وەرچەرخان هاتەبوون، کە بریتی بوو لە ڕووداوی ١١ سێپتەمبەر، کە لەئەنجامدا ئەمریکا گۆڕانکاری لەسەر سیاسەتی نێودەوڵەتی هێنایە بوون لەسەر بنەمای (اما معی او ضدی)، بەوجۆرە لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی دەوڵەتان ئەگەر پشتگیری ئەمریکا نەکەن ئەوا هیچ بژاردەیەکی تریان نییە جگە لەوەی دەبنە دوژمنی ئەمریکا. ئەم جۆرە لە سیاسەتە لە پێشووتردا بوونی نەبوو لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی و پەیوەندییە سیاسییەکان. ئەوەبوو لێکەوتەکانی هێرشی ئەمریکا بۆ ئەفغانستان و پاشانیش لە ساڵی ٢٠٠٣دا بۆ سەر عێراق و هاتنی هێزی زیاتری ئەمریکا بۆ ناوچەکە. لەم بارودۆخەدا بەرژەوەندی ئەمریکییەکان لە ناوچەکە و جیهانیش زیاتر بوو بەوەی هێزەکانی تری نێودەوڵەتی نەیان دەتوانی لە دەرەوەی بازنەی سیاسەتەکان ئەمریکا هەنگاویان هەبێت.

لەم ڕوانگەیەوە دەتوانین بڵێین ئەو ڕووداوانەی کە خاڵی وەرچەرخان دروست دەکەن لە بواری پەیوەندییە سیاسییە نێودەوڵەتییەکاندا هەڵگری گۆڕانکاری ڕیشەیین لە بواری دووبارە دارشتنەوەی پەیوەندی نێوان دەوڵەتان و دروستبوونی هەژموونێکی نوێ لەو بوارەدا و دەبێت لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی کاریگەریی و لێکەوتەکانی ببینرێت.

سەبارەت بە کۆڤید-١٩ وەک پەتایەکی جیهانی کە ئایا بووەتە خاڵێکی وەرچەرخان لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی و پەیوەندییە سیاسییەکان هاوشێوەی ئەو ڕووداوانەی کە گۆڕانکارییان دروست کرد لەڕابردوودا، هێشتا کاریگەریی و لێکەوتەکانی تەواو گەڵاڵە نەبووە. هەرچەندە لیپسکی دەڵێت:" کۆرۆنا پەنجەرەیەکی کردۆتەوە یان دروستکردووە بۆ وەرچەرخان و سیاسەتی گۆڕانکاری لە داهاتوویەکی دووردا. بۆیە ئەو پێیوایە کۆرۆنا وەک هەر قەیرانێکی تر دەتوانێت ببێتە خاڵی وەرچەرخان".٥

ڕۆبیرت کاپلان پێیوایە وەک ١١ سێپتەمبەری ٢٠٠١ و قەیرانی دارایی جیهانی (٢٠٠٧-٢٠٠٩) پەتای کۆرۆنا شۆکی ئابووریی و جیۆپۆڵەتیکی بەدوای خۆیدا دەهێنێت دوای ئەوەی کە تەواویش دەبێت، لەوە زیاتریش کۆرۆنا دەبێتە خاڵێکی مێژوویی لێکجیاکەرەوەی قۆناغی یەکەمی عەولەمە لە قۆناغی دووەمی عەولەمە.٦ لەم ڕوانگەیەوە کەواتە کۆرۆنا کۆتایی بە قۆناغی یەکەمی عەولەمە هێناوە و لەهەمانکاتدا قۆناغی دووەم دەستپێکردووە.

لەمەش زیاتر هەریەک لە کۆرت ڕەش دەڵێن لەمرۆدا بڕیاربەدەستانی ئەمریکا دەبێت

---

50 Phillip Y. Lipscy, “COVID-19 and the Politics of Crisis,” International Organization, October 12, 2020, 1–30, https://doi.org/10.1017/S0020818320000375.the division of international relations into international political economy (IPE P.22

6. Kaplan, “Coronavirus Ushers in the Globalization We Were Afraid Of.”

ئەوە بزانن ئەگەر وڵاتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا لەئاستی مەترسی و ڕووبەربوونەوەی ئەم کاتەدا نەبن ، ئەوا پەتای کۆرۆنا دەبێتە قەیرانی سویس بۆ ئەمریکا.٧ ئەمە وەک ئاماژەیەک بەوەی کە دەسەڵاتی جارانیان لەسەر ئاستی سیاسەتی نێودەڵەتی هاوشێوەی پێش کۆرۆنا نامینێت و لەئاستی ئەو ئالێنگارییەدا نابن.٨ ئەم لێکچوواندنە لەگەڵ کۆرۆنا و بۆ پێگەی ئەمریکا لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی جیاوازییەکی زۆریان هەیە، چونکە ئەم پەتایە تەنها لە ئەمریکا و ئەوروپا بڵاونەبووتەوە، بەڵکو کۆی دەوڵەتانی جیهانی گرتووەتەوە و هیچ جیاوازیی نەکردووە لە نێوانیاندا، بەڵام لەسەر ئاستی سیاسی هێشتا ڕوون نییە کە لێکەوتەکانی بوونەتە هۆی یان دەبنە هۆی دروستکردنی جیهانێکی نوێ و سیستمێکی جیهانی جیاواز.

> **لە هەڵبژاردنەکانی ئەمریکادا یەکێك لە خاڵەکانی کەمپینی بایدن ڕەخنەگرتن بوو لە ئیدارەی ترەمپ لە ڕووبوونەوەی کۆرۆنادا، بەوپێیەی کە کەمتەرخەم بووە.**

ئەو بۆچوونەی کە پێیوایە کۆرۆنا دەبێت یان بووەتە گۆڕانکاری لەسەر ئاستی سیاسەتی جیهانی لە سەرەتای سەرهەڵدانی پەتاکەوە بوو بەتایبەتی لە مانگی ئازاری ٢٠٢٠ لەوکاتەشدا بیر و بۆچوونەکان لەسەر ئەم پەتایە ڕوون نەبوون، بەتایبەت ئەوەی کە ئەمریکا چۆن مامەڵەی لەگەڵدا دەکات. بۆیە ئەو مەترسییە هەبوو لەلایەن شارەزایانی سیاسەتی ئەمریکاوە کە ئەگەر چین لەم بابەتەدا لە پێش ئەمریکاوە بێت و ئەمریکاش وەک چۆن لە سیاسەتدا سەئامەدە ئاوانەبێت ئەوا هێزی خۆی لەسەر ئاستی جیهان لەدەستدەدات.٩ ئەم گریمانەیە لە ئێستادا زۆر گەڵاڵەبوو نییە، بەتایبەتی دوای ئەوەی ئەمریکا یەکەم دەوڵەت بوو لەسەر ئاستی جیهان کە ڤایرۆسی کۆرۆنای دۆزییەوە.

لاورێنس دەڵێت: کۆڤید ١٩ سێیەم گەورەترین شۆکە، کە ڕووبەڕووی سیستمی جیهانی دەبێتەوە لە هەزارەی سێیەم دوای ١١ی ئەیلول و قەیرانی دارایی جیهانی، ئەو

٧. ئەم قەیرانە ١٩٥٦ هاتەبوون کە تیایدا بەرای کۆرت ورەش ئەمریکا وەک بەریتانیا هێزی نیودەولەتی لاوازدەبێت

8. Kurt M. Campbell and Rush Doshi, “The Coronavirus Could Reshape Global Order,” Foreign Affairs, March 18, 2020.

9. Campbell and Doshi.

دەڵێت: من پێموایە کاریگەرییەکانی گەورەتر دەبێ.١٠ ئەو پێیوایە کە ئەمریکا هەنگاوی باشی ناوە لە ڕووبەڕووبوونەوەی کۆرۆنا، بەڵام باشترین هەنگاو نییە.١١

کۆرۆنا خۆی وا نمایش دەکات بوارێک بێت گۆڕانکاری وەرچەرخانی لە سیستمی نێودەوڵەتیدا دروستبکات. سیستمی نێودەوڵەتی خۆی لە بەردەم ئاڵنگاریدا بوو لە بەردەم فشاری هاتنە پێشەوەی هێزی نویی نێودەوڵتیدا وەک چین و پاشەکشەکردنی هاوکاری هێزە کلاسیکییە نێودەوڵەتییەکان وەک ئەمریکا و بەریتانیا.١٢ بوونی قەیران لە سیستمی جیهانی واتای ئەوە ناگەیەنێت کە کۆرۆنا ئەو قەیرانانە بگوازێتەوە بۆ قۆناغێکی نوێ و سەرەتایەکی تر.

سەرەڕای ئەو بۆچوونەی کە پێیوایە کۆرۆنا خاڵی وەرچەرخانی قۆناغێکی نوێیە لەسەر ئاستی سیاسەت و سیستمی جیهانی، بەڵام بۆچوونی جیاوازیش هەیە لەوانەش دریزنیر. ئەو پێیوایە لە گۆڕانکارییە نێودەوڵەتییەکاندا پێویستە گۆڕانکاری لە دوو فاکتەری گرنگدا ڕوودبات، یەکەم دابەشکردنی هێز. دووەم، سەرلەنوێ دابەشکردنەوەی بەرژەوەندییەکان. ئەم دوو بوارە زۆر گرنگە بۆئەوەی گۆڕانکاری لەسەر ئاستی جیهانی و پەیوەندییە نیودەوڵەتییەکاندا بێتەبوون.١٣ ئەو پێیوایە کۆڤید نەبووەتە هۆی ئەوەی کە سیاسەتی نێودەوڵەتی بچێتە قۆناغێکی نوێوە کە تیادا دابەشکردنی هێز و بەرژوەوەندییەکان کاریگەری کۆڤیدی زۆری لەسەر نەبووە، بەڵکو زیاتر بۆ چەسپاندنی ئەو واقیعەی کە هەیە کاری کردووە.١٤ ئەم بۆچوونە زیاتر لەگەڵ ئێستای سیاسەتە و پەیوەندییەکاندا گونجاوە، چونکە تائێستا گۆڕانکاری بەهۆی کۆرۆناوە لەسەر سیستمی جیهانی دەرنەکەوتووە.

بۆیە لەکۆتاییدا دەتوانین ئەوە بڵێین، سەرەڕای ئەوەی کۆڤید نەبووەتە خاڵی وەرچەرخان تاوەکو ئێستا(٢٠٢١/٠١/٠١) و نەیتوانیوە بگاتە ئەو ئاستەی کە داڕشتنەوە بکات بۆ پەیوەندییە سیاسییە نێودەوڵەتییەکان و سەرلەنوێ داڕشتنەوەی پەیوەندییە ئابوورییەکان. بەواتایەکی تر نابینرێت دوو دەوڵەت لەگەڵ یەکتر ناکۆک بن بەهۆی

---

10. Lawrence Summers, “Covid-19 Looks like a Hinge in History | Free to Read,” Financial Times, May 14, 2020.

11. Summers.

12. Lipscy, “COVID-19 and the Politics of Crisis.”the division of international relations into international political economy (IPEP.23

13. Daniel W. Drezner, “The Song Remains the Same: International Relations After COVID-19,” International Organization, August 19, 2020, 19, https://doi.org/10.1017/S0020818320000351. P.2

14. Drezner, “The Song Remains the Same.” P.14

کۆڤیدەوە، یان دەوڵەتێک لەگەڵ دەوڵەتانی جیهان پەیوەندییەکانیان باش بووبێت یان خراپتر بووبێت. بابەتی خراپ بوونی پەیوەندی چین لەگەڵ ئەمریکا یان دەوڵەتانی ئەورووپا، بە ئەندازەی ئەوەندەی ئەو دوو دەوڵەتە (چین و ئەمریکا) ناکۆکی ئابووری پێشووتریان هەبووە ئەوەندە کۆڤید نەبووەتە هۆی دروستبوونی ناکۆکی نوێ لە بواری ئابووری و بازرگانیدا، بۆیە پراکتیکییەن تێکچوونی پەیوەندیی چین و دەوڵەتانی تر بە پاساوی ئەوەی کە سەرچاوەی ڤایرۆسەکەیە تائێستا بابەتێکی لاوازە. ئەگەر ئەو لێکدانەوەیە ڕاست بێت بۆ تۆمەتبارکرنی چین و تێکچوونی پەیوەندیی لەگەڵ ئەمریکا و ئەورووپا «کەواش نییە» لەبەرئەوەی کە ڤایرۆسەکە لەوێ سەریهەڵداوە ئەوا دەبێت بۆ دەرکەوتن و بڵاوبوونەوەی جۆری نوێی ڤایرۆسەکە لە بەریتانیا و بڵاوبوونەوەی لە دەوڵەتانی تر هەمان کاریگەری دروستبکات!؟

بەڵام لەهەمانکاتدا بڵاوبوونەوەی کۆرۆنا بەوشێوازە لەسەر ئاستی جیهان هەروا بێ کاریگەر نەبووە لە بواری ئابووریدا، لێکەوتە ئابوورییەکانیشی لە داهاتوودا پێش لێکەوتە سیاسییەکانی دەکەوێت بەوپێیەی ڕەهەندە ئابوورییەکەی زۆر زاڵترە لە ڕەهەندە سیاسییەکە. دۆزینەوەی ڤاکسینی کۆڤید لەلایەن کۆمپانییەکانەوە لە ئەمریکا و بەریتانیا کێبرکێی ئابوورییەکانی نێوان دەوڵەتە ئابوورییەکان خێراتر دەکات، بەتایبەت دوای ئەوەی دەوڵەتانی تریش ڤاکسین بدۆزنەوە بەتایبەت ڕووسیا و چین. ئەو کاتەی کە ململانێکان گەرمتر دەبن لە بواری ئابووریی، ئەوەش کێشەی سیاسی و ڕەنگە گۆڕانکاری لەسەر ئاستی نێودەوڵەتیش دروستبکات.

لەڕووی سیاسەتی ناوخۆییەوە ئەکرێ لێکەوتەی کۆڤید و کاریگەرییەکانی ببینرێت و هەبووە بەتایبەت لەسەر ململانێیە ناوخۆییەکان، ئەگەر هێزێکی سیاسی لە بەرامبەر هێزێکی تری سیاسی بەکاریهێنابێت یان هێزی دەسەڵات نەیتوانی بێت لە ئاستی ئەو پەتایەدابێت نارەزایی ناوخۆیی لێکەوتووەتەوە. لە هەڵبژاردنەکانی ئەمریکادا یەکێک لە خاڵەکانی کەمپینی بایدن ڕەخنەگرتن بوو لە ئیدارەی ترەمپ لە ڕووبوونەوەی کۆرۆنادا، بەوپێیەی کە کەمتەرخەم بووە، بۆیە ئەگەر کەوتنی ترەمپ چەندین هۆکاری هەبووبێت، ئەوا یەکێک لە هۆکارە لاوەکییەکان ڕەخنەلێگرتن بووە لێی لە خراپی ئیدارەدانی ئەو قەیرانە.

## سەرچاوەکان

Brown, Chris, and Kirsten Ainley. Understanding International Relations. 4th ed. Basingstoke: Palgrave Macmillan, 2009.

Campbell, Kurt M., and Rush Doshi. "The Coronavirus Could Reshape Global Order." Foreign Affairs, March 18, 2020.

Drezner, Daniel W. "The Song Remains the Same: International Relations After COVID-19." International Organization, August 19, 2020, 1–18. https://doi.org/10.1017/S0020818320000351.

Kaplan, Robert. "Coronavirus Ushers in the Globalization We Were Afraid Of." Bloomberg, March 20, 2020.

Lazar, Annita, and Michelle M. Lazar. "The Discourse of the New World Order: 'Out-Casting'the Double Face of Threat." Discourse & Society 15, no. 2–3 (May 2004): 223–42. https://doi.org/10.1177/0957926504041018.
Lipscy, Phillip Y. "COVID-19 and the Politics of Crisis." International Organization, October 12, 2020, 1–30. https://doi.org/10.1017/S0020818320000375.

Summers, Lawrence. "Covid-19 Looks like a Hinge in History | Free to Read." Financial Times, May 14, 2020.


**د.ئیسماعیل بەرزنجی**

لەدایکبووی ١٩٧٨. بڕوانامەی دکتۆرای هەیە لە ئەدەبی عەرەبی. چوار بەرهەمی چاپکراوی هەیە. چەندین توێژینەوە و وتاری بڵاوکراوەی هەیە. ئەندامی دەستەی کارگێڕی سەنتەری زەهاوییە.

# کۆرۆنا...
## دیاریی فیکری لیبرالی بۆ مرۆڤایەتی

لەوانەیە لە سەرەتاوە ئەو پرسیارە لای خوێنەر دروست ببێ کە کۆرۆنا نەخۆشییەکی جیهانییە و لە چینەوە سەری هەڵداوە، بۆچی دەبێ دیاری دەستی فیکری لیبراڵی بێت کە ماکەکەی لە ڕۆژئاوایە؟ بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە دەبێ کەمێک بگەڕێینەوە بۆ دواوە لە مێژووی ڕۆژئاوا و شارستانییەکەی و بگەڕێین بۆ پێگەی مرۆڤ لە هزر و بیری ئەواندا، بەشێوەیەکی گشتی لە قۆناغە مێژووییە یەک لە دوای یەکەکانی ڕۆژئاوادا تا گەیشتن بە قۆناغی پۆست مۆدێرنە مرۆڤ سەنتەر و چەقی هزر و بیرکردنەوەیان بووە، ئەگەرچی ئەو مرۆڤ سەنتەرییە لە سەدەکانی ناوەڕاست و قۆناغی ڕۆشنگەریی و ڕێنیسانس و دواتر سەردەمی مۆدێرنە شەقڵ و تایبەتمەندی جیاوازی هەبووە، بەڵام هێڵی گشتی کۆکەرەوەی هەموو قۆناغەکان بووە.

مرۆڤ سەنتەریی واتا تێڕوانین و بیرکردنەوە و هەڵوێستی فەلسەفی لەبارەی بوون و بوونەوەر و تیۆریزەکردنی هەموو بوارەکانی ژیان لە گرنگی و پێگەی مرۆڤەوە سەرچاوە بگرێت، بەحوکمی ئەوەی فیکر سەرچاوەی کایە مەعریفییەکانی ترە و هەموویان لە داڕشتنی تێز و تیۆرەکانیاندا لە فیکرێکی دیاریکراو و چوارچێوەیەکی فەلسەفییەوە هەڵدەهێنجن ئەم مرۆڤ سەنتەرییە لە هەموویاندا ڕەنگیداوەتەوە. ئەگەر بمانەوێت جیاوازییەکی جەوهەری لە نێوان پێگەی مرۆڤ لە قۆناغی مۆدێرنە و پێش ئەودا بکەین دەتوانین بڵێین مرۆڤی سەردەمی مۆدێرنە مرۆڤێکی تاکڕەهەندی ماددییە داڕنراو لەلایەنی ڕوحی تا ڕادەی نەبوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر سەرچاوە و مەرجەعی فیکر و کایە مەعریفییەکان بووە، بۆ نموونە کاتێک باس لە مافی مرۆڤ کراوە سرووشتی مرۆڤبوونی لەبەرچاو گیراوە، بەواتای ئەوەی پێکهاتەی جەستەیی و دەروونی ئەو چی دەخوازێت لە ژیاندا پێویستە بۆی دابین بکرێت بەبێ لەبەرچاوگرتنی ڕەنگ و پێست و نەژاد کە ئەمانە هیچ لە جەوهەری مرۆڤبوون ناگۆڕن، یان لە دانانی یاسا بۆ وڵاتدا ڕەچاوی ئەو سرووشتی مرۆڤبوونە کراوە بۆ ڕێکخستنی پەیوەندیی مرۆڤەکان بەیەکترییەوە، دیسان لە بواری ئەدەب و ڕەخنەی ئەدەبیدا بۆگەڕاوە (المرجع) هەر مرۆڤ بووە وەک سەنتەر و چەقی لێوەدەرچوون، بەهەمانشێوە لە بوارەکانی ئابووریی و بازرگانیی و سیاسەتی نێودەوڵەتی و .....هتد. ئەمەش وایکردووە کە هەرشتێک لە مرۆڤەوە بێت و لە تایبەتمەندییەکانی ئەو بێت جێگای بایەخ و گرنگی بێت، وەک دەروونزانی و زمان و تەندرووستی کلتوور و ژیانی کۆمەڵایەتی. بەکورتی مرۆڤ لەو قۆناغانەدا سەروەر و چەقی گەردوون و بوونەوەر و هەموو شتەکانی تر بووە، بۆیە هەمیشە فیکر بەخشەر و بەرهەمهێنەری کایەکانی تر بووە.

بەڵام کاتێک شارستانییەتی نوێی ڕۆژئاوا پێی نایە قۆناغی دوای مۆدێرنە ئەوا ڕەوشێکی خراپ هاتە ئاراوە سەبارە بە تێڕوانین لە مرۆڤ پێگە گرنگەکەی لە ژیاندا، تەنانەت ئەو مرۆڤە تاکڕەهەند و بێ ڕوحەش نەما کە پێشتر هەبوو، لە سەنتەری ژیان و بوونەوەر و چەقی بیرکردنەوە لادرا. ئەمە چۆن ڕوویدا؟ کاتێک مۆدێرنە گەیشتە دوا قۆناغەکانی بەهۆی پێداگریی زۆری لەسەر ئازادی تاک لە چۆنیەتی ژیانیدا و گرنگیدان بە کلتووری تاکگەرایی و ئازادی لە بازرگانیکردن و ڕێخۆشکردن بۆ گەشەکردنی سەرمایەداری پاشان هاتنەئارای جیهانگیریی، یەکگرتنێک لە نێوان فیکر و کایەی ئابووریدا دروست بوو، ئەویش لەوەدا کە فیکری لیبراڵی زۆر کاری دەکرد لەسەر ئازادی تاک لە هەڵبژارنی شێوەی ژیانیدا و دژایەتیکردنی هەموو جۆرە سێبەر و سەقفێک کە کاربکاتە سەر ئەو

ئازادیەی، واتا ڕەتکردنەوەی وصایە لە هەر شوێنێکەوە بێت، خێزان، عەشیرەت، نەتەوە، تەنانەت دەوڵەتیش، سەرمایەداریش وەک سیستمی ئابووری باو لە ڕۆژئاوا ئەم هەلەی قۆستەوە بۆ زیاتر دابڕینی تاکەکان لەیەکتریی و لە خێزان و کۆمەڵگاکانیان تا بە ئاسانی کار لە بژاردەی ژیانیان بکات و بیانکات بە کڕیاری بەردەوامی کاڵا و بەرهەمەکانی . لەمەوە سەرمایەداریی وەک سیستمی ئابووری بوو بە مەرجەع و سەرچاوە بۆ تیۆریزەکردنی فیکر، واتە تەواو بارەکە پێچەوانە بۆوە، لە جیاتی ئەوەی فیکر سیستمی ئابووری بەرهەم بهێنێت و داتای پێویستی بداتێ، سەرمایەداری بوو بە ماک و سەرچاوەی تێزی فیکریی، لەمەوە قۆناغی سەرمایەداری دواین و لیبڕالیزمی نوێ بوون بە دووڕووی یەک دراو بۆ بچووککردنەوەی مرۆڤ و سادەکردنەوەی و نەهێشتنی ڕۆڵی لە ژیاندا، هەموو ئەمە لەم چەند دەیەی کۆتایی سەدەی بیست و سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا ڕوویدا کاتێک شارستانییەتی نوێی جیهان لە ڕۆژئاوا چووە قۆناغی پۆست مۆدێرنەوە. مرۆڤ کرا بە کائینێکی ماددی بەکاربەر و کڕیاری شتومەک و کاڵا، بە ڕیکلام و دەزگای میدیایی گەورە زۆر بە ئاسانی ئاڕاستە کرا بۆ ئەو مەبەستەی سەرمایەداریی دەیخوازێت، ئێستا مرۆڤ بیرناکاتەوە، بەڵکو ئەو ڕێگایە دەگرێتەبەر کە بەناوی مۆدێل و ڤێرژن و نەوەی تازەوە دیاری دەکرێت، چونکە مرۆڤ خۆی مەبەست نییە وەک سرووشتی مرۆڤبوونی، بەڵکو مرۆڤ پێویستە وەک کڕیارێکی بەردەوام.

> **فیکری لیبراڵی زۆر کاری دەکرد لەسەر ئازادی تاک لە هەڵبژارنی شێوەی ژیانیدا و دژایەتیکردنی هەموو جۆرە سێبەر و سەقفێک کە کاربکاتە سەر ئەو ئازادیەی، واتا ڕەتکردنەوەی وصایە لە هەر شوێنێکەوە بێت.**

جا ئەگەر لۆجیکی سەرمایەداریی تەنها قازانج و کەڵەکەکردنی سەرمایە و بەرهەمهێنان و بەکاربردن بێت، ئەوا مرۆڤ تەنها دوو ڕۆڵ دەگێڕێت: یەکێکیان کارکردن بۆ کارگە و کۆمپانیا گەورەکان تا بەرهەمیان زۆرتر و زۆرتر بێت، ئەویتریش کڕینی بەرهەمەکان و بەکاربردنیان بۆ چێژی ماددی و هیچیتر. بۆیە مرۆڤبوون چیە؟ بەزەیی و ئەخلاق و بەهابالاکان پارە ناکەن، پارەش پەیدا ناکەن، باوکایەتیکردن یان دایکایەتیکردن و بەخێوکردنی منداڵ بەهیچ شێوەیەک کار نییە، چونکە بەهایەکی ماددی نییە، یان باشتر

بڵێین کەس پارەی پێنادات.  کەواتە کاتێک مرۆڤ ئاوا بێبەها دەکرێت کێ گرنگی دەدات بە تەندرووستی و ژیانی ئەگەر قازانج و بەهایەکی ماددی لە بەرامبەردا نەدرێت؟ کێ لادەکاتەوە لەو لایەنە مرۆڤایەتییەی کە پارەی تێدا پەیدا ناکرێت؟ خراپترین شتێک کە نیولیبڕالیزم کردی نەهێشتنی ڕۆڵی دامەزراوە کۆمەڵایەتی و فەرمییەکان بوو، واتە نەهێشتنی ڕۆڵی خێزان و کاریگەریی لە ژیانی تاکەکاندا، هەروەها لاوازکردنی ڕۆڵی دەوڵەت و نەهێشتنی هەیمەنەی بەسەر هاوڵاتیانەوە، کاتێک ئەم دوو سێبەرە لەسەر مرۆڤەکان لادەچن ئیتر دەبنە نێچیری کۆمپانیا چاوچنۆکەکان و دەکەونە بەر ڕەحمەتی بێویژدانی و خوێنمژییان، چونکە ئەوان تا ئەوکاتە مرۆڤێکیان قبووڵە کە بەرهەمهێن و کڕیار بێت لەهەمانکاتدا، تا جووت و ئاشیان بەیەکەوە بگەڕێت.  ئێستا ئەگەر کۆرۆناش نەبووایە و هەر نەخۆشیەکی تری درمی بووایە، ئەوەی کە کردی بە جیهان هەر دەیکرد، چونکە ژینگەیەکی لەبار لە جیهاندا هەیە بۆ بڵاوبوونەوەی، کەس گوێ بە مرۆڤ و مرۆڤ سەنتەریی نادات، هیچ ناکرێت لەبەر خاتری خودی مرۆڤ تا ئەو مرۆڤە کڕیار و ئیشکەرە نەبێت کە سەرمایەداریی و لیبڕالیزم دەیانەوێت، دەمرێت یان نەخۆش دەکەوێت کێشە نییە، کاتێک کێشەیە کە زیان لە سامان و قازانج و بەرهەمی کارگەکان بدات.



نووسینی: د.ئەلتیجانی عەبدولقادر حامد

وەرگێڕانی: ڕێدار ئەحمەد

# زانستە سیاسییەکان: قۆناغی پاش کورۆنا

لەم توێژینەوە کورتەدا هەوڵ دەدەین لەو گۆڕانکارییانە ڕامێنین کە پێشبینیکراو بوو بەهۆی «ئاریشەی کورۆنا»هوە لە ئاڕاستەکانی زانستە سیاسییەکان و بەڵگەنەویستە گەورەکانیدا بەدی بێت و، سەرنجی جۆری ئەو پرسیارانە بدەین کە ئەم ئاریشەیە بەشێوەیەکی گشتی ڕووبەڕووی زانایانی سیاسەتی دەکاتەوە، سەرەتا بەخستنەڕووی ناساندنی ڕووداوەکە و لێکەوتەکانی دەستپێدەکەین، پاشان باس لە هەندێك لەو بەڵگەنەویستانەی زانستە سیاسییەکان دەکەین، لەکۆتایشدا قسە لەسەر ئەو گۆڕانکارییانە بکەین کە دەکرێت پاش کورۆنا بەسەر ئاڕاستەکانیدا بێت.

## ١- چی ڕوویدا؟

پەتا کوشندەکە – کە بەناوی کورۆناوە ناسرا، دواتریش ناوی بووە کۆڤید ١٩- لە مانگی دیسەمبەری ٢٠١٩ لە ناوچەی (ووهان Wuhan)ی چین دەرکەوت، باس لەوە کرا سەرچاوەی پەتاکە بۆ بازاڕێکی گشتیی ماسی فرۆشتن دەگەڕێتەوە، گوایە ئافرەتێکی تەمەن ٤٩ ساڵ شۆربای شەمشەمەکوێرە (bat soup)ی خواردووە و نیشانەکانی نەخۆشییەکی کوشندەی تێدا دەرکەوتووە، کە لە سەرەتاوە هیچ ڕوون نەبوو، بەڵام دکتۆرێکی گەنج بەناوی لی ونلیانگ (Li Wenliang)ی تەمەن ٣٣ ساڵ توانی لە ٢٣ی دیسەمبەری ٢٠١٩دا ڤایرۆسە کوشندەکە بناسێت، دەستبەجێ هەستا بە بڵاوکردنەوە ئاگادارکردنەوەیەکی توندی هاوڕێ پزیشکەکانی لەڕێگەی لاپەڕە تایبەتەکەی خۆیەوە، بەڵام زۆر زوو لەلایەن نووسینگەی ئاسایشی گشتییەوە بانگکراو و تۆمەتی بڵاوکردنەوەی زانیاری ناڕاستی درایە پاڵ، کە زیان بە سیستەمی کۆمەڵایەتی دەگەیەنێت، داوای لێکرا ئاگاداریەکەی بکێشێتەوە، دوای چەند ڕۆژێکی کەم دکتۆر (لی) خۆی نیشانەکانی نەخۆشییەکەی تێدا دەرکەوت و ڕەوانەی نەخۆشخانە کرا، کە لەوێ بۆ دووەمجار هەستا بە بڵاوکردنەوەی وێنەکەی لەسەر پێخەفی مردن، کە لەڕێگەی ئامێری دەستکردەوە هەناسە دەدات، ئەمە ئەو دیمەنە بوو کە هەموو جیهانی تۆقاند، ڕاگەیاندنی هەواڵی مردنیشی خەمێکی قوڵی خستە هەموو وڵاتەکەوە، شەپۆلێکی توندی ناڕەزایەتیشی لە نێوەندی کۆمەڵایەتی وڵاتی چیندا بەدوا خۆیدا هێنا، بەشێوەیەک داوا لە حکومەتی خۆجێی دەکرا داوای لێبوردن بکات و، داواشیان لە حکومەتی مەرکەزی دەکرد ئازادی قسەکردن دابین بکات، مردنی دکتۆر لی تەنها نەبووە کارەساتێکی سیاسی بۆ سەرۆک (شی جیینپینگ Xi Jinping-) بەڵکو بووە کارەساتێکی جیهانی.

ڤایرۆسەکە لەکاتی ناسینییەوە لە ماوەی تەنها سێ مانگدا بەهەموو وڵاتانی جیهاندا بڵاوبوویەوە، لە ماوەی کەمتر لە چوار مانگیشدا ژمارەی تووشبووان لە هەموو جیهاندا گەیشتە نزیکەی یەک ملیۆن کەس، ژمارەی مردووان گەیشتە نزیکەی سەد هەزار کەس، بە هەزاران ملیۆن کەسیش تووشی حاڵەتێکی تۆقین بوون، دەسەڵاتدارانی وڵاتەکانیان ناچاریان کردن لە ماڵەکانیاندا بمێننەوە، قەدەغەی هاتوچۆ کرا بۆ کاری زۆر پێویست نەبێت ڕێگە بەهاتوچۆ نەدەدرا، ئەوەش ئابووری جیهانی تووشی کارەسات کرد، پیشەسازی ڕاگرت، بازاڕە جیهانییەکانی دراو تووشی داڕمان بوون، نرخی نەوت دابەزینی زۆر گەورەی بەخۆیەوە بینی، بە هەزاران کەس لە کەرتی تایبەت و گشتیدا کاریان لەدەستدا، لەکاتێکدا ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ئاریشەکە توندتر دەبوو، پزیشک و پەرستارەکان

له نەخۆشخانەکاندا بەرەورووی مەترسی دەبوونەوە، ئەمەش بەهۆی کەمی پێداویستی پزیشکی و ماسکی پارێزەر لەو نەخۆشییە، لەکاتێکدا زانایان و توێژەران شەو و ڕۆژ لە تاقیگەکانیاندا بەمەبەستی ناسینی سروشتی ڤایرۆسە کوشندەکە شەونخونیان دەکێشا، سیاسەتمەدار و سەرکردەکانی وڵاتان جاڕی شەڕیان بە چەکێک لە دژی دوژمنێکی نەناسراو دەدا، کە ئەو چەکە لە جبەخانەکانیاندا بوونی نەبوو، بەهۆی ئەمەوە زۆرێک لە وڵاتان تووشی دەستەوسانی تەواو بوون، هیچیان لەدەست نەدەهات بۆ ڕاگرتنی ئەم کارەساتە، ڕۆڵی سیاسییەکان تەنها لە دەرکردنی ڕێنمایی قەدەغەکردنی هاتوچۆ و، بانگەشە بۆ دوورکەوتنەوە لەیەک و مانەوە لەنێو ماڵدا بۆ ماوەیەکی نەزانراو قەتیس ببوو.

## 2- گرنگی پێدرانی زانستە سیاسییەکان: قۆناغی پێش کارەساتەکە

زانستە سیاسییەکان لە کۆندا لە بەڵگەنەویستە هەرەمەزنەکانیدا پشتی بە فەلسەفە و ئایین دەبەست، فەیلەسوف و دانا و چاکخوازە ئایینییەکان – ئیدی لە ڕۆژئاوای ئەوروپی بێت، یان لە ڕۆژهەڵاتی هیندی و چینی، یاخود لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی جولەکە و مەسیحیی و ئیسلامی- ئەوانە سروشتی دەروونی مرۆڤایەتیان ڕوون دەکردەوە و، بڕیاریان لەسەر سروشتی کۆمەڵایەتی مرۆیی و، پەیوەندییەکانیان بە یاسا خواییەکانەوە و، لە واتای بەختەوەریی و چۆنیەتی بەڕێوەبردنی کاروباری گشتی لە کۆمەڵگە بەمەبەستی بەدیهێنانی دەدا و، دیارییان دەکرد کە کێ سەرکردایەتی بگرێتە دەست و، سەرچاوەی مەشروعیەتەکەی چییە، لەگەڵ هەموو کاروبارە تیۆرییەکانی دیکە، کە لەبارەیەوە، لە نێوان فەلسەفەیەک و فەلسەفەیەکی تر و، ئایینێک و ئایینێکی تر مشتومڕ هەبوو.

بەڵام زانستە سیاسییەکان لە سەردەمی ڕۆشنگەرییەوە لە فەلسەفە و ئایین دابڕان –لەبەر چەندین هۆکار کە لێرەدا بواری باسکردنیان نییە-، گۆڕا بۆ زانستێک کە باسی زانستە سروشتییەکانی دەکرد، بەهۆی ئەم دابڕان و گەڕانەوە بۆ سروشت وایلێهات زانایانی سیاسەت زۆر گرنگی بە بەڵگەنەویستە سەرەتاییە مەزنەکان نەدەن و، خۆیان بەگەڕان لەو بوارەدا سەرقاڵ نەکەن، بەڵام کاتێک یەکێکیان هەستی کردبایە پێویستی پێیەتی، ئەوا ئاوڕی لەوە دەدایەوە کە لە بوارە مەعریفییەکانی نزیک ئەودا بەدەستهاتووە، وەک زانستی کۆمەڵناسی و دەروونزانی و زانستی مرۆیی و زانستی ئابووری، ئەم زانستانەش لە دووریياندا لە بنچینە فەلسەفیی و ئایینیەکان زۆر لە زانستی سیاسی جیاواز نین، لەسەر تێڕوانینێکی هەمەکیش بۆ مرۆڤ، یان سروشتی دەروونی مرۆڤ، یاخود پەیوەندی مرۆڤ بەغەیبەوە یەکدەنگییەک لە نێوانیاندا نییە، وایلێهاتووە

زۆرینەی ئەم زانستانە -لەنێویشیاندا زانستە سیاسییەکان- هیچ مەرجەعیەتێکی باڵای نەبێت پشتی پێ ببەستێ جگەلە هەندێ بیردۆزەی دەروونزانی، وەک بیردۆزی زانای بەناوبانگی ڕوسی پاڤلۆڤ لەبارەی (فێرکردنی مەرجی) و بەدەمەوەهاتنی بەدەستهێنراو، وەها سەیری مرۆڤ دەکرا کە (بوونەوەرێکی ئابوورییە)، بەو واتایەی کە وزەیەک یان ئامێرێکی بەرهەمهێنان بێت، ئەوەشی هاندەریەتی بۆ وەبەرهێنان بریتییە لە پاڵنەری ماددی، هەروەها لەلایەکی ترەوە وەک ئامێرێکی بەکاربەر سەیری دەکرا، کە دەکرێت لەڕێگەی بانگەشە و ڕیکلامەوە هانبدرێت بۆ بەکاربردن، وایلێهات زاراوە باڵادەستەکان لە بواری سیاسیدا تەنها خۆی لە چەمکی چێژ و ئازار، سوود و هێز، قازانج و زەرەر، تێچوو و سوو و هاوشێوەکانیاندا دەبینییەوە، جگە لەوانە چەمکەکانی قوربانیدان و هاریکاریی و لەخۆبووردوویی تەنها لە سنوورێکی زۆر تەسکدا باس دەکران.

## 3- پرسیار و گرنگیپێدراوە نوێیەکان

ڕامانێکی لەسەرخۆ بۆ کارەساتی کورۆنای ئێستا، توێژەری زانستە سیاسییەکان –بەهەمان شێوەی توێژەرانی زانستە کۆمەڵایەتییەکانی نزیک لێی بەڕادەیەکی زۆر تووشی دڵەڕاوکێ و سەرسامبوون دەکات و، هانی دەدات بۆ وروژاندنی زۆر پرسیار سەبارەت بە بەڵگەنەویستە تیۆرییەکان کە لێیەوە سەرچاوەی دەگرت، لێرەدا تەنها بەخستنەڕووی چەند پرسیارێکی پەیوەندار بە سروشتی پاڵنەرە مرۆییەکان و، سنووری هێزی ماددە و، ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی واز دەهێنین.

**أ. پاڵنەرە ماددیی و ئەخلاقییەکان**

- سرووشتی ئەو پاڵنەرانە چۆنە کە وادەکات تاک ژیانی خۆی لەپێناوی ژیانی کەسانی تردا بخاتە مەترسییەوە؟ وەک ئەوەی کارمەندانی تەندروستی و، کرێکارانی چێشتخانە و دوکانی سەوزە فرۆشی و ژینگەپارێزان کردیان.
- تا چ ڕادەیەک دەکرێت بگوترێت پاڵنەری ماددی بەتەنها وایکردووە دکتۆر لی –بۆ نموونە– دیواری ترس و بێدەنگی بڕوخێنێت و، بەرەنگاری دەسەڵاتی سیاسی ببێتەوە و، مەترسی ڤایرۆسە لەناوبەرەکە بۆ هەموو جیهانی ڕابگەیەنێت؟
- ئایا جێگای ڕامان و تێبینی نییە کە ئەم کێشەیە ئەوە ڕوونکردەوە کە ئەو ڕۆڵەی بەها ئەخلاقییەکان دەیبینێ، لەسەرووی قازانج و زەرەرەوەیە؟

**ب. سنووری هێز**

حکومەتەکان لە جەنگە کۆنەکاندا دەیانتوانی «دوژمن» دیاری بکەن و، پاشان

ئامانجەکەیان دابنێن و چەکی گونجاوی بۆ هەڵبژێرن، «هێز»ی دەوڵەت بە ژمارەی سوپاکەی و چەکە ناوەکییەکانی و، کەشتییە ئاسمانی و زەمینییەکانی دیاری دەکرا، بەڵام لەحاڵی ئێستادا دوژمنەکە نەبینراوە، جەنگەکەی دیاری نەکراوە، هیچ لەو چەک و کەرەستە سەربازیانەی لەپێشتردا بەکاردەهێنران لەگەڵ ئەمدا ناگونجێن، کەرەستەی نوێ بووەتە دەمامک و ئامێری پشکنینی پزیشکی و، ئامێری هەناسەدانی دەستکرد، سەربازەکانی جەنگی ئێستا پزیشک و پەرستار و کارمەندانی تەندروستی و شۆفێری ئەمبولانسە. ئەم کارەساتە تا چەند دەریدەخات کە دامەزراوە سیاسییە کلاسیکییەکان ئیدی توانای ئەوەیان نییە یان ئامادەییان نییە بەرەنگاری «دوژمنە نوێیەکە« ببنەوە و، ناتوانن بەرەنگاری فشاری دروونی و ئەو ترازانە کۆمەڵایەتییە ببنەوە کە دروستی دەکات، بۆیە لەسەری پێویستە چاو بە چەمکی «هێز»و «ئاسایشی نەتەوەیی»یدا بخشێنێتەوە و، بابەتەکانی تەندروستی گشتی و ژینگە و پزیشکیی بخاتە پێشەوەی گرنگپێدراوەکان؟ تا چ رادەیەکیش سیستەمی سیاسی وایلێهاتووە لەبەردەم لەرزین و داڕماندایە بەهۆی دەرکەوتنی جۆری نوێی مەترسییەوە؟

> **حکومەتەکان لە جەنگە کۆنەکاندا دەیانتوانی «دوژمن» دیاری بکەن ئامانجەکەیان دابنێن و چەکی گونجاوی بۆ هەڵبژێرن، بەڵام لە ئێستادا دوژمنەکە نەبینراوە، کەرەستە سەربازیەکانی پێشتر بەکار دەهێنران، لەگەڵ ئەمدا ناگونجێن.**

**ج. لێهاتوویەتی سیستەمی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری یان دەستەوسانی؟**

چۆن گەورەترین دەوڵەتی پیشەسازی لە جیهاندا (وەک ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا) دەستەوسان ئەبێت لەوەی ماسک بۆ کارمەندانی بواری تەندروستی دابین بکات؟ لەکاتێکدا نرخی ماسک ناگاتە دۆلارێک. ئایا ئەمە ناکاتە ئەوەی گومان لە توانای سەرمایەداریی و لێهاتوویی بکەین؟ لەلایەکی دیکەوە چۆن لێکدانەوە بۆ رەفتاری هەندێک لە سەرمایەداران بکەین کە بڕێکی زۆر پارەیان بە کارمەندانی بواری پزیشکی بەخشی، وەک بیل گیتس (Bill Gates)و جاک ما (Jack Ma) کە دروشمی: (یەک جیهان و، یەک جەنگ One World, One Fight)ی بەرزکردەوە.

ئەوەشی بۆ سەرکردەکانی جیهان دووپاتکردەوە، کە تا سنووری نێوان

سەرچاوەکانمان هەڵنەگرین و، هاوبەشی یەک نەکەین لە تەکنیکەکاندا و، ئەو وانانەی بەماندووبوونی زۆر فێریان بووین لەگەڵ یەک ئاڵوگۆڕ پێنەکەین، ناتوانین ئەم ڤایرۆسە ببەزێنین، ئەوە بوو کۆمپانیای (عەلی بابا) هەستا بەدابەشکردنی کەرەستەی پزیشکی لە هەریەک لە ژاپۆن و کۆریای باشوور و هەندێک لەوڵاتانی ئەوروپا و چەندین وڵاتیش لە ئەفریقا، ملیۆنەها دۆلاریشی تایبەت کرد بەو ناوەندانەی توێژینەوە کە کار بۆ دۆزینەوەی چارەسەرێکی سەرکەوتوو بۆ نەخۆشییەکە دەکەن.

**د. ڕەوتی کۆمەڵایەتی نوێ؟**

لەمیانی ئەم کارەساتەدا تێبینی ئەوە دەکرێت کە ترس لە پەتاکە و، دارمانی ئابووریی و، ڕاوەستانی جوڵە و بەرهەمهێنان ئەو هۆکارانە بوو کە خەڵکیان ناچاری دوورکەوتنەوەی کۆمەڵایەتی و، مانەوەی ناچاری لە ماڵدا کرد، بەڵام ئایا تێبینی ئەوەش ناکرێت کە هەمان ئەم هۆکارانە گیانی هاریکاری کۆمەڵایەتی و قوربانیدانیان جوڵاند؟ ئایا ئەم گیانە ئاماژە نییە بۆ هەبوونی توانای گۆڕانێکی دەروونی و کۆمەڵایەتی گەورە کە دواتر جۆرێک کرداری سیاسی نوێی لێ بەرهەم بێت کە لەسەر هاریکاریی میللی دامەزرابێت، ئەمەش ببێتە هۆی گۆڕان لە ئەولەویاتی سیستەمی سیاسیی و ئابووری لە زۆرێک لە وڵاتانی ڕۆژئاوادا؟ تا چ ڕادەیەک تەکنەلۆژیای زانیارییەکان بووەتە چەکێکی بەهێز بەدەست جەماوەرەوە؟ تاچ ڕادەیەک ڕۆڵی پسپۆڕان و زانایان گەورەتر ئەبێت لە ئاڕاستەکردنی سیاسەتی گشتی دەوڵەتدا و، چۆن ئەوە کاریگەری دەبێت لەسەر سیستەمە دیموکراسییەکان کە لەسەر بنەمای هەڵبژاردن دامەزراون و، سیستەمە ئۆتۆکراسییەکان پێچەوانەی ئەوانن.



**پرۆفیسۆر دکتۆر حەسەن موفتی**

پرۆفیسۆر لە زانکۆی سەلاحەددین، سەرۆکی ئەنجومەنی باڵای فەتوا لە کوردستان.


# فەتوا هاوچەرخەکانی ئەنجومەنی بـاڵای فەتوا لە کوردستان تایبەت بە پەتای کوشندەی کۆرۆنا و دەرهاوێشتەکانی

پەتای کۆرۆنا کە هەندێك پێی وایە غەزەب و نیقمەتی پەروەردگارە، هەندێکیش پێیوایە درمێکی ئاساییە، ئێمەیش پێمانوایە کە بۆ ملهوڕ و بێباوەڕان نیقمەت و غەزەبی ئیلاهییە و مەبەست لێی نیشاندانی دەسەڵاتی خودایە کە چۆن دەتوانێت لە ڤایرۆسێکی نەبینراودا هەموو دەسەڵاتدارانی سەر ڕووی زەوی بتاسێنێت و ملهوڕانی دونیا بە چۆکدا بهێنێت، هەروەها دەرسێکیان دابدات پێی کە بەهۆیەوە بێنەوە هۆش و بگەڕێنەوە سەر ڕێگەی ڕاستی ئیسلامەتی وەك قورئان ئامازەی پێ کردووە دەفەرموێت: ئێمە ئەشکەنجە و سزایان دەدەین لە دونیادا بەمەبەستی ئەوەی بگەڕێنەوە، پاشان دەفەرموێت: «چەندە ستەمکارە لە خۆی ئەو کەسەی کە بە ئایەت و نیشانەکانی خودا وەبیرنەیەتەوە، پشتی لێ بکات و پەندی لێوەرنەگرێت، ئەوکەسانە ڕزگاریان نابێت و بە سزای سەخت تۆڵەیان لێوەردەگیرێتەوە» وەك لە هەردوو ئایەتی سورەتی سەجدەدا خوای پەروەردگارمان دەفەرموێت: {**وَلَنُذِيقَنَّهُمْ مِنَ الْعَذَابِ الْأَدْنَى دُونَ الْعَذَابِ الْأَكْبَرِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ * وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنْ ذُكِّرَ بِآيَاتِ رَبِّهِ ثُمَّ أَعْرَضَ عَنْهَا إِنَّا مِنَ الْمُجْرِمِينَ مُنْتَقِمُونَ**} (سورة السجدة: ٢١، ٢٢).

پەتای کۆرۆنا بۆ بڕوادار و مسوڵمانان تاقیکردنەوە و ئیبتیلایە، وەک هەر نەخۆشیی و ناخۆشییەکی تری ژیان سەیری دەکرێت و لە چوارچێوەی قەدەری ئیلاهیدایە و بۆ مسوڵمان دەبێتە خێر و کەفارەتی گوناهو بەرزی پلەوپایە، تەنانەت ئەگەر پێیشی بمرێت پلەیەک لە پلەکانی شەهادەتی پێ دەبڕێت بە قیاس لە سەر تاعوون کە فەرموودەی سەحیحی لەسەر هاتووە، بۆیە پەتای کۆرۆنا و تێکڕای نەخۆشیی و ناخۆشییەکانی ژیانی مرۆڤی باوەڕدار لە چوارچێوەی ئایەتە پیرۆزکانی سورەتی ئەلبەقەرەدا خۆی دەبینێتەوە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ئێمە تاقیتان دەکەینەوە بە کۆمەڵێک شێوازی وەک ترس و برسێتی و کەمی لە ماڵ و نەفس و بەروبومدا، بەڵام تۆ ئەی خۆشەویست(د.خ) مژدە بدە بە خۆڕاگران، ئەوانەی لە تاقیکردنەوەکاندا خۆڕاگردەبن و دەڵێن: ئێمە هەرچیمان هەیە لای خوداوە پێمان دراوە و هەر بۆ حوزوری ئەویش دەگەڕێنەوە، ئەوانە بە ڕاستی میهرەبانی و بەزەیی خودایان لەسەرە و هەر ئەوانیش ڕێنومایی و هیدایەتی ڕاسەقینەیان وەرگرتووە« وەک دەفەرموێت: {وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ بِشَيْءٍ مِنَ الْخَوْفِ وَالْجُوعِ وَنَقْصٍ مِنَ الْأَمْوَالِ وَالْأَنْفُسِ وَالثَّمَرَاتِ وَبَشِّرِ الصَّابِرِينَ * الَّذِينَ إِذَا أَصَابَتْهُمْ مُصِيبَةٌ قَالُوا إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ * أُولَئِكَ عَلَيْهِمْ صَلَوَاتٌ مِنْ رَبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُهْتَدُونَ} (سورة البقرة: ١٥٥ – ١٥٧).

پاشان ئاشکرایە کە ئەم پەتا ترسناکە هەموو جیهانی هەژاندووە و مەترسییەکانی جیهانی ئیسلامیشی بەوپێیە و لەو سۆنگەی کە باسمانکرد گرتوویەتییەوە، بۆیە هەر بە خێرایی زانایانی ئیسلام لە دونیادا و ئەنجومەنی باڵای فەتوایش لە کوردستاندا ـ کە بەندە تەکلیفکراوە بە سەرۆکایەتی کردنی ـ وەک ناوەندێکی فەرمی بەرپرسیار لە کوردستاندا هەر زوو لە سەرەتاکانی پەیدابوونی ڤایرۆسەکەوە لە وڵاتی چینەوە و پاشان گەیشتنی بە ئێران ڕۆڵی زۆر گرنگی بینیوە لە بواری ڕۆشنبیرکردنی خەڵکیدا لەچوارچێوەی دەرکردنی چەندین فەتوای هاوچەرخ و ڕوونکردنەوەی شەرعی وێڕای لێدوان و بڵاوکردنەوی تایبەت و بەستنی ۆرکشۆپ و سیمینار و چاوپێکەتنی هەمەجۆرە لە دەزگاکانی ڕاگەیانی فەرمیی و نافەرمی و سۆشیال میدیا و سایت و پەیجەکانی یەکێتی زانایان لەپێناو ئەوەی کە مسوڵمانانی کوردستان وشیارتر بن و ماف و ئەرکی ئایینی و کۆمەڵایەتی خۆیان باشتر بزان لە مەڕ ئەم پەتایەدا.

بێگومان لە مێژوودا پەتای بەم چەشنە ڕووی نەداوە، کە بەهۆیەوە لە وڵاتانی ئیسلامیدا دەرگای مزگەوتەکان بەداخەوە دابخرێت، تەنانەت بە فەرمی ئەرکی حەج و عەمرە لە دەرەوەی وڵاتی حیجازدا جێبەجێ نەکرێت و جومعە و جەماعەت و نوێژەکانی جەژن ئەنجام نەدرێت. هەربۆیەیش فەتوا لەو هەلومەرجە سەختەدا زۆر ئیحراجیی و سەختی تیادا بوو بۆ ئەنجومەنی باڵای فەتوا کە چۆن فەتواکانی تایبەت بە کۆرۆنا هەم لە ئاستی مەترسی پەتاکەدا بێت و مەقاصیدی شەریعەت کە دووەم گرنگترینان مەبەستی پارێزگاریکردنە

لە خودی مرۆڤەکان، هەم فەتواکان لانەدات لە چوارچێوەی دەقە پیرۆزەکانی شەریعەتی ئیسلام. ئەوە بوو سوپاس بۆ خودا توانیمان لەو ماوەیەی پێشوودا واتە لە ٣ی ئازاری ٢٠٢٠ – ٨ی تشرینی دووەمی ٢٠٢٠ و دواتریش چەندین فەتوای هاوچەرخ و ڕوونکردنەوەی گرنگ دەربکەین و ببینە پێشەنگ بۆ ناوەندەکانی فەتوایش لە جیهانی ئیسلامیدا. پێشتریش بۆ کتێبی (خستنی دەمامکەکان) بەناونیشانی (ڕۆڵی ئەنجومەنی باڵای فەتوا لە کوردستان سەبارەت بە ڕێنومابیە شەرعییەکانی تایبەت بە پەتای کۆرۆنا) ئەوەمان ڕوونکردبوویەوە کە بۆماوەی چەند مانگێکە بەردەوام هەموو جیهان بە تێکڕای ناوەندە تەندروستیی و ئابووریی و ڕامیاریی و ئیداریی و ئاینیی و کۆمەڵایەتییەکانییەوە سەرقاڵی ڕووبەڕووبوونەوەی گەورەترین کێشەی تەندروستین کە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا ڕووی نەداوە ئەویش بریتییە لە کێشەی ڤایرۆسی کوشندەی کۆرۆنا، پاش پەنابردنە بەر نزاو پاڕانەوە لە پەروەردگار کە مرۆڤەکان پارێزراو بکات، تەنها ڕێگا بۆ چارەسەرکردنی جگە لە ڕێگەی (ڤاکسین) بریتییە لە گرتنەبەری ڕێگای خودپارێزیی و پابەندبوونە بە ڕێنماییە تەندروستییەکان.

ئایینی پیرۆزی ئیسلام پێش هەزار و چوارسەد ساڵ پێغەمبەرەکەی (درودی خودای لە سەر) باسی پێویستی خودپارێزی کردووە کە لە چارەسەر باشترە و پێویستە مرۆڤەکان لە نەخۆشییە مەترسیدارە بڵاوکارییە تێپەڕێنەرەکان خۆیان بپارێزن، پاشان تەوەککول و پشت ببەستن بە پەروەردگار(جل جلالە).. بەڵێ هەروەک چۆن تەقواو لەخودا ترسان خۆپارێزییە لە غەزەبی پەروەردگار و سزای دواڕۆژی سەخت، ڕۆژووگرتن خودپارێزییە لە نەکەوتنە ناو گوناە، هەروەها خۆپارێزی لە تووش نەبوون بە نەخۆشییەکان چارەسەری بنەڕەتییە بۆ تووشنەبوون و لە هەموو عیلاج و چارەسەرێک باشترە لە ڕووانگەی ئیسلامەوە.. لە هەندێک فەرمودەدا هاتووە کە عەدوا نییە، بەڵام مەبەست لێی حەقیقەتی عەدوایە بەر لە ئیزن و ئیرادەی خودا و خەلقکردنی بۆ ڤایرۆسەکەیە، کە بێگومان هەموو شتێک بە ئیرادەی خودایە و بە قەزا و قەدەرێکی ئەزەلی زاتی حەق تەعالایە، بەڵام ئەمە شتێکی پەنهانییە و پێویستە مرۆڤ خۆی بپارێزێت بە گرتنەبەری هۆکاری تەندروستی ئەوکات پشت ببەستێت بە پەروەردگاری، وەک لە فەرموودەی دروستی: (**أعقِلْ و توكّل**)دا هاتووە، واتە: وشترەکەت ببەستەرەوە ئەوکات تەوەککول بە خودا ببەستە کە هەڵنەیەت، هەروەک چۆن واجبە خۆت لە سەرما و گەرما بپارێزیت بە هەمان شێوەش واجبە خۆت لەو ڤایرۆسە کوشندەکان بپارێزیت.. هەروەها لە فەرموودەکەی حەزرەتی عومەردا(ڕ.خ) بەرجەستە بووە لەکاتی بڵاو بوونەوەی تاعوونی شامدا کە فەرمووی: (**نَفِرُّ مِنْ قَدَرِ اللهِ إلى قَدَرِ الله**) واتە: هەڵدێین لە قەدەری خودا بۆ قەدەری خودا، لە وەڵامی هاوەڵی پایەدار ئەبو عوبەیدەدا(ڕ.خ) کە پێی فەرموو: (**أَ فِرارًا مِنْ قَدَرِ اللهِ يا أميرَ المؤمنين؟**) ئایا هەڵهاتن هەیە لە قەدەری خودا ئەی فەرمانڕەوای ئیمانداران؟ بەم شێوەیە و بۆ یەکەم جار حیجر و خودپارێزیی و بەستنەوەی تەندوروستی بۆ تێکڕای مرۆڤایەتی ڕاگەیێندرا لە سەر زاری ئەصحابی پێغەمبەرەوە

(د.خ) كه حەزرەتی (عبد الرحمن بن عوف) فەرمووی: بیستومانە لە خۆشەویستەوە (د.خ) كە فەرمویەتی: « إِذَا سَمِعْتُمْ بِهِ فِي أَرْضٍ فَلَا تَقْدَمُوا عَلَيْهِ، وَإِذَا وَقَعَ بِأَرْضٍ وَأَنْتُمْ بِهَا فَلَا تَخْرُجُوا فُرَّارًا فرارا مِنْهُ» واتە: «ئەگەر بیستان بە بڵاوبوونەوەی پەتایە(تاعوون) لە ناوچەیەكدا ئەوا مەڕۆن بۆی، خۆ ئەگەر لە جێگەیەك بوون بڵاوببوویەوە تیایدا ئەوا دەرمەچن لێی بە هەڵهاتن». بڕوانە: (صحیح البخاری بتحقیق البغا: (٥/ ٢١٦٣) برقم(٥٣٩٧) صحیح مسلم: (٧/ ٢٩) برقم(٥٨٣٧).

بەڵێ: (كۆڤید -١٩) زۆرێك لە قیناعە ساختەكانی ئاشكرا كرد.. مسوڵمانی ڕاستی لە ناڕاست جودا كردەوە، مسوڵمانی خێرخواز و ڕاستگۆ و بەبەزەیی لە پیسكە و دڵڕەق و بەخشندە جودا كردەوە.. هەروەها سەركردە و كاربەدەست و لێپرسراوی ڕاستگۆ و میهرەبان و بەخشندەی لە ناڕاست و گەندەڵ و بێ بەزەیی بۆ میللەتەكەی جودا كردەوە لە كوردستان و عێراق و تێكڕای جیهاندا.. پزیشك و سەیدەڵانی مرۆڤدۆستی جودا كردەوە لە نامرۆڤە چاوچنۆكەكان.. مامۆستای زانست دۆست و دیندار و نیشتیمانپەروەر و بە سۆز و میهرەبانی جودا كردەوە كە بە ڕێگای ئۆنلاین نەیانهێشت پرۆسەی خوێندن لە كوردستان پەكی بكەوێت لەوانەی كە قوتابیەكانی خۆیان لە ڕۆژگاری سەختدا ئیهمال كرد.. هەروەها كاسبكار و دوكانداری بە ویژدانی جودا كردەوە لە چاوچنۆكەكان.. ڕۆژگاری كۆرۆنا دۆست و برادەر و خزم و كەسی ڕاستەقینەی لە ناڕاست و ڕووكەش و هەلپەرستەكان جودا كردەوە.. پیاوانی وڵاتپارێزی دڵسۆزی دەستپاكی لە وڵاتفرۆش و گەندەڵكار و ناپاكەكان جوداكردەوە..هەروەها بڕواداری ڕاستەقینەی لە بڕوادارە ڕووكەشییەكان جودا كردەوە..

بۆ ئەو مەبەستەش وەك گوتمان ئەنجومەنی باڵای فەتوا لە كوردستاندا كۆمەڵێك فەتوای هاوچەرخ و هەنووكەیی زۆر گرنگی لەوبارەو لە چەند مانگی ڕابردوودا بڵاوكردەوە بە مەستی وشیاربوونەوەی خەڵكی بەگشتی و مسوڵمانان بەتایبەت لە ئەحكامە شەرعییەكان لە سەردەمی كۆرۆنادا:

## دەقی فەتواكانی ئەنجومەنی باڵای فەتوا تایبەت بە ڕۆژگاری كۆرۆنا:

### فەتوای یەكەم: لە ڕۆژی ٣ /٣/ ٢٠٢٠ تایبەت بە ڕێكارە شەرعییەكانی ئەنجومەنی باڵای فەتوا تایبەت بەخۆپارێزی لە ڤایرۆسی كۆرۆنا:

### بەناوی خوای گەورەو میهرەبان

وەك هەنگاوێك بۆ خۆپاراستن لە بڵاوبوونەوەی نەخۆشی ڤایرۆسی كۆرۆنا (covid ١٩)، ئەنجوومەنی باڵای فەتوای یەكێتی زانایانی ئایینی ئیسلامی كوردستان لە رۆژی سێشەممە ٢٠٢٠/٣/٣ بە ئامادەبوونی سەرجەم ئەندامانی كۆبوویەوە، لە كۆبوونەوەكەدا دوای تاوتوێكردنی هەموو ڕەهەندەكانی نەخۆشییەكەو، لێكۆڵینەوەی وردی دەقە شەرعییەكان و

مەبەستەکانی شەریعەت، ئەنجومەنی باڵای فەتوا بڕیاری لەسەر ئەم خاڵانەی خوارەوە دا:

**یەکەم**: ئەرکێکی شەرعی یە کە هاوڵاتیان بە وردی پابەندی تەواوی ڕێنماییە تەندروستی و ئەمنییەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان بن تایبەت بە خۆپارێزی لە پەتای کۆرونا.

**دووەم**: بە پێی شەرع ناتوانرێت لە ئێستادا وتاری هەینی مزگەوتەکان ڕابگیرێت، تەنیا لەو شوێنانە نەبێت کە بە دڵنیاییەوە نەخۆشییەکەی لێ بڵاوبۆتەوە و دەبێتە (پەتا-وباو) دەکرێت بەشێوەی کاتی تا کۆتاییهاتنی ڤایرۆسەکە بەهەماهەنگی لەگەڵا ئەوقاف و تەندروستی و لێژنەی فەتوای سنورەکە نوێژی بە جەماعەت وتاری هەینی ڕابگرن.

**سێیەم**: کۆبوونەوە ئاینی وکۆمەلایەتیەکانی دیکەی وەک: (ئیسراو میعراج، مەولودخوێندنەوە، ئاهەنگەکانی بووک گواستنەوە، مەڕاسیمی پرسەدانان) بە پێویستیەکی شەرعی دەزانین لەم بارودۆخەدا لە هەموو شوێنێک رابگیرێن، لە پرسەدا تەنیا بەشداری شووشتن و نوێژکردن و ناشتنی تەرمەکان بکرێت، وەلە سەر گورستان کۆتایی بە پرسەکە بهێنرێت.

**چوارەم**: ئەوانەی کە بە فایرۆسی (کۆرونا) گیان لەدەست دەدەن پلەی (شەهید) یان هەیە،وە لایەنی پەیوەندار بەرپرسە لە رێکارەکانی بەخاکسپاردنی بە پێی ئەحکامەکانی شەریعەتی ئیسلام.

**پێنجەم**: ئەو کەسانەی نەخۆشن یان مەترسی توشبوونیان هەیە دەتوانن ئەو ماوەیە تا نەخۆشییەکە دەڕوات بەشداری نوێژی هەینی و جەماعەت نەکەن.

شەشەم: پێویستە سەرجەم چالاکییەکانی تایبەت بە وانەگوتنەوەی ئایینی شەوانەو رۆژانە لە مزگەوتەکان و تەواوی ناوەندەکانی فێرکردنی قورئان و بابەتەکانی ئایینەکانی دیکە لەم قۆناغە هاوشێوەی قوتابخانەکان رابگیرێت.

**حەوتەم**: سەردانی نەخۆش نەکرێت چ لە ماڵەوە یان لە نەخۆشخانە، بە (تەلەفۆن) وەیا بە (نامە) ئەم سوننەتە ئەنجام بدرێت.

هەشتەم: هەموو ئەوانەی لەو وڵاتانە گەڕاونەتەوە کە ڤایرۆسەکەی تێدایە بە تایبەت لە ئێرانەوە، واجبێکی شەرعیە کە بە زووترین کات سەردانی لایەنی پەیوەندیدار بکەن بۆ پشکنین و دڵنیابوونەوە لە نەخۆشییەکەو پاراستنی خۆیان و خێزان و هاوڵاتیان، بە پێچەوانە گوناهبار دەبێت.

**نۆیەم**: هەر کەسێک گومانی ئەم ڤایرۆسە لە خۆی بکات، حەرامە تێکەڵی و سەردانی خەڵک بکات تەنانەت بۆ (جومعە و جەماعەت) تیش بێت، بەڵکو پێویستە بە زووترین کات سەردانی لایەنی پەیوەندیدار بکات.

**دەیەم**: داوا لە وتاربێژە بەڕێزەکان دەکەین لەو ماوەیەدا وتاری هەینی کورت بکەنەوە، هەروەها پاکوخاوێنی مزگەوتەکان زیاتر ڕابگیرێت و، ئامۆژگاری هاوڵاتیان

بکەن دەستنوێژەکانیان لە ماڵەوە ئەنجام بدەن.

لە کۆتاییدا: وێرای نزا و پارانەوەمان کە خوای گەورە هەموو لایەکمان پارێزاراو بکات، دووپاتی دەکەینەوە کە مەبەست لەو ڕێکارە شەرعیانە خۆپاراستنە و ڕێکاری کاتین ، بە پێویستی دەزانین ورەمان بەهێز بێت و پشت بە خوای گەورە ببەستین و تۆبە و ئیستغفاری زیاتر بکەین و هاوکاری یەکتر بین، هەمیشە لە دوعاو پاڕانەوە و خێرو سەدەقەکردن بەردەوام بین.

**یەکێتی زانایانی ئاینی ئیسلامی کوردستان/ ئەنجومەنی باڵای فەتوا**

**٣ ی ئاداری/٢٠٢٠ زاینی – ٨ی ڕەجەبی ١٤٤١ کۆچی/ ١٣ ی ڕەشەمی ٢٧١٩ کوردی**

**فەتوای دووەم: لە ڕۆژی ٢٠٢٠ /٤/٢٣: تایبەت بە مەرجەکانی بە ڕۆژوو نەبوون بەهۆی کۆرۆناوە:**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

قال تعالى: {فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِكْرِ إِنْ كُنْتُمْ لَا تَعْلَمُونَ} (سورة النحل: ٤٣).

الحمد لله والصلاه والسلام على سيدنا رسول الله، وعلى آله وأصحابه والتابعين لهم إلى يوم الدين وبعد:

ئەنجومەنی باڵای فەتو لە هەرێمی کوردستان لە بەرواری ٢٩ ی شەعبانی ١٤٤١ کۆچی بەرامبەر ٢٠٢٠/٤/٢٣ لە کۆبونەوەی ئاسایی خۆیدا- بە ئۆنلاین - بە مەبەستی دیاریکردنی مەرجەکانی بەڕۆژوو نەبوون بەهۆی کۆرۆناوە و چەند بابەتێکی تر، دوای گفتوگۆو گەڕانەوە بۆ سەرچاوەکانی فیقهی ئیسلامی ئەنجومەن گەیشتە ئەم فەتوایە ی لای خوارەوە:

١. دروست نییە بەڕۆژوو نەبوون بەهۆی ترسان لە کۆرۆناوە، چونکە لە ڕووی تەندروستیشەوە دەرکەوتووە کە ڕۆژوو بە شێوەیەکی گشتی بەرگری لەش زیاد دەکات.

٢. هەر هاوڵاتییەک توشی ڤایرۆسی کۆرۆنا بوو‌بێت دروستە بۆی بە ڕۆژو نەبێت، بەم دوو مەرجەی لای خوارەوە:

یەکەم: نەخۆشیەکە پشتڕاست کرابێتەوە لای پزیشکانی پسپۆڕ.

دووەم: پزیشکی پسپۆڕ رایبگەیێنێت کە توشبووەکە بە هۆی ڕۆژوو گرتنیەوە تەندروستی خراپتر دەبێت، یان ڕۆژووەکە دەبێتە هۆی درنگ چابوونەوەی.

تێبینی: بەڵام پاش چاکبوونەوەی واجبە قەزای تەواوی ئەو ڕۆژانە بکاتەوە کە نەیگرتوون.

**وصلى الله على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين.**

**ئەنجومەنی باڵای فەتوا لە هەرێمی کوردستان**

**٢٩ ی شەعبانی ١٤٤١ هـ = ٢٠٢٠/٤/٢٣م = ٣ی بانەمەڕ ٢٧٢٠ک**

**فەتوای سێیەم: لە ڕۆژی ٢٠٢٠/٦/١٦، چەند ڕێنومایییەکی ئەنجومەنی باڵای فەتوا تایبەت بە ڕێکارە شەرعیییەکانی لێکدووری نوێژخوێنان و خۆپارێز و هەندێ ئامۆژگاری شەرعی دیکە تایبەت بە پەتای کۆرۆنا:**



بسم الله الرحمن الرحيم

یەکێتی زانایانی ئایینی ئیسلامی کوردستان | إتحاد علماء الدين الإسلامي في كوردستان

مەکتەبی تەنفیزی | المكتب التنفيذي

ئەنجومەنی باڵای فەتوا | المجلس الأعلى للإفتاء

ژمارە / ١٩٠ — بەروار: ١٦/ ٦/ ٢٠٢٠

(( ڕۆنکردنەوەیەك لە ئەنجومەنی باڵای فەتوای هەرێمی کوردستان ))

ئەنجومەنی باڵای فەتوا لە دانیشتنی ئاسایی خۆیداو بە رەچاوکردنی رێنومایيە تەندروستییەکان لە بەرواری١٧/شەوالی/١٤٤١ - ٢٠٢٠/٦/١٠ چەند بابەتی ئاینی پەیوەست بە بارودۆخی ئێستای کۆرۆنا تاوتوێ کرد، و بۆ بەرچاو روونی موسڵمانانی هەرێمی کوردستان ئەم ڕوونکردەوەیە ڕادەگەینێ:

١. داوا لە موسوڵمانان دەکەین بە تایبەتی ئەوانەی هاموشۆی مزگەوتەکان دەکەن بۆ ئەنجامدانی جومعەو جەماعەت لەم کات و ساتەدا کە شەپۆلێکی دیکەی بەهێزی پەتای کۆرۆنا گەڕاوەتەوە وەك واجبێکی شەرعی گرنگ بڕوانن بۆ پرسی پابەندبوون بە ڕێنمایيە تەندرووستییەکان ، وەك ئەرکێکی ئایینی ومرۆیی و نیشتیمانی مامەڵەی لەگەڵدا بکەن، چونکە پارێزگاری کردن لە نەفس یەکێکە لە مەبەستە باڵاکانی شەریعەتی ئیسلام کە هەرێمی کوردستان پێی پابەندە.

٢. لەڕووی شەرعییەوە دروستە کە نوێژخوێنان لە دووری یەك ڕابووەستن لە کاتی ئەنجامدانی نوێژی جەماعەت ونوێژی هەینی، و هیچ لە پاداشتی نوێژی جەماعەتیان لێ کەم نابێتەوە، بەڵکو تەنها مەگەر پاداشتی بەیەکەوە نوساندنی قاچ و شانیان لە صەفی جەماعەتدا لە دەست بچێت- کە سوننەتێکی نوێژی جەماعەتە – بەڵام چونکە نوێژخوێنان مەعزورن پاداشتی ئەوەیشیان - بە ئومێدی خودا- هەر نافەوتێت بە پێی بەڵگە شەرعییەکان کە لە سەرچاوە فیقهیەکاندا هاتووە[1].

٣. داوا لە هاوڵاتیان دەکەین تا دەتوانن لە ماڵەکانیان بمێننەوە بۆ کاری پێویست نەبێت لەماڵەکانیان نەچنە دەرەوە .

٤. هەر کەسێك نیشانەکانی کۆرۆنای لێ دەرکەوت واجبێکی شەرعییە کە نەچێتە مزگەوت و جێگە قەرەباڵغەکانی تر و خۆی لە تێکەڵاوی بپارێزێت و خۆی کەرەنتینە بکات.

٥. ئەگەر کەسێك نەخۆشی درێژ خایەنی هەبێت و ترسێکی ڕاستەقینەی هەبێت(الخوف المحقق) لەوەی کە توشی پەتای کۆرۆنا ببێت دەتوانێت نەچێتە مزگەوت بۆ بەجێگەیاندنی ئەرك و عیبادەتەکان.

خوای میهرەبان هەموولایەن پارێزراو بفەرموێت،

والله تعالى أعلم.. وصلى الله على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين

ئەنجومەنی باڵای فەتوا لە هەرێمی کوردستان

١٧/شەووالی/١٤٤١ ﻫ = ٢٠٢٠/٦/١٠ م = ١٩خەرمانانی٢٧٢٠ ك

(١) المجموع ٣٠١/٤، إحكام الأحكام شرح عمدة الأحكام ١/ ٢١٧ فتح العلى بجمع الخلاف بين ابن حجر وابن الرملى (ص٦٢١)، شرح المقدمه الحضرمية المسمى بشرى الكريم بشرح مسائل التعليم (ص: ٣٦٢)، طرح التثريب ٣٢٥/٢.

ناونیشان : هەرێمی کوردستان – هەولێر (٦٠مەتری) بەرامبەر پەرلەمانی کوردستان

www. zanayan.org

email :mektebzanayan@gmail.com

## فەتوای چوارەم: لە ڕۆژی ٦/٢١ /٢٠٢٠، تایبەت بە حوکمی شەرعی بەخشینی پلازمای خوێن بۆ توشبووانی کۆرۆنا:

الحمدلله والصلاة والسلام على رسول الله وآله وصحبه ومن والاه وبعد:

ئەنجومەنی باڵای فەتوا بەخشینی پلازمای خوێنی پێ کارێکە پەسەندو چاکەخوازییە، کە کەسی چاکبوو لە ڤایرۆسی کۆرۆنا پلازمای خوێنی خۆی ببەخشێت بەو کەسانەی کە دووچاری ڤایرۆسەکە بوون بە مەبەستی چارەسەر وەرگرتن، بەڵام بە سێ مەرج:

یەکەمیان: مامەڵەی پێوە نەکرێت و لە بەرانبەریدا پارە وەرنەگیرێت، چونکە ئەو پارەیە حەرامە.

دووەم : پێویستە کارێکی خۆبەخشی بێت دوور بێت لە ئیحراجی و فشار و (غصب الحیاء).

سێهەم: پێویستە بە پێی راپۆرتی پزیشکی و لە ژێر چاودێری پزیشکیدا ئەو کارە ئەنجام بدرێت و کاردانەوەی خراپی نەبێت بۆ کەسی بەخشەرەکە، واتە موزاعەفاتی لاوکی نەبێت وەک کەم بوونەوەی بەرگری لەش.

بەم سێ مەرجە دروستە بەخشینی پلازمای خوێن بە خەڵکێک کە دوچاری ڤایرۆسی کۆرۆنا بوون، بەڵکو خێرێکی زۆر گەورەیشە، دەبێتە هۆی رزگاری مرۆڤەکان لە مردن، خودایش فەرمویەتی» هەرکەسێک مرۆڤێک رزگار بکات لەمردن وەک ئەوە وایە کە تێکرای مرۆڤەکانی رزگار کردبێت» وەک دەفەرموێت: (ومن أحیاها فکأنما أحیا الناس جمیعا)(سورة المائدة/ ٣٢).

**والله تعالى اعلم**
**وصلى الله على سيدنا محمد وآله وصحبه اجمعين**
**ئەنجومەنی باڵای فەتوا لە هەرێمی کوردستان**
**٢٩ شوال ١٤٤١ک، ٢١/٦/٢٠٢٠م**

**فەتوای پێنجەم: دوای ئەوەی کە ئەنجومەنی باڵای فەتوا بۆی روونبوویەوە کە هەندێک پزیشک و نۆرینگە و نەخۆشخانە و تاقیگە و دەرمانخانە (بەپێچەواتنەی حاڵەتی گشتی کەرتی تەندروستییەوە) لە هەوڵی لە خشتەبردنی نەخۆشەکاندان لەم بارودۆخە سەختەدا، بۆیە بە پێویستی زانی فەتوایەکی تایبەت بەو بابەتانەوە بە درێژی لە چوار لاپەڕەدا دەربکات بەناونیشانی: (لە خشتەبردنی نەخۆش لە لایەن هەندێک پزیشک و نۆرینگە و نەخۆشخانەی تایبەت و تاقیگە و دەرمانخانەکانەوە): لە ١٩/٨/ ٢٠٢٠ بە ژمارەی (٣٧٠):**

فەتوای تایبەت بە: (لە خشتەبردنی نەخۆش لە لایەن هەندێک پزیشک و نۆرینگەو نەخۆشخانەی تایبەت و تاقیگەو دەرمانخانەکانەوە)

قال تعالى: { فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِنْ كُنْتُمْ لَا تَعْلَمُونَ } (سورة النحل: ٤٣)

الحمد لله، والصلاة والسلام على سيدنا محمد رسول الله، وعلى آله وصحبه ومن والاه وبعد:

دوای ئەوەی کە کۆمەڵێکی زۆر لە هاوڵاتیان پرسیاری گازندە ئامێزییان ئاڕاستەی ئەنجومەنی باڵای فەتوا کرد سەبارەت بە گۆڕانی کاری بەشێک لە پزیشک و نۆرینگە و دەرمانخانە و نەخۆشخانە تایبەتەکان لە کاری مرۆڤدۆستی و خزمەتگوزاری و دڵسۆزی بۆ نەخۆشەکان، بۆ کاری بازرگانی و چاوچنۆکی و لەخشتەبردن، بە شێوازێک کە کەسی نەخۆش بە پێی پێویست و دروست خزمەت ناکرێت، بەڵکو زۆرجار نەخۆشەکە چەندین

جۆری تیشک یان پشکنینی گرانبەهای بۆ دەنوسرێت، یان ئاراستە دەکرێت کە تەنها لە فلانە دەرمانخانە دەرمانەکان وەربگرێت، یان تەنها لە فلان تاقیگە پشکنینەکانی ئەنجام بدات، یان پێویستی بە هەندێک دەرمان نییە و بۆی دەنوسرێت، کە جاری وا هەیە – وەک پسپۆڕانی ئەو بوارە لە توێژینەوەکانیاندا باسیان کردووە – هەندێک لە دەرمانەکان پێچەوانە یەکتری کاردەکەن، و لێکەوتە وکاریگەری زۆر خراپی دەبێت.

ئەنجومەنی باڵای فەتوا لە دانیشتنی ئاسایی خۆیدا لە: (٧ ذو الحجة ١٤٤١کۆچی = ٢٠٢٠/٧/٢٨ز)، پاش بەدواداچونی کەیسەکە و گوێگرتنی لە چەندین پسپۆڕو شاهێدحاڵ، کە سکالایان لە و بارەوە هەبووە: بە پێویستی زانی ئەم فەتوایەی لای خوارەوە بدات:

١. هەر پشکنینێک یان دەرمان نوسینێک بە پێچەوانەی یاساکانی تایبەت بە کاری پیرۆزی پزیشکی و ڕێنماییە تەندروستییەکان بێت: حەرامە و دەچێتە چوارچێوەی هەوڵی زیانگەیاندن، کە هەندێک جار دەبێتە هۆکاری کوشتنی بەناحەق . قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: (مَن قَتَلَ نَفسَا بِغَيرِ نَفسٍ أَو فَسَاد فِي ٱلأَرضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ ٱلنَّاسَ جَمِيعا وَمَن أَحيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحيَا ٱلنَّاسَ جَمِيعا وَلَقَد جَاءَتهُم رُسُلُنَا بِٱلبَيِّنَٰتِ ثُمَّ إِنَّ كَثِيرا مِّنهُم بَعدَ ذَٰلِكَ فِي ٱلأَرضِ لَمُسرِفُون) (سورة المائدة ٣٢). واتە: هەرکەسێک ڕاستەوخۆ کەسێکی بێتاوان بکوژێت، یان ناڕاستەوخۆ هۆکار بێت بۆ کوشتنی ، یان فەساد لە کۆمەڵگادا بڵاوبکاتەوە و کاری تێکدەرانە ئەنجام بدات و زەرەر بگەیێنێتە مرۆڤەکان ئەوە تاوانێکی زۆر گەورەی ئەنجام داوە، چونکە وەک ئەوە وایە کە هەموو مرۆڤەکانی کوشتبێت، چونکە دەستدرێژی کردنە سەریەک مرۆڤ دەستدرێژی کردنە بۆ سەر هەموو مرۆڤایەتی کە خودا خولقاندویەتی، بە پێچەوانەیشیەوە ئەگەر مرۆڤێکی پاراست یان ڕزگاری کرد، چاکایەکی ئەوەندە گەورەی کردووە لای خودا، وەک ئەوە وایە کە هەموو مرۆڤایەتی زیندوو کردبێتەوە ڕزگاری کردبێت.

٢- هەر دەرمانێک لە ئەندازەی زیاد لە پێویست بنوسرێت لە ڕەچەتەی پزیشکیدا: تاوانە و کارێکی حەرامە و لەسەر پزیشکی موسوڵمان و مروڤدۆست پێویستە خۆی لێ بپارێزێت. چونکە ڕاستەوخۆ ئیستیغلال کردن و بەتاڵان بردنی ماڵی موسەڵمانانە ئەمەش لە شەریعەتی پیرۆزی ئیسلامدا حەرامە. وەک قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُم بَيْنَكُم بِالْبَاطِلِ إِلَّا أَن تَكُونَ تِجَارَةً عَن تَرَاضٍ مِّنكُمْ) تَرَاضٍ} (سورة النساء: ٢٩)، هەروەها پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) دةفةرمويت: «لا يحل مال امرئ مسلم إلا بطيب نفس منه» (رواه الإمام أحمد فی مسنده). واتە: «ماڵی هیچ موسوڵمانێک بەوی دیکە حەڵاڵ نییە مەگەر بەخواهیشت و لە دڵەوە بیبەخشێت». هەروەها دەبێتە هۆی گەیاندنی زەرەری جەستەیی بە نەخۆشەکان و بە پێی قاعیدەی شەرعی ئەو پزیشکە (ضامن) و بەرپرسیار دەبێت.

٣. هەر دەرمانێک لە دەرمانخانەکان بدرێت بە نەخۆش، بەبێ ڕێنمایی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆی پزیشکی پسپۆڕ یان یاریدەدەری پزیشکی ڕێگەپێدراو : ئەوا لە ڕوانگەی شەریعەتەوە دروست نییەو حەرامە، هەروەک چۆن لە ڕووی یاسایشەوە قەدەغەیە. چونکە لە شەریعەتی ئیسلامدا هەرشتێک ببێتە هۆی زەرەر گەیاندن بەخود یان بەکەسی بەرامبەر  ئەوە حەرامە، وەک حەزرەتی پێغەمبەرمان ( درودی خوای لەسەر بێت ) فەرمویەتی : «لا ضرر ولا ضرار»، (رواه ابن ماجة والدار قطني وغيرهما عن بي سعيد الخدري (رضي الله عنه) ورواه الامام مالک في الموطأ عن عمرو بن يحيى عن بيه (رضي الله عنه) وله طرق متعددة). واتە: «نە لە سەرەتاوە زەرەر بە گەس بگەیێنەو نە کەسیش زەرەرت پێ بگەیێنێت یان زەرەر بە یەکتر بگەیێنن» ، لەسەر بنەمای ئەو فەرمودەیەش یاسایەکی گشتی و سەرەکی لە ئیسلامدا دامەزراوە کە لای زانایان بە تایبەت شافیعییەکان یەکێکە لە پێنج بنەما فیقهیە گەورەکان کە بریتییە لە یاساو بنەمای فیقهیی (الضررُ يُزالُ): واتە:» هەموو جۆرە زەرەرو ستەمێک پێویستە دەمەو دەست لاببرێت لەسەر ستەملێکراو زەرەر لێدراو».

٤- هەر دەرمانێک بەرواری بەسەرچوبێت، یان لە کوالێتی کۆنترۆڵ دەرنەچوبێت ، ئەوە حەرامە بدرێت بە نەخۆش یان مامەڵەی پێوە بکرێت ، یان دەربازی سنورەکان بکرێت ، بە هەمان بەڵگەکانی سەرەوە.

٥- گران کردنی نرخی پشکنین و دەرمانەکان لەسەر نەخۆش : کارێکی ناشەرعیی و قیزەونە، بەڵکو پێویستە پێچەوانەکەی ئەنجام بدرێت و، نرخەکان کەم بکرێنەوەو یارمەتیدانی هەژاران بدرێت، بە تایبەت لەم هەل و مەرجە سەختەی ئێستای کوردستاندا، ئەمەیش بە پێی ڕێنمایی ئایەتی پیرۆزی: {وَتَعَاوَنُوا عَلَى ٱلبِرِّ وَٱلتَّقوَىٰ وَلَا تَعَاوَنُوا عَلَى ٱلإِثمِ وَٱلعُدوَانِوَٱتَّقُوا ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلعِقَابِ}، (سورة المائدة: ٢). واتە:» پێویستە بەردەوام هاوکاری یەکتر بکەن لەسەر چاکە و کاری باش و خوداناسی ، هاوکاری یەک مەکەن لەسەر خراپە و تاوان و دەستدرێژی، لەخودا بترسن و ڕێنماییەکانی جێبەجێ بکەن، چونکە سزای خودا لە پاشەڕۆژدا زۆر سەختە».

٦. هەرجۆرە ڕێکەوتنێک لە نێوان پزیشک و دەرمانخانەو تاقیگەکاندا لە سەر حیسابی نەخۆشەکان ئەنجامبدرێت کارێکی حەرامەو خواردنی ماڵی موسڵمانانە بە تاڵان، کە بە داخەوە ئەو دیاردەیەش بوونی هەیەو پێویستە پزیشک و دەرمانسازان و خاوەنی تاقیگەکان خۆیان لەو حەرامە بپارێزن و لە خودا بترسن.

٧. هەرکەسێک پسپۆڕ نەبێت لەو بواری پزیشکی و دەرمانسازیدا حەرامە خۆی بکات

بە پزیشک و دەرمانساز، بەو پێیەیش تاوانبارو (ضامن) دەبێت لە هەر کاردانەوەیەکی خراپ، ڕاستەوخۆ زەرەر بگەیێنێت بە نەخۆشەکە یان بە سیرایەت، وەک پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمویەتی: «من تطبب ولم يكن بالطب معروفا فأصاب نفسا فما دونها، فهو ضامن» (أخرجه الدارقطني وأبو داود والنسائي وغيرهما وصححه الحاكم عن عمرو بن شعيب عن أبيه عن جده (رضي الله عنهم) ئەمەیش مەسئەلەیەکە لە لای تێکڕای زانایانی فیقهی ئیسلامی کۆ دەنگی لە سەرە. بڕوانە: الاستذكار الجامع لمذاهب فقهاء الأمصار لابن عبد البر القرطبي المالكي: (٢٥/٥٥)، وبلوغ المرام للحافظ العسقلاني الشافعي مع سبل السلام: (٣٦٣/٢). المفاتيح في شرح المصابيح لمظهر الدين الحنفي: (٤/ ٢١٧).

لە کۆتاییدا ئەم خاڵانە بە گرنگ دەزانین وەک ئامۆژگاری و داخوازی:

یەکەم: داخوازین لە دەزگا پەیوەندارەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان بە تایبەت وەزارەتەکانی تەندروستی و ناوخۆ، بە دواداچون و لێپرسینەوەی جدی بکەن لەو پرسە گرینگە، کە سەرتاسەری هاوڵاتیانی ئەم هەرێمەی گرتۆتەوە بە شێوازێک لە شێوازەکان لێی زەرەرمەند بوون.

دووەم: ئەرکی سەرشانی حوکمەتە گرینگی تەواو بدات بە نەخۆشخانە گشتییەکانی، لەهەردوو ڕووی کەرستە و پێداویستی پزیشکی و ستافەکان، لەسەرتاسەری کوردستان بەبێ جیاوازی ، لە پێناو ئەوەی کە هاوڵاتیان مەجبور نەبن بەو لێشاوە پەنابەرنە بەر نەخۆشخانە ئەهلی و دەرمانخانەو نۆرینگەکانیان، لەوێش لەلایەن هەندێک نەفس نزم و فرسەتوەرگر و چاوچنۆکەوە لەخشتە ببرێن و ستەمیان لێبکرێت. چونکە بە داخەوە لە ئێستادا جیاوازییەکی زۆر بەدیدەکرێت لە خزمەتگوزارییەکاندا لە نێوان کەرتی حوکمەت و کەرتی تایبەت ئەوەیش مایەی دڵگرانییە و پێویستی بە چارەسەری هەنوکەیی هەیە.

سێیەم: داخوازین لە دەزگاکانی ڕاگەیاندن ڕۆڵی گرنگی خۆیان ببینن لەهەمبەر ئەم پرسە و هاوشێوەکانی لە پێناو قەڵاچۆکردنی ئەو دیاردە خراپانەی کە قەیرانی ماڵی و گیانی بۆ هاوڵاتیان دروستکردووە.

چوارەم: ئەرکی پەرلەمانە بە تەشریعکردنی یاسای تایبەت بە تەجریمکردنی هەموو جۆرە ئیستیغلال و لەخشتەبردنێک بە تایبەت لە کەرتی پزیشکیداو ئەرکی حوکمەتیشە بە جێبەجێکردنی، لە پێناو ئاسودەیی خەڵک و بەرجەستەبوونی دادوەری کۆمەڵایەتیدا و نەهێشتنی ئەم دیاردەیەدا، چونکە ئەویش ستەمە و ستەمیش پێویستە ئەنجام نەدرێت بە تایبەت لە ژێر پەردەی کارێکی مرۆڤدۆستی پیرۆزی وەک پزیشکیدا ، خۆشەویستمان (درودی خوای لەسەربێت) فەرمویەتی: « موسوڵمان برای موسوڵمانە، ستەمی لێناکات،

خیانەتی لێناکات، سەری دەخات لەکاتی تەنگانەدا «وەک دەفەرمویت : «المسلم أخو المسلم، لا يظلمه ولا يسلمه ولا يخذله».(متفق عليه عن عبد الله بن عمر (رضى الله عنهما).

پێنجەم: داواکاریشین لە هاولاتیان چاوکراوەبن و نەچنە ژێر کاریگەری چاوچنۆکانەوە و بۆ هەر نەخۆشییەکی ئاسایی وسادە پەنا بۆ نۆرینگە و نەخۆشخانەکان نەبەن ، وە زیاتر خۆپارێزی بکەن تا وەرگرتنی چارەسەر.

شەشەم: ئەگەرچی لە ئێستادا حکومەت فشاری دابەزاندنی نرخەکانی خستووەتە سەر نەخۆشخانە ئەهلییەکان، بەلاَم هێشتا ئەو نرخانەی کە دیاری کراون لە توانای هاولاتیاندا نییە و پێویستە نرخەکان زۆر گونجاوتر بێت لە گەڵ ئاستی دەرامەتی زۆر نزمی ئەمڕۆی هاونیشتیمانیانی هەرێمدا.

(خوای گەورە هاوکاری دڵسۆزانە)

**وصلى الله تعالى على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين**
**ئەنجومەنی باڵای فەتوا لە کوردستان/ هەولێری پایتەخت**
**٧ ذو الحجة ١٤٤١کۆچی = ٢٨ تەموز ی ٢٠٢٠ز = ٦ خەرمانانی ٢٧٢٠ک**

شایەنی باسە ئەم ماوەیە بە درێژایی ساڵ ئێمە چ وەک مەکتەبی تەنفیزی یەکێتی زانایان چ وەک ئەنجومەنی باڵای فەتوا لە هەرێمی کوردستان لە تەک وەزارەتی تەندروستی و لایەنە پەیوەندارەکاندا لەسەر هێڵ بووین بەمەبەستی هەماهەنگی و لێکتێگەیشتن لەلایەک و ئیلزامی وەزارەت و ستافەکانی لە سەرتاسەری بەڕێوەبەرایەت گشتییەکانی لە هەرێمی کوردستان لەلایەکی تر بە پابەندبوونمان بە ڕێنومایی و فەتواکانی ئەنجومەن کە هەڵقوڵاوی شەریعەتی پیرۆزی ئیسلامە، بەلاَم بەداخەوە پاش ئەوەی کە هەستمانکرد کە لە هەندێ ناوچەکانی هەرێمی کوردستاندا ستافەکانی تایبەت بە ئەسپەردەکردنی مردووانی کۆرۆنا پابەند نین بە فەتوای تایبەتی ئەنجومەن بەتایبەت لەو ڕووەوە کە پێویستە شۆردن و کفنکردن و شاردنەوەی مردووان لە گۆڕستانی گشتی مسوڵمانانیدا، هەربۆیەش لە ڕێکەوتی ٢٠٢٠/٧/١٣ بەپێی ڕاسپارەدی ئەنجومەنی باڵا بەڕێز مەکتەبی تەنفیزی یەکێتی زانایان نوسراوی فەرمی جەختکردنەوەی بە ژمارە(٢٢٣) کرد بۆ بەڕێز وەزارەتی تەندروستی لەمەڕ پابەندبوونیان بە تێکڕای ئەو ڕێکارە شەرعییانەوە کە لە چوار خاڵدا خۆی دەبینییەوە کە ئەمەی لای خوارەوە دەقی نوسراوەکەیە:



یەکێتی زانایانی ئاینی ئیسلامی کوردستان
مەکتەبی تەنفیزی
ئەنجومەنی باڵای فەتوا

إتحاد علماء الدين الإسلامي في كوردستان
المكتب التنفيذي
المجلس الأعلى للإفتاء

بسم الله الرحمن الرحيم

ژمارە / ٧٣٢ بەروار / ١٣ / ٧ / ٢٠٢٠

بۆ/ وەزارەتی تەندروستی – نوسینگەی جەنابی وەزیر
بابەت / جەختکردنەوە

لە سەر ڕاسپاردەی ئەنجومەنی باڵای فەتوا جەخت دەکەینەوە کە فەرمان بفەرموون بە تیمە تەندروستیەکان کە بە پێی ڕێکارە تەندروستیەکان ئەرکەکانی ئاینی ئیسلام بەرامبەر بە کۆچکردوان بە ڤایرۆسی کۆرۆنا ئەنجام بدەن، چونکە ژمارەیەك لە وارسانی کۆچکردوان بە ڤایرۆسی کۆرۆنا و هاوڵاتیانیش دووچاری دوودڵی بوونە لەوەی کەوا زانراوە کە کۆچکردوان بە ڤایرۆسی کۆرۆنا ئەرکەکانی ئاینی یان بۆ ئەنجام نادرێت، وە ئەنجومەنی باڵای فەتوای هەرێمی کوردستان لە فەتواکەیان لە ٢٠٢٠/٣/٣ داوایان کرد کە پێویستە بە پێی شەریعەتی ئیسلام هەڵسوکەوت لەگەڵ کۆچکردوان بە ڤایرۆسی کورۆنا بکرێت،بۆیە جەخت دەکەینەوە لە:

١– نیەت هێنانی شۆردنی مردوو لە لایەن کەسی ڕاسپێردراو بە شۆردنی مردووەکە.
٢– دڵنیابوون لەوەی کە ئاوی پاك بە سەر هەموو لاشەی مردووەکە بکرێت ، ئەگەر بە ڕشاندیش بێت لە دوورەوە بەڵام گرنگە ئاوەکە پاك بێت.
٣– دڵنیابوون لە پاکی ئەو پۆشاکەی کە لە بری ( کەفن) بەکار دێت.
٤– ئەنجامدانی نوێژی مردوو لە سەر مردووەکە لایەن کەسێکی شارەزا.

ئەمانەی کە ئاماژەیان پێکراوە لە شەریعەتی ئیسلامدا پێویستە بۆ مردوو لە حاڵەتی ئاساییی ئەنجام بدرێت، وە لە بەر ئەوەی تیمە تەندروستیەکانی ئایەت بە شاردنەوەی کۆچکردوان ڕاچاوی تەواوی خۆپارێزی دەکەن دەتوانن بەم چوار خاڵە شەرعیە پابەند بن بۆ ئەوەی هاوڵاتیانمان دڵنیا بن لە ناشتنی ئازیزانیان بە پێی ڕێکارەکانی ئاینی ئیسلام
... لەگەڵ ئەوپەری ڕێزمان

مەکتەبی تەنفیزی
یەکێتی زانایانی ئاینی ئیسلامی کوردستان

وێنە بۆ/
– سەرجەم لقەکانی یەکێتی زانایانی ئاینی ئیسلامی کوردستان ... بۆ ئاگادارییان ...
– ئەنجومەنی باڵای فەتوا ... لەگەڵ بەراییەکان.
– کارگێری .
– پەیوەندیەکان .

ناونیشان: هەولێر (٦٠مەتری) بەرامبەر پەرلەمانی کوردستان
www.zanayan.org

بە سوپاسەوە وەزارەتی تەندروستیش بە هەمان خاڵەکان کە ئێمە داوامان کردبوون گشتاندنی کرد لە بە ژمارە(٧٥٥١) لە ڕێکەوتی ٢٠٢٠/١١/٨ بۆ سەرجەم بەڕێوەبەرایەتییەکانی خۆی کە پابەندبن بە تێکڕای خاڵەکان کە لە نوسراوی ئێمەدا هاتبوون، ئەگەرچی کەمێک درەنگیش وەڵامیان داینەوە کە نزیکەی مانگێکی پێ چوو، بەڵام هەر جێگەی سوپاسە، کە ئەمەی لای خوارەوە دەقی نوسراوەکەیانە:

ماوەتەوە بڵێن: کە ئەو فەتوا و ڕێنومایيانە بێگومان کاتين و پەيوەستن بە هەلومەرجی تايبەت بە بوونی ئەو ڤايرۆسە کوشندەوە، بۆيە بە کەمبوونەوەی يان نەمانی بێگومان هەندێک لە فەتواکانمان گۆڕان بەسەريياندا دێت بەپێی بنەمای فيقهی: (**تتغيَّرُ الأحكام بتغير الأحوال والأزمان**) کە لای هەندێک لە زانايان کارپێکراوە.



هەرێمی کوردستان - عیراق
ئەنجومەنی وەزیران
وەزارەتی تەندروستی
بەڕێوەبەرایەتی گشتی کاروباری تەندروستی

إقليم كوردستان - العراق
مجلس الوزراء
وزارة الصحة
المديرية العامة للأمور الصحية

Kurdistan Region - Iraq
Council of Ministers
Ministry of Health

ژمارە: ٧٥٥١
ڕێکەوت: / / ٢٧٢٠ کوردی

No:
Date: ١١ / ٨ /٢٠٢٠

حکومەتی هەرێمی کوردستان — دەرکردە — وەزارەتی تەندروستی

( پێشمەرگە سومبولی لەتەوەیی و پارێزەری کوردستانە )

**بۆ/ بەڕێوەبەرایەتی گشتی تەندروستی/ هەولێر/ سلێمانی/ دهۆک/ هەڵەبجە/ ڕاپەرین/ گەرمیان/ کۆیە**

**بابەت/ گشتاندن**

ئاماژە بە نووسراوی یەکێتی زانایانی کوردستان/ مەکتەبی تەنفیزی/ ئەنجوومەنی باڵای فەتوا ژمارە ٢٣٣ لە ٢٠٢٠/٧/١٣
ئاماژە بە نوسراوی وەزارەتی تەندروستی و ژینگەی عێراقی فیدراڵ/ فەرمانگەی تەندروستی گشتی ژمارە ٣٩٦ لە ٢٠٢٠/٧/٢٦
جەخت دەکەینەوە لەسەر پابەندبوونی تەواو بە ڕێکارەکانی ناشتنی مردووانی ڤایرۆسی کۆرۆنا کە لەڕێنمایی هاوپێچدا هاتووە وە بە ڕەچاوکردنی ناشتنیان لەسەر شێوازی ئاینی ئیسلامی پیرۆز کە لەم خاڵانەی خوارەوە هاتووە:

1. نیەت هێنانی شووشتنی مردوو لەلایەن کەسی ڕاسپێردراو بەشووشتنی مردووەکە.
2. دڵنیابوون لەوەی کە ئاوی پاک بەسەر هەموو لاشەی مردووەکە دابکرێت، ئەگەر بەڕشاندنیش بێت لە دورەوە بەڵام گرنگە ئاوەکە پاک بێت.
3. دڵنیابوون لە پاکی ئەو پۆشاکەی کە لەبری کفن بەکاردێت.
4. ئەنجامدانی نوێژی مردوو لەسەر مردووەکە لەلایەن کەسێکی شارەزا.

- هیچ ڕێگرێکی زانستی نیە بۆ ناشتنی مردووەکە بە ڕێگاکانی کارپێکراو بۆ ناشتنی مردوو بە نەخۆشیەکانی تر لە لایەنی قوڵی قەبرەکەوە، وە دەکرێت مردووەکە لە هەر گۆڕستانێک بنێژرێت کە کەس و کاری مردووەکە دیاری دەکەن.

لەگەڵ ڕێزدا...

هاوپێچ/
- نووسراوی یەکێتی زانایانی کوردستان/ مەکتەبی تەنفیزی/ ئەنجوومەنی باڵای فەتوا ژمارە ٢٣٣ لە ٢٠٢٠/٧/١٣.
- نوسراوی وەزارەتی تەندروستی و ژینگەی عێراقی فیدراڵ/ فەرمانگەی تەندروستی گشتی/ ژمارە ٣٩٦ لە ٢٠٢٠/٧/٢٦
- ڕێنماییەکانی ناشتنی مردووانی ڤایرۆسی کۆرۆنا.

د. سامان حسین بەرزنجی
وەزیری تەندروستی
٢٠٢٠/٨/١٠

وێنەیەک بۆ:
- نووسینگەی بەڕێز جەنابی وەزیری تەندروستی/ بۆزانین لەگەڵ ڕێزدا
- یەکێتی زانایانی کوردستان/ مەکتەبی تەنفیزی/ ئەنجوومەنی باڵای فەتوا/ بۆزانین لەگەڵ ڕێزدا
- دەستەی پاراستن و چاکردنی ژینگەی کوردستان/فەرمانگەی کاروباری هونەری/ب. ژینگەی شارستانی بۆ زانین
- بەڕێوەبەری گشتی کاروباری تەندروستی/ بەڕێوەبەری پاراستنی تەندروستی و سەلامەتی خۆراک/ بۆزانین لەگەڵ ڕێزدا
- بەشی کۆنترۆڵکردنی پیس بوون لە دەزگا تەندروستیەکان لەگەڵ بەراییەکان
- خولاو

هەرێمی کوردستان - هەولێر / جوار ڕیانی جاهید
تەلەفۆن: ٠٦٦٢٢٣٨٠١٤ — ٠٦٦٢٢٣٨٠١٥
www.moh-krg.org
E-Mail: it_dep_moh@yahoo.com
Kurdistan Region - Erbil / Jahid Int.
Phone: 066 223 8014 - 066 223 8015



**پ. ی. د.حسێن محەمەد ئیبراهیم**

- پسپۆڕ لە بنەماکانی فیقە لە شەریعەی ئیسلامیدا.
- مامۆستا لە زانکۆی سلێمانی- کۆلیجی زانستە ئسلامییەکان.
- ئەندامی بۆردی سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکری.

# لێکەوتەکانی کۆرۆنا لەسەر هزر و پەرستشی مسوڵمانان

لەگەڵ هاتنی هەر پەتایەك بۆ سەر مرۆڤایەتی مێژوویەکی نوێ دەستپێدەکات لە گۆڕانکارییە ڕیشەییەکان لە شێوازی ژیان و گۆڕانکاری لە نەخشەی مامەڵەکردن لەگەڵ هەموو کایە گرنگەکانی جیهان و مرۆڤ تەنانەت گیاندار و بێگیانەکانیش، زۆر بە قورسی قورسایی خۆی لەسەر کایە کۆمەڵایەتی و کلتورییەکان بەجێدەهێڵێت و گۆڕانکارییان بەسەردا دەهێنێت، بەشێوەیەك دەیانخاتە ژێر کاریگەری خۆیەوە کە بەزەحمەت ئەم کلتوورانە دەچنەوە جێگەی خۆیان، مەرجیش نییە ئەو گۆڕانکارییانەش لە کایە کۆمەڵایەتی و کلتورییەکان هەموو کات نەرێنی بن؛ بەڵکوو هەندێکجار ئەوەندە ئەرێنین کە مرۆڤەکان لە کۆت و زنجیری هەندێك لە عادەت و کلتووری چەسپیوی نادروست ڕزگار دەکەن. هزر و پەرستشە ئاینییەکانیش بەدەرنین لە هەردوو جۆرە کاریگەرییەکان.

ئەوەی ئەمڕۆش ڕوودەدات لە جیهانی ئەمڕۆماندا لە بڵاوبوونەوەی بەهێزترین پەتا بەناوی کۆرۆنا(COVID-19) کە پەتای بەم شێوە گشتگیر و کاریگەرە چەندین سەدەیە لەنێو مرۆڤایەتیدا بڵاونەبۆتەوە؛ ئەو پەتایەیە کە چاوەڕوان دەکرێت گۆڕانکارییەکانی لە تەواوی بوارەکاندا بگاتە لوتکە و هەرگیز جیهانی پێش کۆرۆنا نەبینینەوە. ئاینیش وەک بەشێک لە کلتووری مرۆڤ سەلامەت نەبووە لە کاریگەرییە ئەرێنی و نەرێنییەکانی ئەم پەتا جیهانییە، هەر لە لایەنی هزر و بیروباوەڕەوە بیگرە تا لایەنی پەرستش و ئەحکامەکانی مامەڵەکردن. ئەوەی لێرەدا مەبەستمە ئاماژەی پێبکەم دەستخستنە سەر هەنێک لەو لێکەوتانەیە کە بەهۆی بڵاوبوونەوەی ئەم پەتایەوە هاتوونەتە کایەوە سەبارەت بە هزر و پەرستشەئاینییەکانی ئایینی ئیسلام و ئەو پێویستییە هەنوکەییانەی کە بە ناچاری فەتوای نوێ و بۆچوونی تازەیان لەمەڕ خراوەتە ڕوو.

**لێکەوتە ئەرێنییەکانی کۆرۆنا لەسەر هزر و پەرستشە ئاینییەکان:**

وەکو باسمانکرد لێکەتەکانی ئەم پەتایە مەرج نییە نەرێنی بن، بەڵکوو دەتوانین بڵێین لێکەوتە ئەرێنییەکانی لەسەرئایین زۆربەیان ئەرێنین و هزر و ئەندێشەی مسوڵمانانیان ڕاستکردۆتەوە لەمەڕ بەشێک لە پەرستش و ڕێکارەکانی، لێرەدا بەکورتی ئاماژە بەهەندێک لە لێکەوتە ئەرێنییەکانی ئەم پەتایە دەکەم:

**یەکەم: تێگەیشتی زیاتری مسوڵمانان لە ڕوخسەتە خوداییەکان:**

لەڕاستیدا هەندێک لە پەرستشەکان لە ڕابردوودا بەشێوەیەک وێنا دەکران کە ناکرێ و نابێ کەمتەرخەمییان تێدا بکرێت و ئەنجام نەدرێن، مزگەوتەکان کە شوێنی پەرستش و مەراسیمی ئاینی ڕۆژانە و هەفتانە و ساڵانەی مسوڵمانان بوو نەدەکرا دابخرێن و ئەو مەراسیمانەیانەی تێدا ئەنجام نەدرێن، بەڵام ئەم پەتایە نیشانیداین کە ناکرێ وابیر بکەینەوە. هەروەها ئەنجامدانی فەریزەی حەج و عومرە لە ماڵی خودا، کە کەم جار ئەو مزگەوتە پیرۆزە داخستنی بە خۆیەوە بینیوە و ئەم فەریزانەی تێدا ئەنجام نەدراوە بەشێوەیەک کە لە ئەندێشەی زانایان و مێژووزانانیشدا لەبیرکرابوو کە لە هەندێک لە قۆناغەکانی مێژووی ئاینیدا ئەم مزگەوتە داخراوە و ئەو پەرستشانەی تێدا ئەنجام نەدراوە، بۆیە دەبینین لێکۆڵینەوە دەکرێ لەسەر ئەوەی کە ئایا هیچ کات هەبووە ئەم پەرستشانە ڕابگیرێن؟ چۆن و کەی بووە؟ ئەم پەتایە لە مسوڵمانانی گەیاند کە هەرکات پێگیران لە ئەنجامدانی پەرستشدا هاتەکایەوە ڕاستەوخۆ دەبێت ئاسانکاری بکرێت و ڕۆڵی ئەو یاسا فیقهییە گرنگە بێتە کایەوە کە لە کتێبە شەرعییەکاندا ئاماژەی پێکراوە (المشقة تجلب التيسير)(١) ، واتە: پێگیران و مەشەقەت لە جێبەجێکردنی هەر فەرمانێکی خوداییدا هەبوو ئەوا ئاسانکاری بەدوایخۆیدا دێنێت، واتە خودا ڕێگەیداوە ئاسانکاری بگیرێتەبەر.

**دووەم: پابەندی زیاتر بە پاکوخاوێنی:**

هەرچەندە لە ئایینی ئیسلامدا گرنگییەکی تایبەت دراوە بە پاکوخاوێنی و هەموو پەرستشەکان وابەستە کراون بە هەندێک ڕێکاری پاکوخاوێنییەوە هەر لە دەست و دەم و ڕووخسار و قاچ شۆردنەوە تا خۆشۆردن بۆ هەندێک لە پەرستشەکان و واجبکردنی خۆشۆردنی هەفتانە..هتد، بەڵام نهێنی ئەم گرنگیدانە لەم پەتایە بۆ هەڵگران و پابەندانی ئاینی ئیسلام بەرجەستە بوو، زیاتر بەڕووح ئەم هەنگاوانە دەنرا لە بواری پاکوخاوێنیدا.

تەنانەت ئەمە کاریگەری ئەرێنی هەبوو لەسەر بەهێزتربوونی بیروباوەڕی تاکی مسوڵمان بە ئاینەکەیان بەوەی کە حیکمەتی ئەم پاکوو خاوێنییەیان بەڕوونی بینی و هۆکاری تەشریعکردنیان لەلایەن خوداوە بۆ ڕوونبویەوە.

**سێیەم: پتەوکردنی هەستی بەرژەوەندی گشتی:**

پێش هاتنی کۆرۆنا زۆر کات لەژێر هەژموونی پابەندییە ئاینییەکان گرنگیدان بە تەندروستی گشتی وەلادەنران لەکاتی ئەنجامدانی پەرستشەکاندا بەتایبەت نوێژە بەکۆمەڵەکان و ئەنجامدانی حەج و عومرە، بەهاتنی ئەم پەتایە زانایانی هاوچەرخ و کۆمەڵە و دەستە شەرعییەکانی فەتوادان بەناچاریی و لەبەر بەرژەوەندی گشتی مسوڵمانان و ڕێگرتن لە بڵاوبوونەوەی پەتاکەدا فەتوای چەندین ڕێکار و ئاسانکارییان دەرکرد بۆ مسوڵمانان، کە پێشتر فەتوای لەوجۆرە لە هیچ یەکێک لە چەرخەکانی پێشوودا نەدرابوون، ئەمە خۆی لە خۆیدا لەگەڵ ئەوەی پێداویستییەکی ئەرێنییە بۆ ئێستای مسوڵمانان، ڕچە شکاندنێکی باشیشە بۆ دەرکردنی فەتوای واقیانەتر لەمەڕ ڕووداو و پێشهاتەی تر لە داهاتوودا کە مۆرکی بەرژەوەندی گشتی پێوە بێت و لە خزمەتی کایە گشتییەکاندا بێت.

**چوارەم: تێگەیشتنی دروستر بۆ ئەو فەموودانەی کە باس لە گواستنەوەی نەخۆشییەکان دەکەن:**

لەناو کتێبەکانی فەرمووودەدا باس لە گواستنەوەی نەخۆشییەکان کراوە، زۆرێک لە فەرموودەکان باس لە دوورکەوتنەوە دەکات لەو کەسانەی تووشی نەخۆشییەکی گوازراوە بوون، چەندین فەموودەمان هەیە باس لەوە دەکات کە هەرگیز نەخۆش تێکەڵ بە ساغ نەبێت، هەروەها لە فەرموودەکاندا چەسپاوە کە لە هەر شوێنێک تاعون بڵاوبوویەوە نەچینە ئەو شوێنە و ئەگەر لە مەملەکەتێکیش بووین تاعوون تێیدا بڵاوبوویەوە ئەوا نەڕۆینە دەری ئەو شوێنە، هەندێک فەرموودەشمان هەن کە خوێندنەوەی جیاوازیان بۆ کرابوو لە ڕابردوودا بەشێوەیەک هەندێک لە زانایان لە ڕاڤەی ئەو فەرموودانەدا وتویانە گواستنەوەی نەخۆشیی لەیەکترەوە بوونی نییە، لەوانە ئەو فەرموودەیەی کە ئیمامی بوخاری و موسلم گێڕاویانەتەوە (لا عدوى ولا طيرة..)(٢) واتە گرتنەوەی نەخۆشی لەیەکترەوە بوونی نییە و شومی شتەکان بوونی نییە، بەڵام لەڕاستیدا مەبەست لەم

فەرموودەیە ئەوەیە کە کەسەکان خودی خۆیان هۆکار نین بۆ گواستنەوەی نەخۆشییەکان، بەڵکوو خودا مرۆڤەکان تووشی نەخۆشی دەکات و نەخۆشییان بۆ دەگوازێتەوە لە کەسانی ترەوە، پاڵپشت بۆ ئەم قسەیەش لە یەکێک لە ڕیوایەتەکاندا هاوەڵێک پرسیار لە پێغەمبەر (د.خ) دەکات و دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خودا بۆچی وشتر لە بیاباندا هیچی تووش نابێت، بەڵام کاتێک تێکەڵی دەکەین لەگەڵ وشتری نەخۆش ئەویش هەمان دەرد دەگرێت؟ پێغەمبەر لە وەڵامدا دەفەرموێت: باشە ئەگەر خودی خۆیان هۆکار بن بۆ گواستنەوەی نەخۆشییەکە ئەی کێ ئەوەی ئەوەڵی تووش کردووە. بێگومان خودای گەورە، واتە دەبێت کۆی هەموو فەرموودەکان وەربگرین بەهەموویانەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە گواستنەوەی نەخۆشی لەیەکترەوە بوونی هەیە وەک لە فەرموودەکانی پێشوو دەردەکەوێت، بەڵام دەبێت تەوەکولمان هەبێت بەخودا و تۆمەتی تووشکردنی نەخۆشی نەدەینە پاڵ یەکتر بەچارەنووسی خودایی لەقەڵەمی بدەین، دەست بە هۆکار و سەبەبەکانەوە بگرین خۆمان بپارێزین لە کەسانی نەخۆش. ئەم تێگەشتنە گشتگیرە زیاتر ڕوونبوویەوە کاتێک بە ڕوونی گرتنەوەی ئەم پەتایەمان بینی لە یەکترەوە.

**پێنجەم: دروشم بوونی ڕێنماییە ئاینییەکان بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەم پەتایە:**

یەکێکی تر لەو لایەنە ئەرێنییانەی کە کۆرۆنا دایناوە لەسەر ئاین و پەرستشەکانی ئەوەیە، کە سرووت و پەرستش و ڕێکارە ئاینییەکان جەختیان لەسەر کراوەتەوە لەلایەن پزیشکانەوە، تەنانەت لەلایەن نامسوڵمانەکانیشەوە، زانا ئاینییەکان هاندەدەرێن کە مسوڵمانان وشیار بکەنەوە سەبارەت بە ڕێکارەکانی خۆپارێزی، بەڵگەی ئاینی بۆ ئەم ڕێکارانە بهێننەوە، هانیان بدەن کە دەست بەو دەقانەوە بگرن کە باس لە پاک و خاوێنی و خۆپارێزی دەکەن، چونکە زانایان دەتوانن کاریگەی زیاتر دابنێن لەسەر کۆمەڵگە.

**لێکەوتە نەرێنییەکان لەسەر هزر و پەرستشی مسوڵمانان:**

زۆرن ئەو لێکەوتە نەرێنییانەی کە ئەم پەتایە لەدوای خۆی بەجێی هێشتوون و بەجێیان دەهێڵێت، کە ڕەنگە زۆربەیان قەرەبوویان نەبێت و هەندێکیشیان تا ماوەیەکی زۆر کاریگەرییان بمێنێت لەسەریان، ئەگەر بەکورتی ئاماژە بە هەندێک لەو لێکەوتە نەرێنیانە بکەین لەسەر هزر و پەرستشی مسوڵمانان دەتوانین بڵێین:

**یەکەم: لاوازبوونی پشتبەستن بەخودا لەلای هەندێک لە مسوڵمانان:**

کاریگەرییە بەرجەستەییە دیارەکانی ئەم نەخۆشییە و گواستنەوە خێرا و ڕاستەوخۆکەی وای لە هەندێک لە تاکی مسوڵمان کردووە کە وا هەست دەکات ئەم پەتایە تەواو نابێت و خۆپارێزییەکەی تەنها بە گرتنەبەری دوورکەوتنەوەی کۆمەڵایەتی یان دەواو دەرمانەکان دەبێت، لە ئەندێشەیدا هیچ جێگەیەکی بۆ هێزی خودایی نەهێشتووەتەوە،

ئەوەی لە بیرکردووە کە هێزی خودایی زۆر لەوە گەورەترە کە مرۆڤایەتی نەپارێزێت، ڕۆڵە کاریگەرەکەی دوعا و خێرکردنی لەبیرکردووە لەسەر لابردنی بەڵاکان لەسەر مرۆڤ، هەربۆیە دەبینین هەندێک لە مسوڵمانە لاوازەکان زۆر زیاد لە پێویست دەترسن، کاتێک خۆیان یان یەکێکیان تووشی پەتاکە دەبێت دونیای لێ بچووک دەبێتەوە و ئەوەی لەبیری نامێنێت پەنا بۆ داواکردنی یارمەتی لە خودا ببات.

**دووەم: دیاردەی ڕەشبینی بەرامبەر بە کۆمەڵگە و مرۆڤایەتی:**

هەندێک لە مسوڵمانان وا خوویان گرتووە هەر بەڵایەک یان پەتایەک یان دیاردەیەکی سروشتی ڕوویدات هۆکارەکەی ڕاستەوخۆ دەگێڕنەوە بۆ خراپی خەڵک و بڵاوبوونەوەی خراپەکاری لەسەر زەویی و سزادانی کافران بەم جۆرە پەتاو بەڵایانە، کە لەڕاستیدا مەرج نییە هۆکاری بڵاوبوونەوەی پەتاکان ئەو شتانە بێت کەباسی دەکەن، چونکە زۆر شتی تریش هەن کە دەبنە هۆکاری ناردن و بڵاوبوونەوەی ئەم جۆرە نەخۆشییانە، گرنگترینیان سوننەت و یاسا کەونییەکانە کە زەوی لەسەر بنیاتنراوە، هەروەها تاقیکردنەوەی خودایی بۆ مرۆڤەکان.. هتد، بۆیە لە سەرەتای ئەم پەتایەدا کاتێک کە ڕووی نەکردبوویە وڵاتە ئیسلامییەکان زۆر بەرگوێمان دەکەوت کە مسوڵمانان ئەم پەتایە ناگرن، یا دەوترا خودا سزای کافران دەدات بەم پەتایە، یان ئەمە قڕکەری سەگخۆر و پیسخۆرەکانە ..هتد، کەچی بینیمان کە پاش ماوەیەک زۆر بە توندتر پەتاکە وڵاتە ئیسلامییەکانی تەنییەوە، هەندێک لە دەوڵەتە مسوڵمانەکانی تەواو شەکەت کرد. هەربۆیە پێویستە مسوڵمانان دەستنەخەنە نێو ئیرادەی خودایییەوە و ڕاڤەی نادروست نەکەن بۆ دیاردە سروشتی و ناجێگیرەکان مەگەر زۆر دڵنیابن، هەروەها مامەڵەکردنی دروست لەگەڵ ئەم پەتایەدا ئەوەنییە ڕاڤەی هۆکارەکەی بکەیت، بەڵکو ئەوەیە کە کار لەسەر دۆزینەوەی چارەسەرەکەی بکەیت و ڕێکارەکانی خۆپارێزی بگریتەبەر.

**سێیەم: یارمەتیدانی بڵاوکردنەوەی هەندێک پڕوپاگەندە و زانیاری نادروست:**

یەکێکی تر لەو لایەنە نەرێنیانەی کە کاری کردووەتە سەر بیر و بۆچوونی مسوڵمانان یارمەتیدانی بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندە و زانیاری نادروست لەسەر چارەسەرەکان و دەواکانیان و ئامار و ژمارەی توشبوون و بڵاوبوونەوەکەی...، لەڕاستیدا پشتڕاستکردنەوەی هەواڵ و بەدواداچوون بۆی یەکێکە لەو شتانەی کە داواکراوە لە مرۆڤی مسوڵمان پابەند بێت پێوەی، بەڵام دەبینین لە مامەڵەکردن لەگەڵ ئەم پەتایەدا زۆر هەواڵی نادروست و زانیاری هەڵە بڵاودەکرێتەوە لە فەزای مسوڵماناندا کە زۆرێکیان ڕەنگە ئامانجێکی باشی لە پشتەوە بێت، بەڵام لەڕاستیدا زیانی زۆری گەیاندووە لە شێوازی مامەڵەکردن لەگەڵ پەتاکەدا، بۆیە پێویستە مرۆڤی مسوڵمان زانیاری لە شوێنی باوەڕپێکراو و کەس و لایەنی پەیوەندیدارەوە وەربگرێت، هەروەها فەرمانی پێکراوە لە دەقە ئاینییەکاندا.

**چوارەم: فەوتانی بەشێک لە پەرستشەکان:**

یەکێکی تر لەو لێکەوتە نەرێنییانەی کە بە هۆی کۆرۆناوە کاریگەری خۆی دانا بریتی بوو لە فەوتانی هەندێک پەرستشی بەکۆمەڵی مسوڵمانان، وەک فەریزەی حەج و عومرە و هەندێک لە پەرستشەکانی تر، بەتایبەت هی ئەو کەسانەی کە فرسەتی ئەنجامدانی ئەم فەریزەیان کەم بووەتەوە یاخود لەدەستداوە، ئەمەش ئەگەرچی بەهانەی خۆی هەیە، بەڵام کاریگەری درێژخایەنی دانا لەسەر گۆڕانی ئەنجامدانی ئەو پەرستشانە، بۆیە هەرگیز پێناچێت جارێکی تر خەڵکی بتوانن بەو ڕێژە زۆرە و بەوشێوەیەی جاران ئەم پەرستشانە ئەنجام بدەنەوە، لانیکەم هەتا ماوەیەکی دوور و درێژ ڕێکاری توند و بەرتەسککردنەوەی چوون بۆ شوێنە پیرۆزەکان ڕەچاو دەکرێت. جگەلەوەی هاتوچۆی مزگەوت و بەشداری لە نوێژی هەینی سنودار کرد لە زۆربەی وڵاتان. هەروەها ئازار پێگەیشتنی بەشێک لەمسوڵمانان لە ناشتنی مردووەکانیان بەوشێوەیەی کە بۆ ئەم نەخۆشییە پیادە دەکرێت و نەتوانینیان بە شاردنەوەی ئازیزانیان بەشێوە داواکراو و شەرعییەکان.

**پێنجەم: کەمکربوونەوەی چالاکییە ڕێخراوەیی و بانگەوازییەکان:**

یەکێکی تر لە کاریگەرە نەرێنییەکانی ئەم پەتایە کەمبوونەوەی چالاکی دامەزراوە خۆبەخشی و بانگەوازە هزرییەکانە لەناو کۆمەڵگاکاندا، کە بەشێویەکی ڕاستەوخۆ کاریگەرییان هەیە لەسەر ڕاستکردنەوەی کۆمەڵگا و ئاڕاستەکردنیان بەشێوەیەکی تەندروست، هەروەها پەکخستنی کاری ڕێخراوە مەدەنییەکانە، کە زۆرێکیان کار لەسەر تەندروستکردنی خێزان و کۆمەڵگەکان دەکەن و ئەو کارانەی کە حکومەتەکان پێڕاناگەن ئەنجامی بدەن لەڕووی هزریی و کۆمەڵایەتییەوە ئەم ڕێخراوانە ئەنجامی دەدەن، ئەم پەتایە تەواوی ئەو کارانەی پەکخست و کارەکانی ئەوانیشی داخست، تاماوەیەکی زۆریش چاوەڕوان ناکرێت کە دۆخەکەیان وەک حاڵەتە ئاساییەکەی لێبێتەوە.

**پەراوێزەکان**

١. ئەمە بە یەکێک لە گرنگترین یاسا فیقهییەکان دادەنرێت و چەندین پاسای فیقهی تری لەسەر بنیاتنراوە.

٢. ئەم فەرموودەیە ئیمامی بوخاریی و موسلیم ڕوایەتیان کردووە..



وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە:
بوخاری عەبدوڵڵای قەسرێ

# کاریگەرییەکانی ڤایرۆسی کۆرۆنا لەسەر ڕەوشی پەروەردە لە جیهاندا

ڤایرۆسی کۆرۆنا و تەشەنەکردنی لە جیهاندا پەروەردەی بەرەو کۆمەڵێك دۆخ و ئاریشە ڕاپێچ کرد. لە سەد وڵاتی دنیادا بوو بەهۆی داخستنی دەزگا و دامەزراوە پەروەردەییەکان و، لەهەمانکاتیشدا ملیارێك فێرخوازی ڕەوانەی ماڵەوە کردەوە.

ئەو ئامارانەی خڕکراونەتەوە و بە پڕۆگرامی تایبەتی ئامارناسیی ورد شیتەڵکراون، ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە کۆرۆنا بۆتەهۆی لەکیسچوونی چەندین هەلی ئیش و، نەمانی حەز و خولیای فێرخوازان و کاریگەری لەسەر پرۆسەی فێرکردن و هەروا زیادبوونی باری گرانی قەرزی قوتابیان لە وڵاتانی دنیادا. بەڵام بە دیویکی دیکەشدا، چەندین فێرخواز و مامۆستا لەسەر هێڵ بوونە بە بەکارهێنانی تەکنەلۆژیا ویستویان لەو ماوەیەدا لە پرۆسەکە دانەبڕێن و هەرچۆنێک بێت پرۆسەکە بەردەوامی پێبدرێت. بەڵام فێرکردنی ئۆنلاین هەروا ئاسان نییە، چەندین کێشەی بنەڕەتیی چارەسەرنەکراوی تێدایە: لە زۆر وڵات کە هێشتا لە گەشەدان (بۆ نمونە جیهانی سێیەم) ژێرخانی فێرکردنی ئەلیکترۆنی و ئۆنلاین لاوازە، ئەنتەرنێت و وزە (کارەبا) وەک پێویست نییە، توانستی دیجیتاڵی و کۆمپیوتەریی مامۆستا و فێرخواز وەک پێویست نییە.

ئەم پەتایە جیهانییە بۆشاییەکانی لە پرۆسێسی فێرکردندا زیاتر کردووە، ڤایرۆسەکە و دەرهاویشتەکانی لەم هەشت ڕێگەیەوە کەم تا زۆر کاریگەرییان لەسەر پەروەردە جێهێشتووە:

١. پچڕانی خوێندن
٢. کێشەی بودجە و تێچوون و قەرز
٣. نەبوونی خولیا و بەرزبوونەوەی ڕێژەی وازهێنان لە قوتابخانە
٤. لەکیسچوونی هەلی کار و وازهێنان لە ئیش
٥. درێژبوونەوەی خوێندن
٦. کێشەی کەموکورتی ئامرازەکانی فێرکردن
٧. کەمی هەلی خوێندن
٨. لەمپەرەکانی بەردەم توێژینەوەکان

لە هەر وڵاتێکی دنیا بە شێوازێک کاردانەوە بەرانبەر بڵاوبونەوەی ئەم ڤایرۆسە نەخوازراوە نوێنرا، هەریەکە و وەڵامدانەوەی خێرای هەبوو بۆ کێشەکە، بەڵام بەگشتی خوێندن و پرۆسەی فێربوون بەرەو سستی و کشانەوە و هەندێجاریش وەستان و ڕاگیران ڕۆیشت، بەم شێوەیە:

لە ئەمریکا قوتابخانەکان داخران، هەموو تاقیکردنەوە و ڕێککارەکانی هەڵسەنگاندنیش پەکخران و وەستێنران. بەوهۆیەوە ٦٠ ملیۆن قوتابی لە ئەمەریکا بەناچاری بەڕێکرانەوە بەرەوماڵەوە و لە خوێندن بۆ ماوەیەک دابڕێنران. لە ئوستراليا قوتابخانەکان داخران و هەندێکیشان هەر زوو بە ئۆنلاین بەردەوام بوون. هەندێک قوتابخانە بە ڕێککاری دووربوونی قوتابی لەگەڵ یەکتر و بۆشایی و لێکدووری لە نێوان هەردوو تاکێک لە یەکتری، توانیان جارێکی دیکە دەرگای قوتابخانە بکەنەوە. لە ئیسپانیا ١١ ملیۆن

قوتابی نێردرانەوە ماڵەوە. لە شاری مەدرید کاریگەریی خستە سەر ئەو کۆمپانیایانەی کە کۆنتراکت و قەواڵەیان هەبووە لەگەڵ قوتابخانە و پەیمانگە و زانکۆکان تا دەستی کاریان بۆ فەراهەم بێنن. بۆشایی و لێکترازان و دوورکەوتنەوە پەیدابوو. لە وڵاتی سعودیەدا قوتابخانەکان داخران، هەموو دەزگاکانی پەروەردە بە فەرمانی حکومەت خۆیان چڕکردەوە لەسەر خوێندنی نێو ئەنتەرنێت (ڤێرچواڵ) کە جەخت لەسەر (هێڵ) ی ئەنتەرنێت و پەیوەندی ئەلیکترۆنی مامۆستا و فێرخواز دەکاتەوە، بۆ ئەم مەبەستە حکومەت خێرا کەوتە سەر پلان و ئیش. لە کوردستانیشدا دوای مانگێک لە تەشەنەکردنی ئەم ڤایرۆسە لە کۆمەڵگەدا حکومەت بڕیاری داخستنی دەرگای قوتابخانە و زانکۆکانیدا.

بەپێی ڕاپۆرتی ڕێکخراوی (یونیسکۆ)، ڤایرۆسی کۆرۆنا ئەم زیانانەی خوارەوەی هەبووە بۆ سەر ڕەوشی پەروەردە لەجیهاندا:

١. پچڕان لە کەشی خوێندن: بە داخرانی دەرگای قوتابخانەکان، فێرخوازان لە گەشەی هزریی و هۆشەکی و جەستەیی و دەرونیی فێربوون دابڕان و دورکەوتنەوە.

٢. بەدخۆراکی: لە هەندێک وڵاتدا زۆر قوتابی پشتئەستور بوو بە خۆراکی نێو قوتابخانە و سیستەمی تەندروستی نێو قوتابخانە، کاتێک ئەو ڤایرۆسە بڵاوبوویەوە و قوتابخانەکان داخران، کاریگەری زۆر نەرێنی دروستکرد لەسەر کەمخۆراکی لەلای قوتابی.

٣. نایەکسانی لە هەلی چنگ کەوتن و بەکارهێنانی پۆرتاڵی ئەلیکترۆنی (ئامرازە ئەلیکترۆنییەکانی ناو ئەنتەرنێت، وەک پرۆگرامەکان). زۆر لە قوتابخانەکان بەرنامەی پێشوەختەی ئامادەکراویان لەو پۆرتاڵانە نەبوو تا لەکاتی هاتنی ئەو کێشەیە بەکاری بهێنن و قوتابی بەخۆیان ببەستنەوە.

٤. پاڵەپەستۆ لەسەر هەندێ قوتابخانەی لۆکاڵی لەوەدا کە دەرگای قوتابخانەکانیان بکەنەوە یاخود دایبخەن. دایکان و باوکانی قوتابیەکانیش دەیانویست فشار دروستبکەن. هەندێک وڵات هۆشداریان لەوە دەدا کە بچووکی کلاسەکان زۆر هاندەر نەبێت بۆئەوەی قوتابیان جارێکی دیکە تێکەڵبکرێنەوە، هەندێکی دیکەش زوو بە متمانەوە ئامادەییان دەربڕی. ئەمە ڕاجیاییەکی زۆری هێنایە کایەوە.

٥. دورکەوتنەوە و گۆشەگیری کۆمەڵایەتی: بەوپێیەی کە قوتابخانە ناوەندێکی کۆمەڵایەتییە و، شوێنی گردبوونەوەی کۆمەڵێک مرۆڤی جیاوازە لەگەڵ یەکتریدا لە کەشێکی مەعریفی و فێربووندا، بەهۆی داخرانی ئەو ناوەندە، مرۆڤەکان لێکدورکەوتنەوە. پێوەندی کۆمەڵایەتی و لەگەڵ یەکبوون و تێکەڵیی زۆر گرنگن بۆ گەشەی هزر و داهێنان و بەرەوپێشچوونی ئاستی هۆشیاری مرۆڤەکان، قوتابخانە لەو ڕووەوە زۆر هاندەرە، بەڵام بەهۆی ئەم ڤایرۆسەوە قوتابخانەکان داخران و ئەو کایانەش بەرەو سستی چوون.

خاڵێکی دیکەی جەوهەریش ئەوەیە کە بەهۆی ئەوەی یەکتربینین و دیدار و چاوپێکەوتن لەو ناوەندە مەعریفی و پەروەردەییانە بەرەو کزی چوو و نەما، ئەوە کاریگەری کردە سەر ئاستی توێژینەوە و پرۆژە زانستییەکانیش.

بەڵام ئینکاری لەوە ناکرێت کە چارەسەر بۆ هەموو کێشەیەک هەیە، جارێکی دیکە لەم سۆنگەیەوە پەیدابوونی ئەم پەتایە جیهانییە هەموو دەزگاکانی پەروەردەی خستە بەردەم پرسیارەوە کە چۆن بەسەریدا زاڵ بین؟ جارێکی دیکەش ڕوانینی پەروەردەکاران لەبارەی چیەتی و چۆنییەتی خوێندن و ئامرازەکانی گەیاندنی زانیاری و ئالییەتی پێوەندیگرتن و لێکتێگەیشتن و گردبونەوە قسە و باسیان لێوەکرایەوە. تەکنەلۆژیا و لە پێوەندیدا بە ڕەوشی شێواوی پەروەردەی ئێستا لە دونیا جارێکی دیکە بووە باسێکی گەرم. ئێستا تەکنەلۆژیا چیتر کەنارگیر نییە لە پەروەردە و کلاسەکان و پرۆگرامی خوێندن، بەڵکو ئێستا تەکنەلۆژیا تاڕێژەیەک دەرچە و دەروازەی چارەسەرە، گەرچی دەبێت شیاندن و ئامادەکاری زیاتری بۆ بکرێت، چونکە گرفتی گەورەی لە بەردەمدا هەن. تەکنەلۆژیا پردی لێکگرێدانی هەردو ژینگەی (ماڵ)ی قوتابی و (ماڵ)ی مامۆستایە، یاخود (ناوەندی فێرگە) و (ماڵ)ی قوتابیە. ئەمجارە لە جیهانێکی ئەنتەرنێتییانە (بە ئینگلیزی پێی دەڵێن ڤێرچواڵ) هەموولا پێک ئاشنا دەبنەوە و لە پلاتفۆرمێکی ئەنتەرنێتدا جارێکی دیکە زانیارییەکان دەگۆڕنەوە.

> **تەکنەلۆژیا چیتر کەنارگیر نییە لە پەروەردە و کلاسەکان و پرۆگرامی خوێندن، بەڵکو ئێستا تەکنەلۆژیا تاڕێژەیەك دەرچە و دەروازەی چارەسەرە، گەرچی دەبێت شیاندن و ئامادەکاری زیاتری بۆ بکرێت.**

تەکنەلۆژیا ئەو دووریەی کات و شوێنی لە هەمبەر پەروەردە کەمکردەوە. چیتر ماوە دورودرێژەکانی داخرانی قوتابخانە زۆر نەبوون، لەڕێگەی مۆبایل و لاپتۆپ و ئایپادەکانەوە لانیکەم پردێکی پێوەندی فێرخوازان و مامۆستایانی لێک نزیک کردەوە، تا لانیکەم کەشی لێکفێربوون و لێکنزیکی مەعریفی و هەندێک هەستی ڕۆحی پەروەردەییانە لەگەڵ یەکتری ئاڵوویر بکەن. هەرچەندە کوالیتی فێربوونی تەکنەلۆژی ڕەنگە جیاواز بێت بۆ فێرخوازی زۆر وڵاتی دنیا (وەک کوردستان) بە بەراورد بە کوالیتی فێربوونی نێو پۆل.

بۆ ئەم مەبەستە دەمێکە توێژەرانی بواری فێرکردن و ڕێبازەکانی فێرکردن ئەم چەمکە پەروەردەییانە بەکاردەهێنن (من لێرە بە ئینگلیزیش وەک خۆیان دایان دەنێم چونکە دڵنیانیم لەوەی کە لە زمانی کوردیدا وشەی هاو واتایان لە بەرانبەردا بە گونجاوی

دابنرێت وەک ئەوەی دامناون):

Remote learning واتە فێربوونی کۆنترۆڵی، ئالیی، خۆکاریی

Distance learning فێربوون لە دوورەوە

Virtual learning فێربوونی نێو ئەنتەرنێتی

Blended learning فێربوونی ئاوێتە

Mobile learning فێربوونی مۆبایلی

Distributed learning فێربوونی دابەشکراو

Machine learning فێربونی ئامێریی

Ubiquitous learning فێربوونی جیهانی

Deep learning فێربوونی قوڵ

فێربوون لەڕێگەی تەکنەلۆژیاوە گەرچی بەربەست و کێشە و ئاریشەی خۆی زۆر هەن، بەڵام لەهەمانکاتدا بەستنەوەی دنیای فراوانی ئەنتەرنێتە بە دنیای فێربوون و ماریفەتخوازیی و، خستنەڕووی جیهانێکی بەرفراوانی تۆڕی سەرچاوە مەعریفییەکانە وەک کتێب و توێژینەوە و ڕاپۆرت و وتار و نوسینە جۆربەجۆرەکان لە بەردەم سەرجەم فێرخوازاندا بەشێوەیەکی ئاسان. بۆیە گەڕان و چنگخستنی زانیاری بۆ فێرکردن لەڕێگەی تەکنەلۆژیا پرۆسەیەکی کرداریی هەرە بە بەرهەمە و ناکرێت ئینکاری لێوە بکرێت. بەڵام فێربوون لەڕێگەی تەکنەلۆژیاوە بناغەیەکی پتەوی دەوێت، ناشێت فێرخواز لەخۆیەوە بخرێتە بەردەم شاشەیەکەوە و بگوترێت» «لێی فێرببە!»، ئەمە پێویستی بە ڕێخۆشکردن و ئامادەکاریی باش هەیە:

چیمان پێویستە؟ ئەنتەرنێتی باش (هێڵێکی گەرمی خێرا)، ئامێر و کەرستەی باش (مۆبایلی زیرەک و لاپتۆپ و ئایپاد و کیندڵ و تابلێت...هتد)، زانینی بەرنامە ئەنتەرنێتی و کۆمپیوتەرییەکان (سۆفتویرەکان)، زانینی چۆنیەتی بەکارهێنانی کەرستە شاشەییەکان، فەراهەمبوونی ئەو ئاپلیکەیشن (پلاتفۆرم) و پرۆگرامە دیزاینکراوانەی بۆ فێرکردن زۆر گرنگن، هەروەها ئەقڵییەتی ئیداریی چۆنیەتی بەکارخستنی ئەم پرۆژەیە، هەروەها ڕێنمایی و هۆشیاری تەکنەلۆژیای پەروەردەیی، ڕاهێنان بە فیرخواز و مامۆستایان...هتد. هەموو ئەو خاڵانەی سەرەوە هۆکاری هەرە بە بایەخن لەوەدا کە چۆن باشترین وەبەرهێنان و سود لە تەکنەلۆژیا وەربگرین لە هەمبەر قەیرانی کۆرۆنادا بۆ بەردەوامیی فێربوون.

تەکنەلۆژیا هەمیشە لە گەشەدایە، بەڵام تەکنەلۆژیای دیجیتاڵیی (شاشەی زیرەک) وایکردووە کە هۆکارەکانی پەرش و بڵاوبوون و تەشەنەکردنی (زانیاری) خێراتر بن لە جاران بەشێوەیەکی زۆر سەرسوڕهێنەر و، کاراتر و خێرار و تەنانەت ترسناکتریش! بۆیە گرنگە پەروەرشیاران سود لەم هەلە وەربگرن و لە پرۆسەی فێرکردندا پەناگیری نەکەن.

ئەمە چۆن دەکرێت؟ لەڕاستیدا ڕووانین و ئەزموون و میتۆدەکانی بەکارهێنانی تەکنەلۆژیا لە پەروەردەدا چۆنیەک نین. لە هەر پنتێکی جوگرافی دونیادا شێوازێک بەکارهێنراوە و بەکاردەخرێت. دەشێت هەندێجار وانەی تۆمارکراو بە ئامادەکراوی بگەیەنرێتە فێرخواز، دەشێت کۆرسی تۆمارکراوی بابەتێک بە زنجیرە بە قوتابی بدرێت، یا بابەتە پەروەردەییەکە وەک تێکست و وێنە و ڤیدیۆ لەوێ دابنرێت، یاخود دەشێت ڕاستەوخۆ لەڕێگەی بەرنامەیەکی ئەلیکترۆنییەوە قوتابی و مامۆستا پێکەوە بلکێنرێن و لەسەر خەتدا بن بۆ وتوێژ و گفتوگۆی زانستی، دەشێت هەندێک چالاکی مەعریفی لەڕێگەی سۆفتوێرێکەوە ئەنجامبدرێت، یاخود دەشێت قوتابی و مامۆستا لەڕێگەی وێبسایتی تایبەتی ئەکادیمی (ئەوانەی زانکۆکان دیزاینیان کردووە بۆ نمونە) لەسەر خەت بن.

توێژەران و لێکۆڵەرانی بواری تەکنەلۆژیای پەروەردەیی، ئەم سی و شەش پلاتفۆرم و وێبسایت و ئامرازە ئەنتەرنێتییانەیان بەباش زانیوە بۆ فێرکردن لە سەردەمی کۆرۆنادا:

1. GoToMeeting.com
2. Skype.com
3. Google Classroom/Open Online education (edu.google.com)
4. Youtube.com
5. Blackboard.com
6. udemy.com
7. coursera.org
8. memory.com
9. alison.com
10. edx.org
11. easyclass.com
12. vedamo.com
13. Khanacademy.org
14. TED-Ed (ed.ted.com
15. Codeacademy.com
16. Stanford Online)Online.stanford.edu)
17. futurelearn.com 18. rcampus.com
19. learnopia.com
20. Peer 2 Peer University ( p2pu.org
21. Teachers pay Teachers)teacherspayteachers.com)
22. Thinkific)thinkific.com)
23. MOOC.org

24. openculture.com
25. academicearth.org
26. itunesU Free courses)apps.apple.com)
27. lessonpaths.com 28. memrise.com
29. funbrain.com)for kids)
30. whyville.net )for teens)
31. Edmodo (edmodo.com
32. schoology)schoology.com)
33. classdojo (classdojo.com)
34. google hangouts (hangouts.google.com)
35. Zoom)zoom.us)
36. Whatsapp.com

**پوختە و ئەنجام:**

بڵاوبوونەوەی نەخوازراوی ڤایرۆسی کۆرۆنا کاریگەریی زۆری خستە سەر ڕەوشی پەروەردە لە هەموو دونیا، لە هەر وڵاتێک و بەرێژە و قەبارە و شێوازی ئەو وڵاتە خۆی، بەڵام وشیارکەرەوەیەکی زۆر باش بوو بۆ خەمخۆرانی ڕەوتی پەروەردە بۆئەوەی بیر لە ڕێگەچارەی دیکەی جێگرەوە بکەنەوە لە دەرەوەی ئەو بژاردە دوبارەییانەی تا ئێستا هەن بۆ فێربوون و فێرکردن. ئەگەری ڕوودانەوەی ئەم ڕووداوە هەیە و، ناشێت خۆمان تەسلیم بە واقیعی بەرەوپاشچوونی پەروەردە بکەین، یان لێبگەڕێین پرۆسەکە بەڕێبکرێت بەبێ لێکدانەوەی ورد و ئامادەکاریی بە پلان. ئەم توێژینەوەیە بچووکە تەنها نیشاندانی گلۆپێکی سوورە، دەبێت زۆر لەوە زیاتر بنوسرێت و بخوێنرێتەوە، چونکە ئەم ئاریشەیە بۆ دونیا تازەیە.

**تێبینی**: ئەم وتارەی لێرە نوسیومە پوختەی وەرگێڕانێکی دەستکاریکراوی منە بۆ توێژینەوەیەکی بچوک کە کۆمەڵێک مامۆستای زانکۆ لە کۆمەڵێک وڵاتی دنیادا پێی هەڵساون بە ناوی: Impact of Coronavirus Pandemic on Education
لە نوسینی: ئیدێ ئۆنیمیا، د. نوافۆر چیکا، د. فاتیح ئۆباهێمی، شۆڤرۆ سێن، فینیفاس ئۆتۆنی، د.ئۆبها شارما، ئەلحوسێن ئەلسەیید.
کۆمەڵێک مامۆستای زانکۆ لە (ئیسپانیا، هیندستان، نایجیریا، سعودیە، بەنگلادیش).



نووسینی: د.مصطفى عمر التیر

وەرگێران: ئیسماعیل تەها

# کۆڕۆنا چەند پرسیارێك ئاڕاستەی زانایانی کۆمەڵناسی دەکات

ماوە ماوە لێرە و لەوێ جیهان ڕووبەڕووی بڵاوبوونەوەی پەتایەکی تەندروستی دەبێتەوە، ئەگەر چاوێك بە سی چل ساڵی ڕابردووی ئەو دواییانە بگێڕینەوە، ئیبۆلا و سارس، ئەنفلۆزای بەرزامان بیردەکەوێتەوە، هەروەها لە دەستدانی بەرگری(ئایدز) دەبینین، سەرەتا لە یەك وڵاتە سەرهەڵدەدات، پاشان لە وڵاتانی دراوسێ بڵاو دەبێتەوە. دەکرێت کاریگەریی پەتا لە ناوچەیەکی جوگرافی یەکێك لە کیشوەرەکان بێت، سنووری ئەو کیشوەرە تێپەڕ نەکات، وەك پەتای ئیبۆلا لە ئەفریقا، سارس لە باشووری ئاسیا، بەڵام لە مێژووی ڕابردوو ئەو ڕووداوانە، کاتێ پەتایەك زۆر بەربڵاو دەبێتەوە، حاڵەتی تووش بوون لە چەند وڵاتێك و دواتر لە هەموو کیشوەرەکان دەردەکەوێت.

له هەردوو حاڵەتی ئیبۆلا و سارس، مردن بەهۆی پەتاکان لە چەند هەزارێک تێپەڕی نەکرد، بەڵام ئەنفلۆزای بەرزار لە ٢٠٠ هەزار کەس تێپەڕی کرد. بۆ یەکەمجار ئایدز لە حەفتاکانی سەدەی بیستەم دەرکەوت، تا ئێستا لە جیهان بەربڵاوە، بەڵام ژمارەی گیانلەدەستدان بەهۆی ئەو پەتایەوە لە ٣٩ هەزارکەس تێنەپەڕییوە. ئاماژە مەیدانییەکان بۆ ئەوەن پەتای کۆرۆنا شوێنەوارێکی وێرانکەر بەجێدەهێڵێت، هیچ پەتایەکی پێشوو ئەو کاریگەرییەی نەبوو لە جیهان، هەر پەتایەک تووشی جیهان بووبێت ژمارەی مردووان هەر هێندەی ژمارەی مردووانی ئایدز بووە، بەڵام لێکەوتەکانی پەتای ئێستا لەسەر پەیوەندییە کۆمەڵایەتی، ئابووریی و سیاسییەکان زۆر مەترسیدارە.

هەندێک لە نیشانەکان، کە لەگەڵ ئەو نەخۆشییە بڵاوبوویتەوە، لە باگراوەندی کارمەندانی کەرتی تەندروستی بوونی هەیە، ئەمەیش بەهۆی تۆمارکردنی زانیاریی و نیشانەکانی ئەو نەخۆشیانەی لە ڕابردوو سەریانهەڵداوە، هەندێکیان پێشووتر نەبینراوە، هەندێک حاڵەتی هاوشێوەش هەبووە، نەخۆشییەکە لە وڵاتێکی دیاریکراو دەرکەوت، بەڵام پاشان دەرچوو بۆ ڕووبەڕووی هەموو جیهان.

یەکێک لە گرنگترین تایبەتمەندییەکانی ئەم ڤایرۆسە (کۆرۆنا) زۆری مانەوەی بوو لە شوێنی خۆی، کە دەگەیشتە دوو حەفتە، زۆر بە ئاسانیش لە نێوان تاکەکان دەگوازرایەوە، لە ماوەی مانەوەی، نیشانەی ڕوونی دەرنەدەکەوت، پەتای گوازراوە تێکەڵ بە زۆر کەس دەبێت، بۆیە دکتۆرەکان هاوڕابوون لەسەر دوورکەوتنەوەی جەستەیی، ئەوە باشترین ڕێگە بوو بۆ خۆپاراستن لەو گواستنەوەیە.

لەسەر ئاستی تیۆریی کارێکی سادەیە، بەڵام لەکاتی جێبەجێکردن بەو جۆرە نییە، دابوونەریتی کۆمەڵایەتی لە زۆربەی کۆمەڵگەکان پێچەوانەی ئەو هەڵسوکەوتەیە، لەکاتی چوونە ناوی هەر ئاوێتەبوونێکی کۆمەڵایەتی ئەگەر لە نێوان کەسانی نامۆ بەیەکتریش بێت، ڕۆشنیری ناوچەیی ماوەی نێوان دوو کەس دیاری دەکات لەکاتی بەریەکەوتنی کۆمەڵایەتی، ئەوەش لەژێر سروشتی پێوەندی کۆمەڵایەتی نێوان دوو کەسە، سروشتی پرۆسەی خودی تێکەڵبوونیانە، کە نێوانەکەیان زۆر کورتە، یاخود هەر بوونی نییە، جا لەناو یەک خێزان یاخود کۆمەڵێک هاوڕێ بێت، بەتایبەت شێوازی سڵاو لەیەککردن، کە لە هەندێک کۆمەڵگە تەنیا تەوقەکردن نییە، بەڵام باوەشکردن بەیەکدا و ماچکردنیش ئاساییە، ئەو دوورکەوتنەوەی ئێستا پزیشکان داوای دەکەن، کە نابێت نێوانی دوو کەس لە مەتر و نیوێک کەمتر بێت، هەروەها نەکردنی تەوقەکردن لەپێناو جێبەجێکردنی ڕێنماییەکان، حکوومەتەکانی زۆربەی وڵاتە جۆراوجۆرەکانی ناچارکرد، مانەوەی بە ناچاری (کەرەنتین) لەماڵەکان ڕابگەیەنن، کە چەندین حەفتەی دەخایەند لەبری چەند ڕۆژێک.

بەر لە کۆتایی مانگی مارسی ٢٠٢٠ نزیکەی نیوەی دانیشتوانی گۆی زەوی بە ناچاری لە ماڵەکانیان دانیشتبوون، شەقامەکان چۆڵبوون لە هاموشۆی مرۆڤ و ئۆتۆمبێلەکان، ئەو شارانەی بۆماوەی چەندین مانگ شەو و ڕۆژ جوڵەی تێدا نەدەبڕا، ببوو بە شاری تارماییەکان. بەوجۆرە تاکەکانی کۆمەڵگە ناچاربوون شێوازی ژیانی ڕۆژانەیان بگۆڕن، لەبری ئەوەی بۆماوەی چەندین کاتژمێر ماڵ جێبهێڵن و زۆربەی کاتەکانیان ڕۆژانە لەکارکردن بەسەر ببەن، ئەو شێوازە ژیانە گۆڕا بۆ مانەوەیان لە ماڵەوە، ئەوە بەلای زۆرێک خەڵکی ئەم حاڵەتە دۆخێکی خۆشی لەگەڵ نەبوو، کە دەکرێت ناوببرێت بە«پەتای ترس».

چالاکی ڕۆژانەی تاک گۆڕا، منداڵ یاریکردنی دەرەوە و ڕۆیشتن بۆ قوتابخانە لێ قەدەغەکرا، چوونی کرێکار بۆ شوێنی کارکردن قەدەغەکرا، بەهەمان شێوە فەرمانبەرانی کەرتی گشتی و تایبەت لەکارکردن وەستان، ئەگەرچی هەندێک کار دەکرا لەماڵەوە بکرێت، وەک بەکارهێنانی تەکنەلۆژیایی پێوەندیی مۆدێرن، بەڵام هەزاران بواری تر هەبوون کارەکان لە ماڵەوە نەدەکران.

لەسەر ئاستی بازنەیەکی فراوانتر، زۆربەی وڵاتەکان سنوورەکانیان لەگەڵ دراوسێکانیان داخست، دەسەڵاتدارانی هەموو وڵاتێک وڵاتەکەی تری بە تووش بوو دەزانی، بۆیە بڕیار دەدا پێشوازی لە سەردانیکەرانی نەکات، لەکاتێک دا هەندێک وڵات ڕێگەی دەدا هاونشتمانیانی کە گیریان خواردبوو لە دەرەوە بگەڕێنەوە بە مەرجی مانەوەیان بۆ ماوەی دوو حەفتە کەرەنتین بوون، کاتێکیش ئەو وڵاتانە زۆر ناچاربوون ڕێکارەکانیان توندتر دەکرد و سنوورەکانیان بەتەواوی دادەخست، هاونشتمانیانیش ناچاربوون لە شوێنەکانیان بمێننەوە بەبێ ڕەچاوکردنی دۆخی کۆمەڵایەتی و ئابووری.

خێرایی بڵاوبوونەوەی پەتای کۆرۆنا بەرنامەی هەندێک وڵاتی وەستاند، دەرکەوت زۆربەی کەرتی تەندروستی گشتی ئەو وڵاتانەی کە بە وڵاتی گەورە و بەهێز، یاخود پێشکەوتوو وەسف دەکران ئامادەیی تەواویان نەبوو بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو پەتایە، ئەوەش کاردانەوە و ئاڵۆزی پێوەندی نێودەوڵەتانی لێکەوتەوە، ڕەخنەی زۆر لە چین گیرا، بە شاردنەوەی داتاکان تۆمەتبارکرا، بووە هۆی دواکەوتنی ناسینی سروشتی ئەو ڤایرۆسە نوێیە، لە بەرامبەردا ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا تۆمەتبارکرا بە بەکارهێنانی ئەو ڤایرۆسە وەک مامەڵەیەکی بایلۆژی، هەندێک وڵات ڕایانگەیاند ئامادە نین پێداویستییە پزیشکییەکان لە چین وەربگرن، چونکە دەوڵەتانی تر ڕەخنەیان لە ڕێگەکان و دەستبەسەرداگرتنی گرت، هەندێک لە وڵاتانی ئەورووپاش زۆر زیاتر زیاندمەند بوون، بەشێک لە وڵاتانی ئەندام لە یەکێتیی ئەورووپا ناڕەزاییان دەربڕی بەهۆی دواکەوتنی هاوکارییە تەندروستییەکان.

پێشبینی دەکرێت هاوکاری نێوان وڵاتە گەورەکان، کە کۆڵەکەی سەرەکی سیستەمی جیهانین، پلانێکی هاوبەش دابنێن، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو هەڕەشەیەی کە ڕووبەڕووی جیهان بۆتەوە، بۆئەوەی لە کۆنترۆڵکردنی ئەو ڤایرۆسە لە وڵاتەکانیان سەرکەوتووبن، پاشان پێشکەشی ئەو وڵاتانەی بکەن، کە سەرکەوتوو نەبوون لە کۆنترۆڵکردنی ئەو ڤایرۆسە، چونکە هاوکاری وڵاتە پێشکەوتووەکانیان پێ نەگەیشتووە، بەڵام لەبری ئەوە ئاستی ڕەخنەکان و تۆمەتبارکردنەکانی یەکتری لە نێوان وڵاتان بەرزبوویەوە، چونکە هەموو وڵاتێک گرنگی بەناوخۆی خۆی دەدات، دروشمی (جیهان گوندێکە) لە زەوی درا.

ئەوەی زۆر سەرسوڕهێنەرە دەوڵەتە زلهێزەکانی ڕۆژئاوا شکستیان هێنا لەگرتنەبری بڕیاری توند بۆ ڕێگری لە بڵاوبوونەوەی ئەو پەتایە بە فراوانی، ئەو توانا تەندروستییەی هەیانبوو نەدەگەیشتە ئاستی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو پەتایە، ئەو دۆخە کۆمەڵێک پرسیاری خستەڕوو، لە پێشەوەی هەمووان: بۆچی ڤایرۆسی کۆرۆنا بەسەر وڵاتە زلهێزەکاندا سەرکەوت؟ چۆن وا لاواز دەرکەوتن، کە چاوەڕێی بەهێزبوونیان لێدەکرا؟ ئایا ڕەخنە و سەرزەنشتەکان ئاڕاستەی سروشتی سستەمی جیهانی دەکرێت؟ کە لەماوەی دوای هەڵوەشانەوەی یەکێتی سۆڤیەت و کۆتایی جەنگی سارد دروستبوو، کە ئەمەریکا بە تەنها سەرکردایەتی دەکرد و فەلسەفە و ڕێسا و سیاسەتی خۆی بەکارهێنا، پرەنسیپی (New World Order) لەبری (World System) کە زەمەنێک پرەنسیپی کۆتایی مێژوو، هەروەها گۆڕان بەرەو دیموکراسی لیبرالی و باڵادەستی ڕێسای بازاڕ گۆڕینی جیهان بۆ گوندێک باوبوون.

لە ماوەی چەند ساڵی ڕابردوو، جیهانگیری سەرکەوتوو بوو لە تێکەڵکردنی وڵاتان لە ژمارەیەک بوار، گرنگترینیان ئابووریی و تەنکەلۆژیا، بەڵام جیهانگیری سەرکەوتوو نەبوو لە لادانی بەربەستە گرنگەکان، بۆیە ناکۆکییەکان ون نەبوون، کە فاکتەری ئایینی، یاخود ڕۆشنبیری برەوی پێ دەدا، ئەوەش بووە هۆی زیادبوونی ڕێژەی بەریەکەوتنی زۆر لە نێوان بۆنەکان، کە تێیدا شکستی جیهانگیری بە ڕوونی دەردەکەوێت. هەندێکیان بانگەشەی یەک یانەیان دەکرد، وەک ئەو ناکۆکییەی لەناو یەکێتی ئەوروپا ڕوویدا، لەژێر سایەی جیهانگیری هەندێک بەرامبەر هەندێکی تر، شۆڕشی تەکنەلۆژیای پێوەندییەکان، کاری لەسەر ڕووخاندنی دیوارەکان کرد، کە پێشتر وڵاتان بەدەوری سنوورەکانیان کێشابوویان بۆ پارێزگاری لە تایبەتمەندی سیاسیی و ڕۆشنبیری خۆیان، زانیاری و هەواڵ و بابەتەکان لەناو سنوورەکان دەمایەوە، زانیارییەکان دەسەڵاتی ناوخۆی کۆنترۆڵ کردبوو، ئەگەر دەسەڵات ویستی لێبوایە بۆ هاونشتمانیانی بڵاودەکردەوە، هەروەها ئەو ڕێسا و دابونەریتانەی بووە مۆرک و پارێزگاری لێ دەکرا، دیمەنی جیهانی دەرکەوت، وەک ئەوەی دەوڵەتی نەتەوەیی بەرەو نەمان بچێت.

لەگەڵ ئەوەی هەندێک حوکم پێشتر ئاماژەی بۆ کرا، ئاماژەی ڕاستەوخۆی هەبوو، دەڵێین: جیهانگیری نەگەیشتە هەموو ڕۆڵەکانی دەوڵەتی نەتەوەیی، لەو وڵاتانەی کە سستەمەکانیان پابەندی سیستەمی سیاسین و بە دیموکراسی لیبڕالین، سازشی لە هەموو ڕۆڵەکان نەکردووە، پارێزگاریکردن مایەوە لە بەرپرسیارێتی پاراستنی ئاسایش و ڕێکخستنی پێوەندییەکان لە نێوان پێکهاتەکانی کۆمەڵگە و سەرپەرشتی دابەشکردنی داهاتی نەتەوەیی، بەڵام دەکرێت بڵێین پلەی بەڕێوبردنی کاروباری گشتی لە هەندێک بابەتدا لاواز بوو، ئەوەش بووە هۆی بەرزبوونەوەی ڕێژەی بەشداری کارایی ئەوانی تر، بەتایبەت ئەوانەی هێزیان لە دەسەڵاتی ماددی وەردەگرت، ئەمەیش دوای ئەوەی سامان کەوتە دەستی ژمارەیەکی بچووک لە نێوان ئەندامانی دەزگا ئابوورییە گەورەکانی جیهان و قۆرخکاری دەوڵەتی خۆشگوزەرانی لە نموونە جۆراوجۆرەکانی.

بەر لە هاتنی ئەو دیاردە جیهانییە، خۆپڕچەککردن لەسەرەوەی لیستی دەوڵەتانی نەتەوەیی بوو، وڵاتانی پێشکەوتووی تەنکەلۆژیا پێشبڕکێیان بوو لە بواری پیشەسازی چەک، لە بەرامبەردا وڵاتە بچووکەکان پێشبڕکێیان بوو لە سەر کڕینی ئەو چەکانە، ئەو چالاکییەی هەردوولا لەسەر حیسابی بەهێزکردنی بەرنامە و دەزگاکانی تری بەرزکردنەوەی ئاستی ژیانی سەرجەم هاوڵاتییان بوو بەبێ جیاوازی و، دانانی ڕێساکان بوو بۆ دابەشکردنی داهات بەشێوەی دادگەرانە، بۆیە ڕێژەی بێکاری بەرزبوویەوە، چینەکانی کۆمەڵگە لێک دوورکەوتنەوە، ژمارەی هەژاران زیادی کرد، ئەو دیاردەیە تەنیا لە وڵاتە هەژارەکان نەبوو، بەڵکو لەو وڵاتانەش سەریهەڵدا، کە بەسەرچاوەی سروشتی دەوڵەمەندن.

ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا پارێزگاریکردنی لە یەکەم بوون دەدا لەنێو وڵاتە دەوڵەمەندەکان و ململانێی ئەندامانی تری دەکرد، کە ڤایرۆسی کۆڕۆنا لە چین دەرکەوت هاتە پلەی دووەم لەو ناوەندە، سێ مانگ تێنەپەڕی بەسەر بڵاوبوونەوەی بەرفراوانی ڤایرۆسی کۆرۆنا، گۆڕانی بەرپرسیارێتی کەوتە سەر وڵاتە دەوڵەمەندەکان بەتایبەت ویلایەتە یەکگرتووەکان و ئیتاڵیا و ئیسپانیا و ئەڵمانیا و فەڕەنسا و بەریتانیا.

ئەگەرچی پێشبینی دەکرد دەوڵەتە دەوڵەمەندەکان زیاتر لە پێشەوە بن و لێهاتووانە مامەڵە بکەن بەرامبەر ئەو نەخۆشی و کارەساتە جیهانییانەی ڕووبەڕووی جیهان دەبنەوە، ئەوان بەتواناترن لە هاونشتمانیان بۆ پارێزگاریکردن لەو دەرهاویشتە نێگەتیڤانەی لەو ڕووداوە مەترسیدارانە دەکەنەوە، کە لەناکاو ڕوودەدەن، بەڵام ئەو کارە مرۆڤی سەراسیمە دەکرد، چین نزیکەی یەک ملیار و نیو مرۆڤی هەیە، قەبارەی تووشبووانی چین بە بەراورد بە وڵاتانی ئەورووپا زۆر کەمتر بوو، کە پێشتر ئاماژەی بۆ کرا، لە ٢ی نیسان ژمارەی تووشبووان گەیشتە یەک ملیۆن هاوڵاتی و ٥٢ هەزار کەسیش گیانیان لەدەستدا، چین بە نزیکەی (٨٠٪)ی ئەو ژمارەییەی پێکدەهێنا، لەکاتێکدا لە ویلایەتە

یەکگرتووەکان (٢٧٪)، ئیتاڵیا (١٢٪) و ئیسپانیا (١١٪)، بەشداری ئەو وڵاتانە (٦٨٪) بوو، هەروەها ژمارەی مردنیان (٧٣٪) بوو.

ڕووداوە مێژووییەکان بوونە پێشەنگی گۆڕانکاریی دراماتیکی لە هەموو ئاست و فۆڕمەکان، وەک ئایینەکان، کارەساتە سروشتییەکان، جەنگەکان، شۆڕشەکان بە هەموو جۆرەکانی، سیاسی، زانستی و تەکنەلۆژیایی، هەندێک جار فۆڕمی پەتای وەردەگرت، کە ئەمەش ئەو فۆڕمەیە جێگەی گرنگی ئێمەیە لەو بەشدارییە، بۆیە گریمانەی ئەوە دەکەین قۆناغەکانی گەشەکردنی ڤایرۆسی کۆڕۆنا و شێوازی بڵاوبوونەوە و قەبارەی زیانە مرۆیی و مادەییەکانی کە تائێستا بەهۆیەوە دروستبووە، لە داهاتوودا لێکەوتەی دەبێت لەسەر ئاستی تاک و کۆمەڵ و درێژبوونەوەی بۆ سەر بوارە سەرەکییەکانی ژیانی مرۆڤ، بەتایبەت لەلایەنی دەروونی، کۆمەڵایەتی و ئابووریی و سیاسی، هەروەها دەبێتە هۆی دەرکەوتنی دیاردەی نوێ لە سەرجەم ئاستەکان، دەرگای دەکاتەوە لە بەردەم لێشاوێک لە پرسیاری نوێ، کە ڕووبەڕووی بەرپرسانی ئیدارەی گشتی و لێکۆڵەران لە بوارە جۆراوجۆرەکانی مەعریفە دەبێتەوە، کە ڕەنگە وەڵامی پێویستیان لا نەبێت.

**ئاماژە مەیدانییەکان بۆ ئەوەن پەتای کۆڕۆنا شوێنەوارێکی وێرانکەر بەجێدەهێڵێت، هیچ پەتایەکی پێشوو ئەو کاریگەرییەی نەبوو لە جیهان.**

هەروەها کۆمەڵگەکان ناچار دەکات پەنا ببەنەبەر وەڵامدانەوەی ئەنجامی لێکۆڵینەوە زانستییەکان، نەک گریمانە، یاخود پەنابردنە بەر نادیارەکان – غەیبیات -. لەگەڵ ئەوەی لە سەردەمێک دەژین پێشبینی مەعریفەی زانستی پێگەیەکی بەرزی هەیە، تا ئێستا ئەوانەی بانگەشە بۆ ئەو مەعریفە و شەعوەزە دەکەن پێگەی بەرزیان هەیە لە ناوەندە فەرمییەکانی بڕیاردان، بەتایبەت لە ناوچەکانی جیهانی سێیەم، گریمانەی ئەوە دەکەین ئەو کۆمەڵگەیانەی خاوەن ئەدەبیاتی دەستاودەستکردنن، لێکۆڵەرەکانیان پەیوەست دەبن بە ڕێسای توندی میتۆدی زانستی بۆ هەلی تازە لەو چالاکییە ئاراستەکەرەی کە پرسیاری نوێ ڕووبەڕوویان دەکاتەوە، بۆیە هەوڵدەدەین لەم بەشە پێشنیازی لیستێک بکەین، کە ژمارەیەک پرسیاری لێکۆڵینەوەی تێدایە، دەکرێت بخرێتە بەردەم پسپۆڕان لە بواری کۆمەڵناسی و، دابەشی دەکەین بۆ دوو بەش:

١ـ شێوازی مامەڵەی کۆمەڵایەتی و پێوەندی کۆمەڵایەتی.
٢ـ پێوەندی نێودەوڵەتی و سیستەمی نێودەوڵەتی.

یەکەم: گریمانەی گشتی سەبارەت بە شێوازەکانی تێکەڵبوون و پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، کە دەکرێت بەو جۆرە دابڕێژرێنەوە: گۆڕانکاریی ڕیشەیی لە شێوەی بەهاکان و سروشتی پێوەندی کۆمەڵایەتی لە زۆربەی کۆمەڵگەکان ڕوودەدات، لەناو کۆمەڵگەکان لەوانە کۆمەڵگەی عەرەبی، دواتر ئەو پرسیارانەی پەیوەست بەو گریمانەی بە دوا دێت:

١ـ ئامرازەکانی پێوەندی کۆمەڵایەتی ڕۆڵیان چی بوو لە وشیارکردنەوەی هاونشتمانیان لە مەترسییەکانی ئەو پەتایە؟ ئەندازەی گەیاندنی مەعریفەی زانستی و ڕەهەندەکانی تەفسیری نازانستی چەند بوو دەربارەی ئەو پەتایە لە هەموو کۆمەڵگەکان؟ تا چەند ڕۆڵی هەبوو لە هاوکاری نێوان دەزگا ڕەسمی و ناڕەسمییەکانی کۆمەڵگە بۆ جێبەجێکردنی ئەو سیاسەتە ڕەسمییەی دەوڵەت پشتی پێ دەبەست دژی ئەو پەتایە لە ناوخۆی هەموو کۆمەڵگەیەک؟ بۆچی لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی سەرکەوتنێکی بەدەستنەهێنا کە شایەتی باسکردن بێت؟

٢ـ ئایە سەردەکێشێت بۆ بەهای دوورکەوتنەوەی جەستەیی ـ کە زۆر جەختی لەسەر کراییەوە ـ بۆ ئاستێک کە کۆتایی بە هەندێک دابونەریت بهێنێت و بڵاوبوونەوەی دابونەریتی نوێ؟ ئایە دەبێتە گەشەی دابونەریتی (لێک دوورکەوتنەوە و کەمکردنەوەی پێوەندییە نزیکەکان)، پاشان ئەو چینانە چین بە پلەی گەورەتر کاریگەرییان دەبێت؟ ئەو کاریگەرییانە چین لەسەر پێوەندییە کۆمەڵاتییە کلاسیکییەکان لە هەموو بوارەکان لە دەزگای خێزان، پاشان کۆی دەزگا کۆمەڵایەتییە سەرەکییەکانی تر؟ ئایە دەکرێت لێکەوتە نەرێنییەکانی گەشە بکەن و کاریگەری لەسەر پێوەندی بێگانەکان و کەسانێک بکەن کە نایان ناسین؟

٣ـ ئایە دەکرێت تەکنەلۆژیا هاوکار بێت لە کەمکردنەوەی شوێنەوارە نەرێنییەکانی گۆشەگیری کۆمەڵایەتی؟ ئایە دەکرێت تۆڕەکانی تەکنەلۆژیا جێگەی ئاوێتەبوونی ڕووبەڕووی کۆمەڵایەتی بگرێتەوە بۆ هەندێک چین، بەهەمان شێوە بۆ هەندێک بوار، بۆ نموونە کار؟ ئەو نوێگەرییانە چین کە گەشە دەکەن بە ئامانجی قەرەبووکردنەوەی هەڵوەشاندنەوەی زمانی جەستە؟.

٤ـ چۆن دەکرێت ترس لە کۆڕۆنا گەشە بکات؟ ئەو هەنگاوانە چین پێویستە بگیرێنە بەر بۆ چاکبوونەوە؟ تەمەنی چینەکانی کۆمەڵگە و کۆمەڵایەتی لەو بوارە چۆن جیاواز دەبن؟ دەکرێت شوێنەواری تەندروستی لەسەر ئەوانەی لەڕووی دەروونییەوە تەواو نین زیاد بکات؟

٥ـ هەتا چەند تیۆری شەرمکردن (عەیبە) لەسەر چاکبووەکانی ئەو نەخۆشییە جێبەجێ

دەبێت؟ ڕووکارەکانی جێبەجێکردنی ئەو تیۆرە بە دیاریکراوی لە کۆمەڵگەدا چییە؟

دووەم: گریمانەی گشتی سەبارەت بە پێوەندی نێودەوڵەتی، سستەمی گشتی دەکرێت بەو جۆرە دابڕێژرێتەوە: ئایا سروشتی پێوەندی نێوان وڵاتان و بەهەمان شێوەی گرووپە نێودەوڵەتییەکان دەگۆڕێت؟ چ ڕەنگدانەوەی دەبێت لەسەر سستەمی نێودەوڵەتی بە هەردوو ڕەهەندی سیاسیی و ئابووری، هەندێک لەو پرسیارانەی پەیوەستن بەو گریمانەیە؟

١ـ ئەو پەتایە چۆن کاری لەسەر بەهێزکردنی ڕۆڵی دەوڵەت کرد؟ ئایا دەبێتە هۆی گێڕانەوەی خۆشگوزەرانی ئەو وڵاتانەی کە گرەویان لەسەر ڕۆڵی بازاڕ دەکرد؟ چارەنووسی چینە هەژار و پەراوێزخراوەکانی کۆمەڵگە چین؟

٢ـ ئایە چین سوود لەو سەرکەوتنە وەردەگرێت کە بەدەستیهێنا لە زاڵبوون بەسەر کۆڕۆنا بە بەراورد بە دەوڵەتە بەهێزەکانی ڕۆژئاوا، بە مەرجێک تەنیا لە هێزی ئابووریی و سەربازیدا کورت نەبێتەوە، بەڵکو سەربکێشێت بۆ هێزی ڕۆشنبیریش، بەجۆرێک ببێتە دەوڵەتی باڵادەستی جیهان، ئەو جێگەیە بگرێتەوە کە ساڵانێکی زۆرە ئەمریکا  پیادەی دەکات.

٣ـ چ ڕوانگەیەکی سیستەمی نێودەوڵەتی لە داهاتوو گەشە دەکات؟ دۆخی چینایەتی چۆن دەبێت؟ ئەو گۆڕاوانە چین کە کاریگەری بەهێزتریان دەبێت لە پێشخستنی وڵاتان بۆ ناوەندی سەرکردایەتی دواخستنی ئەوانەی تر؟

٤ـ جیهانگیرییەکی نوێ چۆن بونیاد دەنرێت، بە مۆرکێکی مرۆیی، بە جۆرێک کار لەسەر کەمکردنەوەی سەرچاوەکانی ناکۆکی بکات، کە دەبێتە هۆی ململانێی نێوان کۆمەڵگەکان و کار لەسەر بەهێزکردنیان بکات، بۆ ئەوەی هاوکاری لەسەر پرەنسیپی یەکسانی بێت، لەبری شێوازی باڵادەستی، ڕێزگرتنی فرە ڕۆشنبیری لەبری هەڵوەشاندنەوەی فرەیی لە بەرژەوەندی یەک ڕۆشنبیری دیاریکراو؟

٥ـ چۆن دەکرێت سیستەمی دیموکراسی گەشەی پێ بدرێت و لە کەم و کوڕییەکانی دیموکراسی لیبراڵی پاک بکرێتەوە و پلەی بەشداری سیاسی بۆ هاونشتمانان بەرزبکاتەوە، ئایا دوای بنیاتنانی گرێبەستی کۆمەڵایەتی نوێ، ڕۆڵ و کاریگەری کارای دەبێت لە دەرەوەی دەوڵەت بۆ بەشداری هەردوو پرۆسەی لێپرسینەوە و پرسیار لێکردن لەسەر کەم و کوڕییەکان؟



لەتیف حسێن

# میدیا و قەیرانی تەندروستیی کۆرۆنا بەنموونە...

## دەستپێك:

نەخۆشی کۆرۆنا ساڵێکی تێپەڕاندووە و هێشتا نەتوانراوە وەك پێویست کۆنترۆڵ بکرێت و ترس و دڵەڕاوکێی خەڵکی لە بەرامبەر مەترسییەکانی بەردەوامە، لای هەمووشمان ئاشکرایە کۆرۆنا نەك تەنها هۆکارێك بووە بۆ لەدەستدانی ئازیزانمان و ماندوکردنی ژمارەیەکی زۆری خەڵکی ئەم جیهانە، بەڵکو کاریگەریشی لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووری و تەنانەت سیاسیشمان هەبووە و ئاسەوارەکانیشی تا هەنووکە بەردەوامە و ناشزانرێت ئەم کاریگەریی و ئاسەوارانە تا کەی بەردەوام دەبن.

لەم سۆنگەیەوە جگەلە لایەنە تەندورستییەکەی، کە پزیشکان و توێژینەوە پزیشکییەکان ئەرکی سەرشانیان زۆرجار بە زیادیشەوە بەجێهێناوە و بەردەوامیش ئەرکیان قورستر دەبێت لەوەی کە هاونیشتمانی هۆشیار و ئاگاداربکەنەوە، بۆئەوەی ئەم نەخۆشییە نەبێتە هۆی ئەوەی کە بەتەواوەتی ژیان بوەستێ، لەلایەکی تریشەوە ئەرک و زۆر بواری گرنگی تری ژیانیشی دەرخست بۆئەوەی بتوانرێت مرۆڤایەتی پێکەوە بتوانن هەوڵەکانیان چڕبکەنەوە تا بە زووترین کات ئەم پەتاو نەخۆشییە لە ژیانی مرۆڤایەتی بە یەکجاری دووربخەنەوە، ئەگەرچی تا ئێستاش بەشێک لە ڕاپۆرت و توێژینەوە زانستییەکان لە بواری پزیشکیی و ئابووریی و کۆمەڵایەتییەوە ئەوەیان دەرخستووە، کە لە ئیدارەدانی ئەم قەیرانەدا کەموکوڕیی و کەمتەرخەمی زۆر هەبووە و نەتوانراوە وەک پێویست و وەک خۆی بەبێ ئەوەی مەترسییەکان زیاد بکرێن یان کەم بکرێن، خەڵکی لە پەتای کۆرۆنا ئاگاداربکەنەوە بۆئەوەی بتوانن خۆیانی لێ بپارێزن و کەمترین زیانمان پێ بگات، ئێستاش بەپێی ئەو ڕاپۆرتە پزیشکییانەی کە بەردەستن و بەپێی ئەو هەوڵە بەردەوامانەی کە دەدرێن بۆئەوەی لە ڕێی پێکوتەوە کۆرۆنا بە یەکجاریی کۆتایی پێ بهێنن، هێشتا ئەرکمان زۆرە بەوەی کە کۆمەڵێک ڕێوشوێنی زۆرمان لەبەردەمدا ماوە کە بگیرێنەبەر، بۆئەوەی هاوڵاتیان بە جددی لە ئاست ئەم پەتایەدا وەک خۆی مامەڵە بکەن.

ئەوەی کە جێی سەرنجە و بەشێکی کەموکوڕیی و کەمتەرخەمییەکانی دەکەوێتە ئەستۆ، میدیایە، میدیا بەو مانایەی کە لەکاتی سەرهەڵدانی پەتاکە لە مانگی ١٢ /٢٠١٩ تا بڵاوبوونەوەی تا بە ئێستا دەگات کە پێکوتەکەی لە بەشێک لە وڵاتانی دونیادا بەردەستە بەشێوەی سنووردار، چۆن و بە چ شێوازێک ڕۆڵی هەبووە، ئایا ڕۆڵێکی نێگەتیڤ و خراپی هەبووە یان نەخێر ڕۆڵی ئیجابی و باشی هەبووە و لەڕێی میدیاوە خەڵکی هۆشیارییەکانی پێدەگەیشت، بێگومان ڕۆڵی میدیاش لەم پێناوەدا دەکرێت بە چەند قۆناغێکدا دابەش بکرێت بۆئەوەی بتوانرێت ڕوونتر لە پێگە و ڕۆڵی میدیا لە قەیرانی تەندروستیدا کۆرۆنا بەنموونە تێ بگەین، قۆناغەکانیش بەتایبەتی لە کوردستان، قۆناغی سەرەتای پەتاکە و دواتر قۆناغی ناوەندی پەتاکە کە بەتەواوەتی دەگاتە کوردستان لە ناوەڕاستی مانگی دووودا، دواتر قۆناغ و سەردەمی دۆزینەوەی پێکوتەی(ڤاکسین).

### میدیا و سەرەتای سەرهەڵدانی کۆرۆنا لە کوردستان

پزیشکێکی دەروونی لە سەرەتای هاتنی ڤایرۆسی کۆرۆنا و بڵاوبوونەوەی لە کوردستان، لەسەر ڕۆڵی میدیا دەڵێت: میدیا لە کوردستان خەڵکی کردووە بە گیسکەکەی هەیاسی خاس، بەسەرهاتی ئەم گیسکەی هەیاسی خاسیش هەموو خەڵک دەیزانێت، تۆ تەماشا بکە هەندێک لە میدیاکان من و تۆ ئەبەن بۆ سەر شاشەکانیان تا ئێوارە بە خەڵک

دەڵێین کۆرۆنا جددیە و دەبێت خۆمانی لێ بپارێزین، دوای ئێمە خەڵکی تر دەهێنن یان پەیامنێرەکەیان دەخەنە ناو خەڵک و قسە دەکەن و دەڵێن کۆرۆنا نییە و فشەیە و پێویست بە ترس ناکات، ئەمە وایکردووە بینەر و بیسەر بخاتە ناو بەرداشێکەوە و نازانێ بە کێ باوەڕ بکات، ئەمکارەی میدیا کە دەیکات بە پێدانی زانیاریی هەڵە و قسە و لێدوانی جیاواز و دژ بەیەک، گومانی لای خەڵک لەسەر کۆرۆنا زیاتر کردووە و بەجۆرێکە نازانێت کامە زانیاریی ڕاستودروستە و بە گوێی کێ بکات، سەرلەبەری هەموو ئەو قسەوباسانەی، ئەو پڕوپاگەندانەی لەم سەردەمی کۆرۆنایەدا بڵاوکرانەوە خەڵکیان بەجۆرێک لێکرد کە نەزانن چۆن مامەڵە لەگەڵ خۆیی و دەوروبەر و خێزانەکەشی بکات.

ئەگەر بەوردی بە ئەرشیفی میدیاکاندا بچینەوە تەنانەت هەندێ لە میدیا جیهانییەکانیش، ئەوەت بەرچاو دەکەوێت کە بەرکەوتنی میدیا و کۆرۆنا هەتا ماوەیەکی درێژ بەرکەوتنێکی خراپ و ناتەندروست بوو، کە ڕەنگە یەکێک لە هۆکارەکانی چۆنێتی سەرهەڵدان و شۆکبوونی خەڵک و میدیاکانیشی لە پشتەوە بێت، هەربۆیە نەتوانرا تا ماوەیەکی درێژ لەبری پیادەکردنی بڵاوکردنەوەی هۆشیاریی و خۆپارێزی خەڵکی، ترساندنی خەڵکی بۆ خۆپارێزی گیرایەبەر و تەنانەت بەشێکی زۆری شاشەی تیڤییەکان لەکاتی هەواڵ و ڕاپۆرت و کارە میدیاییەکان تەنها دەموچاوی بێژەرەکە دیاربوو، چونکە سەرپای شاشەکە لێوانلێو بوو لەو هێڵە سوورانەی کە قەڵەمی ئەژنۆی وەرگری دەشکاند، پڕبوون لە هەموو هەواڵە بەپەلە و خێرا و نها و ئێستاکان، کە نەک هەر نەیتوانی خەڵکی هۆشیار بکاتەوە و خۆپارێزی بڵاوبکەنەوە، بەڵکو بوونە هۆی زیاتری بێ متمانەیی خەڵک بەرامبەر بە پەتایەک کە دونیای هێنایە سەر چۆک..

بەداخەوە بەشێک لەو بێ متمانەییە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو مامەڵەیەی کە هەندێک لە میدیاکان لەگەڵ ئەو نەخۆشیی و پەتایەدا کردیان، تێکەڵکردنی بە ئەجێندای حزبیی و سیاسی و بڵاوکردنەوەی ڕاو سەرنجی هەندێ کەسایەتی سیاسی حزبیی و بەکارهێنانی دژی دەسەڵات و حکومەت و ئەو بارە ناهەموارەی کە لەوکاتەدا باڵی بەسەر ژیانی خەڵکیدا کێشابوو، هەروەها مامەڵەکردنێکی زۆر خراپ بە چاوی شارچێتی و دروستکردنی جیاوازی لە نێوان تاک و هاوڵاتیانی شارە جیاوازەکان، نیشاندانی ئەم پەتایە وەک بابەتێکی دوو ئیدارەیی و دوو زۆنی و زۆر ڕێگەی تر خراپ، کە بۆ هەر یەکێکیان دەیان نموونەی جیاواز جیاواز هەن، کە هەر یەکێکیان ئەو ڕۆحییەتەی دروست دەکرد کە خەڵکی لە شایێکی تر پێی خۆش بێت لە شارەکەی تردا ئەم پەتایە زۆر بڵاوببێتەوە و خەڵکی زۆریش بەداخەوە گیان لەدەست بدات...

**ڕەنگدانەوەی سیاسەت..**

(سلێمانی لە تووشبوون و هەولێر لە مردن لە پێشەوەن)، ئەمە یەکێکە لەو نموونانەی کە لەناو هەواڵ و ڕووماڵە میدیاییەکانی میدیای کوردیدا خرانەڕوو کاری لەسەر دەکرا، بەدرێژایی هەموو ئەو ماوەیەی کە کۆرۆنا وەک پەتایەکی جیهانی ڕووی لە هەرێمی کوردستان کرد، بەداخەوە ئەگەرچی کۆرۆنا ئەزموونێکی نوێی کارکردنی میدیای کوردی دەرخست و ئەو ئەزموونە نوێیەش هەتا ماوەی چەند مانگێک ئەزموونێکی تاڵ و خراپی نیشاندا و هەندێ لە میدیا جگە لە وێنەی ترس و تۆقاندن و شڵەژانی زیاتری باری دەروونی خەڵکی لە مامەڵەکردن لەگەڵ پەتا و نەخۆشییەکی وەک کۆرۆنا وێنەیەکی تری نیشان نەدا، لەکاتێکدا دەبوو ئەزموونی میدیا لەگەڵ کۆرۆنا ئەزموونێکی باش و تەندروستانە بوایە، لەبەرئەوەی کە ئەم بابەتە پەیوەندی بە تەندروستی خەڵک و گشتەوە هەیە و تەندروستی جەستەیی و دەروونتدروستی دەبوو ئەولەویەتی کارکردنی بوایە...

دابەشبوونی میدیا بەسەر زۆنی سیاسیدا تا ئاستێکی بەرچاو کاریگەری کردووەتە سەر مەودای بیرکردنەوە و کارکردنی میدیا، بەتایبەتی کەناڵە ئاسمانییەکانی لە فەزای خەمی گشتیی و بەرژەوەندیی نیشتمانیی بچووککردووەتەوە بۆ ئاستی کەناڵی ناوچەیی و خەمی گەڕەک و ناحیە و قەزا.

هەندێ پرسی لاکۆڵان هەن هیچ بەهایەکیان بۆ بینەری کورد نییە، بەڵام سیاسەتی وەبەرهێنانی سیاسیی و موزایەدە پێوەکردنی بوونەتە هۆکاری هێنانە بەرباسیان و ڕوئیای بینەریان بچووککردووەتەوە بۆ ئاستی ماڵی خۆیان و دوو ماڵ ئەولاتر..

لەسەروبەندی قەیرانێکی تەندروستی گەورە و جیهانیدا مامەڵەی سیاسیی و حزبی و پیادەکردنی بڵاوکردنەوەی ترس بەمەبەستی خۆپارێزیی و بڵاوکردنەوەی لێدوان و قسەی جیاواز جیاوازی بەرپرسە حزبیی و سیاسییەکان بەجۆرێک کاریگەریی و ڕەنگدانەوەی خراپی هەبوو، کە ببووە هۆی زیاترکردنی بێ متمانەیی خەڵک و گوێ نەدان بە ژیان و تەندروستی خۆی، هەروەک چۆن بەپێی لێدوانی بەشێکی زۆر لە پزیشکان و بەرپرسانی وەزارەتی تەندروستی ئەو بێ متمانەکردنەی خەڵکی وەهای کرد کە کۆنترۆڵکردنی پەتاکە کاتێکی زۆری پێویست بێ و خەڵکێکی زۆریش بکاتە قوربانی، بۆیە ئەم ئەزموونە نوێیەی میدیا لەگەڵ پەتا و نەخۆشی کۆرۆنا و قەیران و کێشەی تەندروستی بەشێوەیەکی گشتی مامەڵەیەکی ناتەندروستانە بوو لە ڕووماڵی پرسێکی تایبەت بە تەندروستی گشتی، ئەمە جگەلەوەی ڕووماڵ و ڕاستەوخۆکانی بەشێک لە میدیاکان نەک نەیدەتوانی خەڵکی ئاشنا بکات بە نەخۆشییەکە و هۆشیاریی و خۆپارێزییەکان بڵاوبکاتەوە، بەڵکو بەجۆرێک بوو ترس و تۆقاندنەکان هەندێکجار ئامارەکانی بەرزتر دەکردەوە، ئەمە سەرباری ئەوەی ئەم مامەڵە ناتەندروست و ڕۆحی

شارچێتی دروستکردنە بوو، کە هەندێک لە خەڵک کۆرۆنای وەک کاڵایەک بۆ پارە پەیداکردن لەلایەن حکومەت و دەسەڵاتەوە دەخوێندرایەوە، لەکاتێکدا کۆرۆنا تەنگی بە ئەمریکا و وڵاتانی زلهێزی دونیا هەڵچنی بوو، بەڵام لای ئێمە ئەم مامەڵە ناتەندورستە وایکرد کە خەڵکی ئەم خوێندنەوەیە بکات کە کۆرۆنا بۆ وەرگرتنی پارە و نەدانی مووچە و خراپترکردنی ژیانی خەڵکی لەلایەن حکومەتەوە بەکار بهێنرێت، بۆ ئەمەش ئەگەرچی هۆکارەکان زۆرن و بارودۆخەکەش یارمەتیدەری ئەو دەنگۆیانە بوون، بەڵام میدیاش نەیتوانی ئەو ڕۆڵە گرنگە ببینێت کە دەبوو لەکاتی قەیرانەکاندا هەی بێت و دەرچەیەک بێت بۆ ڕزگارکردنی خەڵکی، نەک هەر ئەمەی نەکرد، بەڵکو مامەڵەکردنی میدیا گەیشتە ئەو ئاستەی کە لە سەردەمی کۆرۆنادا بەهۆی قسەی میدیاکارێک یان هەواڵ و ڕاپۆرتی میدیایەکەوە قەیرانی بەنزین دروست ببێت لەکاتێکدا بەنزین وەرگرتن و خەزنکردنی کەسی لە کۆرۆنا نەپاراست، ئەمە جگە لە دروستکردنی قەرەباڵغی ناو مارکێتەکان و هەوڵدان بۆ دروستکردنی قەیرانی کەمبوونی خۆراک و دەیان نموونەی بەرچاوی تر کە لەم بوارەدا بەرچاو دەکەون...

**هەر لە سەرەتاوە لە هەرێمی کوردستان شپرزەییەک بە کاروباری ئیداریی و ڕێکارە تەندرووستییەکانەوە دیاربوو، تا چەند مانگێك دوای سەرهەڵدان و بڵاوبوونەوەی پەتاکە لە کوردستان.**

کۆرۆنا، وەک هەر پەتایەکی دیکە، ئەگەر بە قسەی هەندێک بێت ئەمڕۆش چارەسەری نەبێت، عەقڵی داهێنەرانەی مرۆڤدۆستانەی زانایان دەستەوەستان نییە لە ئاستیدا. ئەگەر کەشوهەوا و ژینگەی ژیانی پانتاییەکی دیاریکراو زەمینەی بۆ سەرهەڵدان و گەشەکردنی خۆشکردبێت، کات ناوەستێت و گۆڕانی کەشوهەوا ئەو زەمینە لەبارەی لەبار دەبات و ئەوەتا خۆشبەختانە تا ئێستا(٦) پێکوتەی جیاواز بۆ ئەم پەتایە دۆزراوەتەوە و پەیتا پەیتا وڵاتانی جیهان بەشێوەی سنووردار بەکاری دێنن، ئەوەی دەمێنێتەوە مامەڵەی لایەنی ڕەسمی و پەیوەندیدارە بەو پرسەوە. هەر لە سەرەتاوە لە هەرێمی کوردستان شپرزەییەک بە کاروباری ئیداریی و ڕێکارە تەندرووستییەکانەوە دیاربوو، تا چەند مانگێک دوای سەرهەڵدان و بڵاوبوونەوەی پەتاکە لە کوردستان، بە تایبەتی دوای ئەوەی کۆرۆنا گەیشتە ئێران، ئیسرائیل، ئیمارات و لوبنان. هەرچەند هەوڵەکان بەردەوامن و ڕێنمایی

هەن و وەزارەتی تەندروستی چاوکراوەترە لە ئاستی قەیرانەکەدا، بەڵام هێشتا کات ماوە بۆئەوەی دادوەری لەسەر ڕۆڵ و ئەزموونی لە بەرەنگاربوونەوەی ئەو پەتایە بەشێوەیەکی یەکلاکەرەوە بکرێت و دەبێت توێژینەوە و لێکۆڵینەوەی وردی زانستی لەمبارەیەوە لە داهاتوودا بکرێت. لەکاتی ڕوودانی قەیراندا هەندێک ئاماژە و پێودانگ هەن پێویستە میدیا و دامەزراوە دەوڵەتییەکان لەبەرچاویان بگرن بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ قەیرانەکاندا، لەوانە:

١- پێویستە دامەزراوە ڕەسمییەکان بەوپەڕی وردیی و ڕوونییەوە، پێویستی میدیا لە ڕووی زانیاری و ڕاستییە بەرجەستەکان دابین بکات، بۆئەوەی دەرفەت بۆ دزەکردنی هەواڵی ناڕاست نەخوڵقێت.

٢- ڕاگەیاندنی ئامار و زانیارییەکان بەشێوەیەکی ڕوون و ڕێگە نەدان و بوار نەهێشتنەوە بۆ شێواندن و بە هەڵە ڕاڤەکردنیان.

٣- لەکاتی ڕوودانی هەڵەدا، پێویستە دامەزراوەکان دان بە هەڵەدا بنێن بۆئەوەی متمانە و ڕاستگۆیی لەدەست نەدەن، بەتایبەتی لە گواستنەوەی زانیاریدا و خستنەڕووی هۆکاری ڕوودانی هەڵەکان بە ڕوونی باس بکەن، چونکە نکوڵیکردن و دواتر دەرکەوتنی ڕاستییەکان، متمانە لای ڕای گشتی ناهێڵێت.

٤- میدیا دەبێت دوای دڵنیابوونەوە زانیاری بڵاوبکاتەوە و نەکەوێتە ژێر کاریگەری باری سۆزدارییەوە. لە سەرچاوەی ڕەسمی ناسراو، زانیاری وەربگرێت و بڵاوی بکاتەوە. ناکرێت کەسی نەناسراو، سەرچاوەی نادیار، پەیج و ئەکاونتی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان ببنە سەرچاوەی سەرەکی زانیاری.

٥- پێویستە دامەزراوەکان بەوپەڕی دڵنیایی و متمانە و ڕاستگۆییەوە وەڵامی پرسیاری میدیا بدەنەوە و ڕای گشتی لە نوێترین زانیاریی و ڕێککارەکانیان ئاگادار بکەنەوە.

٦- دامەزراوە ڕەسمییەکان دەبێت بە زمانی زانیاریی و دڵنیایی تەواو ڕەوش و پێشهاتەکان بخەنەڕوو.

٧- پێویستە میدیا پشت بەلایەنی پەیوەندیدار و بەرپرسی ڕاستەوخۆ ببەستێت. دامەزراوە دەوڵەتییەکانیش ناکرێت هەرکەس لای خۆیەوە زانیاری بداتە میدیا و دەکرێت حکومەت ژوورێکی عەمەلیاتی تایبەت پێکبهێنێت و ئەو ژوورە ببێتە زمانحاڵ و سەرچاوەی یەکەم و دوایەمین زانیاری لەبارەی قەیرانەکەوە. نەک وەک ئەوەی ئێستا هەیە، هەر بەڕێوبەری بنکە و مەرزێکی سنووریی و هەر کامەندێکی تەندرووستی لە شوێن و پێگەی خۆیەوە لێدوان دەدات.

٨- لەگەڵ بڵاوکردنەوەی زانیارییە نوێیەکانی تایبەت بە نەخۆشییەکە، گرنگە میدیا ڕێنمایی تەندرووستی و شێوازی خۆپارێزی فێری خەڵک بکات و کارێک بکات هاوڵاتی ژێرخانێکی مەعریفی بۆ دروست ببێت بۆ خۆپاراستن نەک تەنها لەم پەتایە،

بەڵکو گۆڕینی نۆرمی ژیان و هەڵسوکەوتی ڕۆژانەی بە ئامانجی دروستکردنی کۆمەڵگەیەکی پاکتر و تەندروستتر.

٩- یەکخستنی گوتاری دامەزراوە دەوڵەتییەکان و ڕاستەڕێ کردنی ئەرک و بەرپرسیاریێتی دامەزراوەکان بەرامبەر بە میدیا و هاوڵاتیان بە ئامانجی ڕێگرتن لە سەرلێشێوان و تێپەڕاندنی ئەو شپرزەییەی هەیە.

١٠- میدیا پێویستە ڕێگر بێت لە بڵاوبوونەوەی واتەوات و پڕوپاگەندە و هەواڵی هەڵبەستراو و ڕێگە بەخۆی نەدات ببێتە پاشکۆی پەیج و ئەکاونتی بەکارهێنەرانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان و ڕۆڵی سەرکردایەتیکردنی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان بگێڕێت، نەک لەپێناو لایک و کۆمێنت ببێتە پاشکۆی ئەو تۆڕانە و زیان لە متمانەی خۆی لەلایەک و ئاستی مەعریفی وەرگرانی لەلایەکی دیکەوە بدات و ببێتە مایەی درووستکردنی پشێویی و تێکدانی ئاسایشی دەروونی تاک و ئاسایشی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگە.

**خزمەتکردنی پرۆژەیەکی تایبەت**

دیوێکی دیکەی ئەم قەیرانە، مامەڵەی میدیای کوردیی و بەکارهێنەرانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانە لەگەڵ حاڵەت و بارودۆخە نوێیەکە. سەرچاوەی یەکەم و سەرەکی میدیای کوردیی بۆ وەرگرتنی زانیاری، ئاژانس و سەرچاوە خۆرئاواییەکانە، جا لە دەستی یەکەمەوە بێت یان لە دەستی دووەمەوە بێت. لەوەشدا ئەگەر هەیە میدیای خۆرئاوا بەمەبەست قەبارەی قەیرانەکەیان گەورەتر لە ئەندازەی خۆی پیشاندابێت و بەشێکی زۆری هەواڵ و زانیارییەکانیان برژێتە خزمەتی پڕۆژەی سیاسیی و ئابووری جیهانی سەرمایەداری خۆرئاواوە دژی ئابووریی و پیشەسازی چین. بەداخەوە میدیای کوردی زۆربەی جار پەلەیەتی بۆ گەیاندنی نوێترین ئاماری تووشبووان، قوربانیانی ڤایرۆسەکە. هەواڵی تۆمارکردنی حاڵەتی کۆرۆنا لە بەریتانیا و ئیتاڵیا، چارەکی هەواڵی تۆمارکردنی چەند حاڵەتێک لە شاری قومی ئێران کاریگەری نەبوو. میدیاش هێندەی لەسەر نەڕۆیشت، وەک ئەوەی بڵاوبوونەوەی هەواڵی تۆمارکردنی حاڵەتەکان لە ئێران کاریگەری بەجێهێشت. سەدای بڵاوبوونەوە و تۆمارکردنی حاڵەتەکان لە خۆرئاوا هێندە نایەتە بەر گوێ.

بەکارهێنەرانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لە باشترین حاڵەتدا ڕەنگە کۆپی پەیستی هەواڵ و زانیاری سەرچاوەکان بکەن، لەبارە خراپەکەدا پشت بە زانیاری بێ بنەما دەبەسترێت. بەگشتی ئەو تۆڕانە ژینگەی لەبارن بۆ بڵاوبوونەوەی، پڕوپاگەندە، واتەوات، هەواڵی ساختە و هەڵبەستراو، کە لە ڕێگەیانەوە کاریگەری گەورە لەسەر ڕای گشتی و ئاسایشی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگە و ئاسایشی دەروونی تاک دروست دەکەن.

بەگوێرەی زانستی دەروونزانی و پرسی شەڕی دەروونی، لە سەردەمی ڕووداوی

گەورە و باری نائاسایی و کارەساتدا، ژینگەیەکی لەبار بۆ بڵاوبوونەوەی دەنگۆ و پڕوپاگەندە دەڕەخسێت. ئەمەش ئەرکی دامەزراوە ڕەسمییەکان قورستر دەکات. بۆ پێشگیری لەو ڕەوشە نوێیە پێویستە میدیا و دامەزراوە دەوڵەتییەکان هاوئاهەنگانە هەنگاو بنێن و میدیا بەرپرسیارێتی ڕەوشە نوێیەکە بگرێتە ئەستۆ و نەکەوێتە سەنگەرگرتنەوە.

لە ئێستاشدا کە بەشێکی زۆر لە وڵاتانی جیهان خەریکی هەڵمەتی کوتانن دژی پەتای کۆرۆنا، کەچی ناوبەناو بەشێک لە میدیاکان لە هەندێ سەرچاوەی نادیار، یان لە سەرچاوەی گوماناوییەوە، بەبێ پشتبەستن بە لێکۆڵینەوە و توێژینەوە پزیشکییەکان، کەوتوونەتەوە بڵاوکردنەوەی ترس و دووبارە سەرهەڵدانەوەی نەخۆشییەکی نوێ، لەکاتێکدا بەشێک لە توێژینەوەی ناوەندە ڕەسمی و تەندروستییەکانی جیهان سەرهەڵدانی پەتای نوێ و کوشندەبوونی ڕەتدەکەنەوە و ڤاکسینەکانی ئێستاش بە لەناوبەری ئەم ڤایرۆسەش دەزانن سەرباری ئەوەی هەندێک بە ڤایرۆسی نوێی دەبینن، تائێستاش لە هەندێ میدیاوە هەواڵ و ڕاپۆرتی جیاجیا لەسەر ئەمە بڵاودەکرێتەوە و بەتایبەتی خەریکە سەرکەوتنی ڤاکسینەکەش لای خەڵکی دەخەنە ژێر پرسیارەوە، لەمبارەیەوە ئەگەر بە وردی دیقەت بدەین، ئەوەت بۆ دەردەکەوێت کە میدیا زۆربەی جار لە گەیاندنی هەواڵدا تووشی هەڵەی گەورە دەبێت و خەڵکی دەخاتە دڵەڕاوکێ و مەترسی زۆرەوە، بەڵام لە پاش دڵنیابوونەوە و پاش وەختە ئەنجا دەردەکەوێ کە هەڵەی کردووە، بۆ نموونە هەتا چەند مانگێک لەمەوبەر هەندێک لە میدیاکان هەواڵە سوورەکانیان بریتی بوو لە سەرهەڵدانی نەخۆشییەکی تری کوشندە کە لە ئاژەڵی (مینک)ەوە لە دانیمارک سەریهەڵداوە، یەکسەر پاش ماوەیەکی کەم هەرچی ئاژەڵی ناوبراو هەبوو لەناوبران، بەپێی هەندێک سەرچاوەی هەواڵی جیهانی، ئێستا دەرکەوتووە کە حکومەتی دانیمارک پەشیمانە لەوەی ئەو کارەی کردووە، چونکە دەرکەوت ئەو نەخۆشییە بوونی نەبووە، بۆیە مەرج نییە لە پەلەکردن لە هەواڵدا و یەکەمبوون لە گەیاندنی هەواڵ بە خەڵکی دەرخەری گرنگی ئەو میدیایەت بۆ دەربخات، بەڵکو گرنگی میدیا لە ڕاستگۆبوون و متمانەبووندایە لەکاتی گەیاندنی هەواڵێک بە خەڵکی.


**سەرچاوەکان**

١. دیمانەیەکی د. کەریم لە سایتی چاودێر..

٢. کتێبی: ژیان لە سەردەمی کۆرۆنا.

٣. میدیا و بەرپرسیارێتی کۆمەڵایەتی.

٤. ئەرسەلان ڕەحمان: ئەرکی میدیا لەکاتی قەیراندا.

٥. سایتی وەزارەتی تەندروستی و بەیاننامەکانی ناوخۆ و تەندروستی.

ئامادەکردنی: گۆڤاری خاڵ

# جەستە و دەروون
## دوو شتی تێکهەڵکێشراون
## لاری هەریەکێکیان دەبێتە
## هۆی تێکچونی ئەوی تریش




لەم دیدارە چڕوپڕەدا دکتۆر ڕێدار محەمەد ئەمین پسپۆڕی نەخۆشییە دەروونیەکان، بەگوشراوی وەڵامی کۆمەڵێک پرسیاری (خاڵ)ی تایبەت بە دەرکەوتەکانی پەتای کورۆنا دەداتەوە، وەڵامەکان هەرچەندە کورتن، بەڵام قووڵ وپڕ مانان.

**پ/ زانایانی دەروونناسی چۆن دەڕواننە دیاریدەیەکی لەو شێوەیە(کۆرۆنا)، پێناسەیان بۆ ئەو جۆرە دیاردەیە چیە؟**

و/ دەروونناسان دەڵێن هەر مەترسی و هەڕەشەیەک لەناکاو بێت، چاوەڕوانکراو نەبێت، زانیاری تەواوت لەسەر نەبێت ئەوا کاریگەری لەسەر باری دەروونی مرۆڤ زیاترە و ترسی زۆرتر دروست دەکات، چونکە کۆرۆناش بە ماوەیەکی کەم و چاوەڕوان نەکراو هەموو دونیای تەنیوە و کەمترین زانیاری زانستیشمان لەسەری هەبوو ئەوا چاوەڕوانکراو بوو ترسێکی زۆر دروست بکات.

**پ/ کۆرۆنا سەرباری زیانەکانی ئێستای بەسەر مرۆڤایەتی لە ڕووی ئابوورییەوە، هەروەها کاریگەری بۆ سەر داهاتووش دەبێت، ئەی لە داهاتوودا لە ڕووی دەروونییەوە چ لێکەوتەیەکی دەبێت؟**

و/ هەر دوو مانگ دوای بڵاوبوونەوەی بە هەموو جیهان و ناساندنی وەک پەتایەکی جیهانی لە ٢٠٢٠/٣/١١ پزیشکانی دەروونی بەریتانی پێیانوابوو دوای کۆرۆنا تسۆنامییەکی دەروونی جیهان دەگرێتەوە، ڕاستیەکەشی هەروابوو، چونکە لە ٢٠٪ی ئەو کەسانەی تووشی کۆرۆنا بوون لە دوای چاکبوونەوە تووشی چەندین جۆر لە گرفت و نەخۆشی دەروونی بوون.

**پ/ چ پێوەندییەک لە نێوان لایەنی دەروونی خودی نەخۆشەکان هەیە، بەتایبەتیش تووشبوون بە کۆرۆنا، تا چەند لاوازی دەروونی دەبێت هۆی زیادبوونی نەخۆشییەکان؟**

و/ جەستەو دەروون دوو شتی تێکهەڵکێشراون و لاری هەر یەکێکیان دەبێتە هۆی تێکچوونی ئەویتر، ئەگەرچی کۆرۆناش هێشتا بە پەتایەکی تازە دادەنرێت و زۆرترین کاریگەری لەسەر جەستە هەیە، بەڵام جگە لەم ترس و تۆقینەی دروستیکرد، هۆکاری تریش هەبوون ببنە هۆی سەرهەڵدانی گرفتە دەروونییەکان، ئەوەی تێبینی کرا، زۆرینەی ئەوانەی گرفتی دەروونیان هەبوو، پێشتر ئەم گرفتەیان هەبوو، بەڵام هەندێکیش هەبوون کەوا بۆ یەکەمجار تووشی کێشەی دەروونی دەبوون.

بێگومان لاوازی بەرگری دەروونی هۆکارێکە بۆ تووشبوون بە نەخۆشییە دەروونییەکان، بەڵام زۆرجار خودی کەسەکە خۆی نازانێت چەندە لاواز یان بەهێزە تاکو تووشی نەخۆشییەکە نەبێت، نموونەی نەخۆشێکم هەیە کەوا هەمیشە خۆی بە کەسێکی ڕاگر و ورە بەرز و بەهێز دەبینی، کەچی لە بەردەم کۆرۆنا چۆکی دادا و تووشی دڵەڕاوکێ و ترسی زۆر بوو.

**پ/ بڵاوکردنەوەی وێنە و ناوی مردووانی تووشبوو بە ڤایرۆسی کۆرۆنا لە تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان چ کاریگەریەکی لەسەر دەرونی ئەوانەی تووش بوون و ئەوانەشی کە هێشتا تووش نەبوون هەیە؟**

و/ بەداخەوە لە وڵاتی ئێمە لەسەر ئاستی تاک و دەزگای میدیای فەرمیی و نافەرمی زۆر نابەرپرسانە مامەڵە لەگەڵ ئەم پرسە دەکرێت، وای لێهاتووە کەناڵەکانی سۆشیال میدیا بوونەتە (پرسەخانە)، لەکاتێکدا سۆشیال میدیا زیاتر بۆ زاخاوی مێشک و پشوودانە!

بێگومان ئەمەش کاریگەری لەسەر دەروونی ئەوانەی تووشبوون و تووش نەبوون هەیە، تۆ بێنە بەرچاوت وا دەڕۆیتە بازاڕ و بە سەدان دوکان لافیتەی ڕەشیان هەڵواسیوە، چ هەستێکت لا دروست دەبێ؟ ئەی ئەگەر هۆکاری ئەم مردنانە نەخۆشییەک بن تۆش تووشی بووبیت.

**پ/ لەڕووی دەروونییەوە ڕاگەیاندنەکان تا چەند توانیویانە هاوکاری خەڵک بن بۆئەوەی بتوانن کەمێک لەباری دەروونییان سووک بکەن؟**

و/ بەشێوەیەکی گشتی ڕاگەیاندنی کوردی لەسەر وروژاندن کار دەکات، لای گرنگ نییە دەرەنجامی کارەکەی بە کوێ دەگات، گرنگ ئەوەیە بینەری هەبێت، من دەپرسم لە سەدان کەناڵی کوردی چ کەناڵێک ڕاوێژکاری دەروون، کۆمەڵایەتی، خێزانی هەیە؟ چ کەناڵێک هەوڵیداوە لە پرسە هەستیارەکان دوای ئەوانیتر نەکەوێت و وەک چاولێکەری هەمان هەڵە دووبارە نەکاتەوە؟ تەنانەت هەندێک کەناڵ ئەوەندە لوتیان بەرزە، گوێ بە ئامۆژگاری بێ بەرامبەریش ناگرن...!

وەک پسپۆڕانی دەروونی هەر لە سەرەتاوە باسی ترسناکی شێوازی ڕووماڵکران و هەواڵ گواستنەوە ئەوەمان دەکرد، هیچ ئامادە نەبوون گوێمان بۆ شل کەن، دوای چەند مانگێک ئەنجا زانیان چ هەڵەیەکی گەورەیە بەردەوام خەڵک لە ڕاڕایی و ترس بژی.

**پ/ ئەو میکانیزمانە چین کە پێویستە مرۆڤ بیگرێتە بەر بۆ کەمکردنەوەی فشارە دەروونییەکانی کە بەهۆی ئەو ڤایرۆسەوە دروست دەبن؟**

و/ هەروەک لە سەرەتادا باسم کرد، ئەو هەواڵەی لەناکاوە، پێشبینی نەکراوە و کەمترین زانیاریمان لەسەری هەیە زۆرترین فشار دروست دەکەن، کەواتە هەر کە زانیارییەکان زیاتر بەردەست بوون، و هەواڵەکە درێژەی کێشا و پێشبینی کراو بوو ئەوا لە کاریگەری ترس و فشار کەمتر دەکەنەوە، بۆ نموونە کاتێک زانیمان بەستنی ماسک و دوورکەوتنەوە ڕێگایەکی کاریگەرە بۆ خۆپاراستن، و مەرج نییە هەموو کەسێک بە توندی نەخۆشییەکە بگرێ و ڕێژەیەکی کەم دەمرن و چاوەڕوانی چارەسەریی و ڤاکسین بووین فشارەکان کەمتر بوونەوە، ئەمە جگە لە ستراتیژییە گشتییەکانی کەمکردنەوەی فشار وەک وەرزشی سوک، خواردنی تەندروست، یۆگا، خوێندنەوە ... هتد، کاریگەری زۆریان لەسەر کەمکردنەوەی فشار دەبێت.

پێچەوانەی ئەوانە، فشار و ترس بە بەردەوامی سەیرکردنی هەواڵی تۆقێنەر زیاتر

دەبێت، سەیرکردنی سۆشیال میدیای پڕ لە هەواڵی مردن و ئەو کەناڵانەی کەوا شانازی بە ترساندنی خەڵک دەکەن!

**پ/ لە چ دۆخێک ترسان لە کۆرۆنا پێویستی بە چارەسەری دەروونی دەبێت؟**

و/ ئەو بانگەشەیەی ئایین بۆ پرسینی حاڵی یەکتر، بەتەنگەوەهاتن و یارمەتیدانی یەکتر ئەمانە هەمووی وەک چاکەیەکی دونیا و قیامەتی هەژمار بکرێت ئەوا هاندەرێک و پاڵپشتییەکی گرنگە بۆ کەسی لێقەوماو، چ کەسی یارمەتیدەر.

لە کۆمەڵگایەک کەوا لەیەکترازەوە و کەس مافی بە سەر کەسی ترەوە نییە و تاکگەرایی زاڵە (Irdividualism)، ئەوا زۆر بەڕوونی هەست بەو کەلێنە دەکرێ، لەوێ کەسەکان لە یەکتر دوورن و کەم ئاگایان لە یەکترە، لەکاتی پەتایەکی وەک کۆرۆناش مەودای نێوان کەسەکان دوورتر دەبێتەوە، بەمجۆرە تاکی کۆمەڵگای پێشکەوتوو لە بازنەیەکی بەتاڵ و فشار و دڵەڕاوکێدا دەژی.

ئاین کە هەمیشە هانی یارمەتیدانی یەکتر دەدات، تارادەیەکی زۆر ئەم کەلێنەی پڕ کردووەتەوە. لەسەر ئاستی تاکیش ئایین ڕۆڵی هەیە، ئەنجامدانی نوێژ (٥) جار لە ڕۆژێک و ویرد و دوعا و پشتبەستن بە پەروەردگار و بڕوا بوون بە قەزا و قەدەری خوای گەورە فشاری زۆر لەسەر کەسی ئیماندار کەم دەکاتەوە، حاڵەتی (سایکۆیس) تۆمارکراوە.

**پ/ ئایین تا چەند دەتوانێت ڕۆڵ ببینێت لە کەمکردنەوەی فشارە دەروونیەکان کە بەهۆی ئەو جۆرە پەتایەوە دروست دەبێت؟**

و/ جاران دەروونناسان پێیانوابوو ئاین هۆکارێکە بۆ خراپکردنی باری دەروونی کەسەکان، چونکە ئەو کەسە پشت بە هێزێکی دەرەکی دەبەستێت و هەوڵنادات خۆی خۆی چارەسەر بکات، بەڵام لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم ئەو بڕوایە گۆڕا، چونکە ئەمجارەیان دەروونناسان دەیانگوت ئەو کەسەی بڕوای بە هێزێکی سەروو هەیە، ئەوا هەموو ئەندامی جەستە و حاڵەتی دەروونی پشت بەو هێزە دەبەستن، بۆیە پۆزەتیڤانەتر بیر دەکاتەوە، بەمەش بەرگری دەروونی و جەستەیی زیاتر دەبێت.

گوڵنار

دەمەتەقێی گرووپی گوڵنار لەگەڵ

دکتۆر فەهمی عەلی عەزیز

لە بارەی فرەڕەهەندی و لێکەوتە جیاوازەکانی

# پەتای ڤایرۆسی کۆرۆناوە



سرووشتی دەروونی و کۆمەڵایەتیی مرۆڤ وایە، هەمیشە لە دیدگەی جیاواز و هەستیارەوە بۆ بابەتە هەڕەشەئامێزەکانی سەر ژیانی دواوە. جار هەبووە زیادەڕۆیی کردووە، هەندێجار کەمڕۆیی و، هەندێجاریش بێباک بووە و پەراوێزی خستوون. دەرەنجامیش یان پێکاویەتی یاخود بە هەڵەدا ڕۆیشتووە. ئیتر ئەم چیرۆکە، بە درێژایی ژیان و ژیاری مرۆڤایەتی بەردەوام بووە و، هەر وایش دەڕوات. بابەتێکی وەکو پەتای کۆرۆنا و هاوشێوەکانی تری لە دیاردە زەمینیی و مرۆییەکان، زۆر قووڵ و ئاڵۆز و ئاوکێشە. قووڵ، چونکە ڕیشەدارە و درێژکراوەی زەمەنێکی پێش خۆیەتی بە هەموو ڕەهەندەکانی ژیانی مرۆڤەوە. ئاڵۆزە، چونکە فرەلایەنە و پەیوەندیی ڕاستەوخۆ و ناراستەوخۆی بە زۆر پنتی تری ژیانی مرۆڤەوە هەیە، واتە تەنها بابەتێکی پزیشکیی پەتی نییە. ئاڵۆزە، چونکە دیاردەیەکی زیندووە و هێشتا لەناودایە و پریشک و لێکئاڵۆسکانی زۆری هەیە و لە هەموویشی گرنگتر، داهاتووەکەی ڕوون نییە.

بۆیە قسەکردن لەسەر بابەتگەلێکی ئاوها، ئاتاجی بە هەستیاری و مەعریفە و شارەزاییەکی مەوسووعیی فراوانەوە هەیە. ئەمەیش کارێکی زەحمەتە و ڕەنگە دەرەنجام، هەموو لێدوان و کۆڵینەوەیەک لەسەر ئەم بابەتە تەنها بەشێکی ڕاستییەکە لە خۆی بگرێت، یان رەنگە هەر هەڵەیش دەرچێت، بەم بۆچوون و دەربڕینانەی منیشەوە، گونجاوتر وایە بڵێم سەرنجدانەکانم، چونکە بۆچوون، بەرپرسیارێتییەکی گەورەتری ئەخلاقی و پسپۆڕێتییە و ڕەنگە بە من هەڵنەگیرێت، بەڵام لانیکەم دەتوانم سەرنجی فرەڕەهەند بدەم، بە گوێرەی ئەو زانیاری و تێگەیشتنەی کە هەمە. بەڵام گرنگترین کۆڵەکەی باسکردن لە هەر بابەتێک، زانستیبوون و دڵسۆزی و ئامانج یان مەبەستگەلێکی ڕوونن لای کەسی قسەکەر.

* سەرەنجام دەکرێ ماکینەی جووڵاندنی هەموو ڕەهەندەکانی کۆرۆنا، سیاسەت بێت
* کۆرۆنا زۆر گۆڕانکاریی لە بواری فیکریی و کەلتوورییدا کردووە.
* هەندێ بیریاریی ڕۆژئاوایی بە گشتی، بە جۆرێک لە جۆرەکان دانیان بەوەدا نا کە سەرمایەداری بەم فۆڕمە فەشەلی هێنا.
* کۆرۆنا بووە دەرچەیەک کە سیستەمی سەرمایەداری دەستی فریاگوزاری ڕابکێشێت بۆ ئیشتراکییەت.
* کە شارەزاییت لە ڕەهەندی ئایینیی هەبوو، وەک پزیشکێک کە قسەتکرد هەندێ هەڵە هەیە نایکەیت یان بە پێچەوانەوە.
* فەرمانڕەوایەکی عاقڵ و بیرتیژی وەک ئیمامی عومەر، کە فیکری بۆ کەرەنتینەکردنی خەڵک چووبێت، بێگومان بیریشی لە هەڵوەشاندنەوەی پەرستشە کۆمەڵکارییەکان کردووەتەوە، چونکە لە ڕووە شەرعییەکەوە زۆر شارەزا بووە، بۆ ئەوەی بەریەککەوتنی کۆمەڵایەتی ڕوونەدات!

* تۆ سەرنج بدە چ بڕیارێکی سیاسیی و ئابووری دەیتوانی مەراسیمی حەج بگۆڕێ و لای ببات؟ کەس نەیدەتوانی. چ کارەکتەرێک هەبوو لە جیهاندا جورئەتی ئەوە بکات کە بڵێت نابێ لە دونیادا نوێژی جومعە و جەماعەت بکرێ؟! کەچی ڤایرۆسێک هات و بە ویستی خۆت ئەو بڕیارەی لا دروستکردی و مەلا و زاناکان خۆیان چوونە سەر مینبەر و داوایان دەکرد کە خەڵک نەچێتە پەرستشە کۆمەڵکارییەکانەوە.
* کۆرۆنا هەندێ چەمکی فیقهیشی گۆڕی، مرۆڤی هێنایەوە بەرەو زیاتر تاکپەرستیی و خودیی، واتە پەرستشی نێوان خۆت و خوا.

**گوڵنار: سەرەتا وەک دەسپێکێک لە بارەی ڤایرۆسی کۆرۆنا، قسەی جەنابتان چییە؟**

د. فەهمی: کۆرۆنا، خۆی نە ڕەشەباکەیە، نە زریانەکەیە، نە پاڵنەری زریان و ڕەشەباکەشە. کۆی ئەو تێگەیشتنەی تا ئێستا لە کۆرۆنا باسکراوە لە هەموو ڕەهەندەکانەوە. بە کورتییەکەی کێچێک بوو گەورەکرا! ئەگەر گەورەش نەکرایە، هەر خۆی کۆمەڵێک زەڕرە و پووش و پارچەی ناو زریانەکە دەبوو، دەهات و تەواو، بەشێک دەبوو لە زریانێکی گەورە، چونکە هەر هەبووە و هەر دەشبێت لە ئێستا و داهاتووشدا. بە کوردییەکەی زیاد لە قەبارەی خۆی درایێ و گەورەکرا. یان دەتوانین بڵێین (لەیبلینگ)ی پێکرا، واتە شتی تری پیاساورا و شتی تری پێوە نووسێنرا. گوتیان: کۆرۆنا هۆکارەکە بوو، کۆرۆنا وایکرد، کۆرۆنا ئەم شتەی گۆڕی، کۆرۆنا ئەنزیمەی سیاسیی گۆڕی، کۆرۆنا فیکری زانستی پزیشکی گۆڕی، کۆرۆنا ئابووری جیهانی گۆڕی. لە کاتێکدا ئەمانە هەموویان نسبی بوون و هیچیان بە تەواوی وا نەبوون! ئەسڵەن کۆرۆنا خۆی بەرەنجام بوو، ئەوەی کە تا ئێستا وێنەکەی ڕوونبووەتەوە. مرۆڤایەتی خۆی پێش کۆرۆناش لە کولاندا بوو، دۆخی کۆمەڵایەتیی و سیاسیی و ئابووریی لە کولاندا بوو، بارودۆخی مرۆڤایەتی شلۆق و ناجێگیر بوو. ئەمەیش نەبووایە، بەدیلێکی ئەمە هە ڕووی دەدا.

**گوڵنار: کە وایە کۆرۆنا دەرچەیەک بوو بۆ خۆخاڵیکردنەوە؟**

د. فەهمی: ئەگەری زۆرە.

گوڵنار: کە وایە کێ ئەم کێچەی گەورە کرد و بەرژەوەندییەکەشی لە چیدا بوو؟

د. فەهمی: هەموومان بەبێ جیاوازی بەشداربووین لە گەورەکردنیدا، ناکرێ بە تەنها (چین و ئەمریکا) یان هەر لایەکی تر تاوانبار بکەین. ڕاستە ڕۆڵ هەیە لەوەی کە پشکی شێر بەر کێ دەکەوێ کێ کەمتر. بەڵام سەرەنجام هەموومان بەپێی سەنگ و پێگەی خۆمان بەشدار بووین تێیدا. من و تۆش کەم تا زۆرێک بەشدار بووین تێیدا، من وەک دکتۆرێک کە بەشداریی بەرنامە تەلەفزیۆنییەکانم دەکرد لە سەرەتای هاتنی کۆرۆناوە، بەشداربووم لە گەورەکردنی کۆرۆنادا. بمانەوێ و نەمانەوێ، منیش و تۆیش بووینە بەیدەقێک لە شەڕەکەدا، جا ئیتر بە هەر ئاراستە و مەبەستێک بووبێت. ئەمەیش نەنگی

نییە، چونکە مرۆڤ کائنێکی کۆمەڵایەتییە و دابڕاویش نییە لە دیادە کۆمەڵایەتییەکان. بەڵام دەکرێ وڵاتێک و کەسێک پشکی گەورەتری بەرکەوتبێ و کەسێکی تر کەمتر. بە کورتییەکەی بە شیکاری مێژوویی، کۆرۆنا دیاردەیەکی زۆر ئاسایی بوو، هیچ نائاساییبوونێکی تێدا نەبوو. لەبەر ئەوەی نمونەی زۆر لەمە گەورەتر و قورستر هەبووە لە مێژوودا، حاڵەتی زۆر ناخۆشتر هەبووە لە مێژوودا. لە سەدەی چواردەدا کاتێک کە (تاعوونی ڕەش) دێت و نزیکەی دووسەد ملیۆن کەس لە ئاسیا و باکووری ئەفریقا و ئەورووپا لەناو دەبات، ئەم میدیا و سۆشیالمیدیا زەبەلاحە بوونی نەبوو تا وەک کۆرۆنا گەورەی بکات. ئەسڵەن تێڕوانینی مرۆڤی ئەو کاتە جیاوازتر بوو لە تێڕوانینی مرۆڤی ئەم سەردەمە بۆ هەمان مەسەلە.

**گوڵنار: تەنانەت قوربانییەکانی نەخۆشیی دڵ و کۆئەندامی هەناسە و ڕووداوەکانی هاتوچۆ زۆر زیاترن لە ڕێژەی مردن بە ڤایرۆسی کۆرۆنا، بە تایبەت ئەگەر ئەو تووشبووە هۆکارێک لە هۆکارەکانی نەبووبێ بۆ مردنەکەی!**

د. فەهمی: با جارێ ئێمە پێش ڕووداو نەکەوین، چونکە وەک دەڵێن لەناو کەوانەیەکدا (کۆرۆنا لە گۆڕاندایە). کۆرۆنا هێشتا کۆتایی نەهاتووە و ئەم زنجیرەی درامایە هێشتا ماویەتی.

**گوڵنار: کە وایە با لە ڕەهەندە جیاوازەکانەوە قسە لەسەر کۆرۆنا بکەین.**

د. فەهمی: کۆرۆنا فرەڕەهەند بوو، دەکرێ لە ڕەهەندە جیاوازەکانەوە قسەی لەسەر بکەیت، ئەوسا دەکرێ شتێکت گوتبێ، دەبێ لە ڕەهەندی پزیشکییەوە قسەی لەسەر بکەیت کە شارەزاییت هەبێ، دەبێ شارەزاییەکی زۆر باشت لە لایەنە پزیشکییەکەی خودی ئەم پەتایە هەبێت. ئەگەر شارەزاییەکی باشی ئەم بوارەت نەبێ، من ناڵێم دەکەویتە هەڵەوە، بەڵام سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی مەعریفەی کۆی پرۆسە و حاڵەتەکەت نییە.

**گوڵنار: کە وایە با سەرەتا باس لە لایەن و ڕەهەندی پزیشکی کۆرۆنا بکەین.**

د. فەهمی: سەرنج بدە ئەوانەی قسە لەسەر کۆرۆنا دەکەن و باکگراوندێکی پزیشکییان هەیە، یا بیرمەند و پرۆفیسۆری بوارەکەن، قسەکانیان جۆرێک لە هێز و قووەی تێدایە، یا قسەکانیان بەهێزترن (ئەم قسەیەش ڕێژەییە). چونکە ئەو کەسە دەزانێت دەڵێت چی. هابەرماسی فەیلەسووف و کۆمەڵناسی ئەڵمانی دەڵێت: « ئەم پەتایە پێیی وتین کە دەبێ پیاچوونەوەیەکی بنەڕەتی بە چەمکی ئەخلاق و کەلتوور و ڕۆشنبیری و هەڵسوکەوت و هاوسەنگی و یەکسانیدا بکرێ». چونکە دەرکەوت هێشتا زۆر کرچوکاڵین، تەبعەن ئەو فەیلەسووفە قسەی زۆر جوان دەکات لەسەر مەسەلە و ڕەهەندە سیاسیی و ئەخلاقییەکانی ئەم گرفت و پێشهاتە. بەڵام ئەو زیاتر جەخت لەسەر شتێک دەکاتەوە کە تا ڕادەیەک پەیوەستە بە خۆیەوە، تۆ ببینە کاریگەری تەمەن چەند زۆرە لەسەری، (هابەرماس) خۆی تەمەنی هەیە، بۆیە دەبینی بەرگری لە تەمەنی خۆی و لە پیرەکان

دەكات، چونكە كاتێك ئەم پەتایە هات و خەڵك هەر لە خۆوە قسەی لەسەر دەكرد، دەگوترا: «تەواو بە یەكجاری پیر لەناودەبات و ئەوانەی كە بە تەمەنن دەبێ زەنگی كۆتایی تەمەنیان لێبدرێ و خۆیان بۆماڵئاوایی ئامادە بكەن، بەڵام كاریگەری زۆر كەمی لەسەر مناڵ و گەنج هەیە»! ئەڵبەتە ئەمە شتێكی زۆر نائەخلاقیی بوو كە میدیای جیهانی تێیكەوت و بەداخەوە زانستی پزیشكییش بوو بە چەك و دەسكەلایەك بە دەست ئەم بۆچوونەوە و دڵی زۆر بە تەمەن و پیری پێ ڕەنجێنرا و ئێشێنرا! لە كاتێكدا دەركەوت زیاتر خەڵكی ئاسایی و تەمەن مامناوەندی دەكوشت بە بەراورد بە پیرەكان. (هابەرماس) دەڵێت: «پزیشك بە چ حەقێك ماف بە خۆی دەدا كە كێ ئەولەوییەتی ژیانی هەیە؟» چونكە ئێمە (وەك پزیشك) لە نەخۆشخانەكاندا، لە كۆی ئەم پەتایە نەخۆشەكانمان لەسەر كۆمەڵێك بنەما جیاكردبوویەوە، بۆ نمونە: بنەمای تەمەن، بنەمای ڕەگەز و زۆر شتی تر. لە چارەسەریشدا ئەمە زۆر ڕەنگی دابوویەوە، بۆ نموونە تۆ ئەگەر نەخۆشخانەیەكت هەبێ، جێی تەنها پەنجا نەخۆشی تێدا ببێتەوە، ئەولەوییەت دەدرێ بە مناڵ و ژن و گەنج، جیاواز بە پیرێك! ئێتر ئەمە سوننەتی ژیانە و وایە، تەبعەن ئەمە لە فەلسەفەی ئەخلاقدا بەمە دەڵێن: «العمل العقلانی الامعقول». ئیشێكی عەقڵانی ناڕەوا.

> **ئەگەر كەسێك تووشە كۆرۆنا بێت، دوو هەفتە تا مانگێك دەناڵێنێت بەدەستییەوە، پاشتر چاك دەبێتەوە. بەڵام ئەگەر تووشی تۆقان و نەخۆشییەكی دەروونی ببێ بەهۆی ئەم حاڵەتەوە، ئەوا تەمەنێك پێیەوە دەناڵێنێ.**

ئەم میتۆدە زۆر ژیرانەیە، بەڵام زۆر نائەخلاقییانەیە. لەسەرێكیشەوە ئەخلاقییە، بەڵام بە فۆرم و ڕواڵەتی ببینن، ئەوەی كە ئێمە دەیبینین، ئەمە شتێكی نائەخلاقییە. بە كورتییەكەی دەڵێ: «ئەولەوییەت بۆ مناڵ و ژن و گەنجە, وەك لە پیر». ئەگەر دەرمان هەبێت و بدرێت بەو سێ چینە، پاشتر ئەگەر مایەوە دەبێ بدرێت بە پیرێك. ئەمە لە ڕووە مۆراڵییەكەیەوە شتێكی جوان نییە، بەڵام شتێكی لۆجیكیشە و ئیشی لەسەر دەكرێت. هەڵە نەبم لە مێژووی یەكێك لە جەنگەكانی سەردەمی (ئیبنوتەیمییە)دا بووە، هەواڵ دەبرێتەوە بۆی دەڵێ: «جەیشێكی موسڵمانان هەیە ژمارەكەی نزیكەی چوارسەد كەسە؟، لە بەرەی جەنگدان لەگەڵ ڕۆمەكاندا، ئێمە بۆ ئەوەی شكست بە بەرەی بەرامبەر بێنین، دەبێ قوربانی بدەین بۆ شتێكی گەورەتر، ئێمە چی بكەین بۆ ئەوەی ئەو سوپایەی ڕۆم

تێکبشکێنین، وە ڕێگرێ هەیە لە بەردەمماندا و سوپای موسڵمانان گیریانخواردووە، ئێمە چی بکەین؟» ئەویش فەتوا دەدات و دەڵێت: «قەیچییەکا، با ئەوەندە سوپا بکوژرێت، گرنگ ئەوەیە ئەنجامی گشتی و سەرەکیی جەنگەکە لە بەرژەوەندی ئێمەدا بێت»! ئەمانە پێیاندەگوترێت: «بیانووهێنانەوەی لۆجیکی بۆ شتێکی گەورەتر». لە کاتێکدا خۆی ئەسڵی ئیشەکە خۆی نائەخلاقییە، بەڵام بەرژەوەندییەکەی زۆر گەورەترە. ئەگەر باسی ئەخلاقییاتی ئەم پەتایەی کۆرۆنا بکەیت و زانستی پزیشکب و لایەنە پەیوەندیدارەکانی وەکو ئیدارە و ئابووری و ئەم شتانە، زۆربەی زۆریان لە ڕەوتە ئەخلاقییەکە لایان دا، بەوەی کە بە پیریان گوت: «ئیتر تۆ بمرە و تەواو». سەرۆکوەزیرانی ئیتالیا و بەریتانیا چوونە سەر شاشەی تەلەفزیۆن و گوتیان: «خۆتان حازربکەن بۆ خواحافیزی لە خۆشەویست و ئازیزەکانتان»! ئەم قسەیە زۆر ناشیرین بوو، ئەم قسەیە لە ڕووە دەروونییەکەیەوە پەتایەکی تری بڵاوکردەوە، کە بریتیبوو لە پەتای «تۆقاندن»! خەڵک هەبووە بە نەخۆشی «تۆقان» تووشی کەئابەی زۆر بووە و خۆی کوشتووە، لە کاتێکدا کۆرۆناکە دوو هەفتە پێیەوە دەمایەوە و لە کۆڵی دەبووەوە. یان لای خۆمان دەیانگوت: «دەبێ هەر ماڵێک یەکێک لە دۆستەکانی ئامادە بکا بۆ مردن»، تۆ لەم حاڵەتەدا بیر دەکەیتەوە لەوە دەچێ تۆ یەکێک بیت لەوانەی کە دەمرن. تۆ سەرنجی ئەم دۆخە دەروونییە شڵەژاوە ناجێگیرە بکە چەندە ناخۆشە! کێ ئەمەشی بڵاوکردەوە و ئەم قسەیەی کرد؟ ئەوانەی کە حوکمی جیهان دەکەن و لۆجیک و ئەخلاقیان بەدەستەوەیە.

**گوڵنار: بەڵام بۆچی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی، کاتێک دابەش بووە بەسەر دوو بەرەی (ئەمریکا – چین، ڕۆژئاوا – ڕۆژهەڵات، ئیسلام – دژەکانی) بەڵام هەموومان بەم شەپۆوری شەڕ و تۆقاندنە کەوتینە سەما و هەمووومان یەکدەست گەشتینە ئەو قەناعەتەی کە بەڵێ کۆرۆنا گەورەیە و پێویستە هەمووومان گەورەی بکەین و لێی بترسین و خۆمان بۆ مەرگی کۆرۆناوی ساز بکەین؟**

د. فەهمی: سەرەتای هەموو ئەزمەیەک، بە تایبەت لەم سەردەمەدا کە سەرزەوی قەرەباڵغ بووە لە چاو جاراندا، هەڵەی زۆر ڕوو دەدەن، تەکنیکی و هەڵەی تێگەیشتنیش. ئاخر کۆرۆنا خۆی سێ چوار مانگ نەبوو هاتبوو، جاری وا هەیە تێگەیشتن لە سولالەیەکی ڤایرۆس چەند ساڵێکی دەوێ. کەچی لای ئێمە لە سێ مانگدا هەموو شتێکیان گوت. بۆیە ئێستا کەوتووینەتە ڕاستکردنەوەی ئەو هەڵانەی کە گوتبوومانن، وە تازە پینەیش ناکرێ، چونکە هەڵەی زۆر گەورە کران. وە ئەم هەڵەکردنەش وانەی زۆر جوانی تێدایە. چونکە بە دڵنیاییەوە ئەمە کۆتا پەتا نابێ، دەکرێ پەتای  زۆر قورستر و کوشندەتریش بەڕێوەبێ، چونکە ئەمە دیاردەیەکە کە نائاسایی نەبووە، بەڵام فووی زۆری تێکرا، ئەگەرنا نائاسایی نییە و پەتایەکە و هاتووە، قەیچییەکا با ئەمەش ماوەیەکی تر بخایەنێت، یا با

سەد ملیۆن مرۆڤ لەناوبەرێ، درووستە کە ئەم قسەیە ناخۆشە و مۆراڵی نییە، خۆ پەتا ئیسپانییەکەی ساڵی ١٩١٨ نزیکەی پەنجا ملیۆن مرۆڤی لەناوبرد و ئەو دەنگدانەوەیەشی بۆ درووست نەکرا. هەڵەی زۆرمان کرد، هەر کەسە و لە دیدگای خۆیەوە و بەپێی بوارەکەی خۆی باسی کرد، سیاسیی، کۆمەڵایەتی، پزیشکی، ئایینی، زانستی، سەربازی... هتر. بەڵام دواتر یەکێک لەوانەی کە باجی ئەو هەڵەگوتنانەی دا کێ بوو؟ بێگومان دەروونی مرۆڤ بوو! ئەوەی  تا ئێستا دەرکەوتووە ڕێژەی کوشتنی کۆرۆنا بە نزیکەیی لە سەدا دووە، کە دەگونجێ لەوەش کەمتر یان زیاتر بێت. وە زانستی پزیشکیش یەکێک بوو لەوانەی کە خیلاف و ناڕاستگۆییەکی زۆری لەسەر ئەم ڤایرۆسە هەبوو، چونکە قسەی زۆری لەسەرکرد،  منیش وەک پزیشکێک پاش ئەوەی کە لەو مەسەلەیە دەردەچم، وەکو خەڵکێکی ئاسایی بڵێم ئەوە نەبوو، چونکە ئەوەندە شتی لەسەر دەگوترێ، لە کاتێکدا شتەکە هەیە و بوونی هەیە، نەخۆشی و ڤایرۆسەکە هەیە. بەهەرحاڵ لە سەرەتاوە هەڵەی زۆرمان کرد، هەمووومان لە هەموو ڕوویەکەوە قسەی زۆرمان کرد، وە چاوەڕێمان نەکرد تا لێڵی ئاوەکە نەمێنێت و پاشتر قسەی لەسەر بکەین. گرنگ ئەوەیە سوود لەو هەڵانە وەربگرین.

مەبەستیشم لەم قسانە ئەوە بوو، ئەگەر نەخۆشێک بەهۆی ڤایرۆسەکەوە تووش ببێت، دوو هەفتە تا مانگێک دەناڵێنێت بەدەستییەوە، پاشتر چاک دەبێتەوە. بەڵام ئەگەر تووشی تۆقان و نەخۆشییەکی دەروونی ببێ بەهۆی ئەم حاڵەتەوە، ئەوا تەمەنێک پێیەوە دەناڵێنێ، بە تایبەت ئەگەر بگاتە نەخۆشی تۆقین یا ئەوانەی کە پێیاندەگوترێ (PTSD) پاش زەبری توندی دەروونی، بە تایبەت ئەوانەی لە ناکاو تووشی شۆک و سەدمەیەک دەبن، یا هەواڵێکی کتوپڕ دەبیستن، ئەگەر بکەوێتە سەر دەرمانخواردن، بە لانی کەمەوە دەبێ شەش تا نۆ مانگ خەریکی دەرمانخواردن بێت. لە کاتێکدا من باسی لایەنی گشتیی دەروونیی خەڵکی ناکەم کە چەندە ڕووخاوە، باسی لایەنی دەروونی کەسێک دەکەم کە دەبێ دەرمان بخوات. بۆیە ئەگەر کۆرۆنا بێت، ئەوا کەمتر لە مانگێک پێیەوە دەمێنێتەوە، بەڵام ئەگەر ببێت بە نەخۆشی دەروونی ئەوا بە لانی کەمەوە شەش مانگ یا نۆ مانگ و بگرە زۆرجار زیاتریش پێیەوە دەمێنێتەوە. ئێمە وەک پزیشکی دەروونی بەردەوام ئەو حاڵەتانەمان دیتووە، کە مرۆڤەکە کۆرۆنای گرتبوو، هەر ئاگای لێی نەبوو، یا چاک بووبووەوە، بەڵام وا ترسێنرابوو، چەند مانگێک حەب و دەرمانی دەخوارد، ژیانی تێک چووبوو.

کە لە سەرەتاوە گوتم: تێگەیشتن لە لایەنی پزیشکی زۆر گرنگە بۆ کۆرۆنا، بۆ ئەوەی ببێتە دەسکەلایەکی باش بۆت، بۆ ئەوەی بتوانی لە لایەنە فیکریی و فەلسەفیی و کۆمەڵناسیی و ئابوورییەکەیەوە قسەی لەسەر بکەیت، چونکە بەڕاستی گرنگە، ئەگەر

تۆ زانیت ئەم ڤایرۆسە چییە و کاریگەرییەکەی لەسەر مرۆڤ چییە؟ ئیتر تۆ تا ڕادەیەک دەزانی حاڵەتەکانی تریش چین و دەتوانی لێیان تێبگەی. تەبعەن لەم بابەتەدا تێگەیشتن لە هەموو ڕەهەندەکان بەیەکەوە زۆر گرنگە و زۆر قورسیشە. چونکە بە هەموویانەوە یەک پاکێج دروستدەکەن و لە کۆتادا یەک وێنەی جوانی دیاردەکە دەدەن بەدەستەوە و لێی تێ دەگەین.

**گوڵنار: کە وایە با سەرەتا لە ڕەهەندی ئایینییەوە قسە بکەین، یا ئایین چ ڕۆڵێکی هەبوو لەم ڤایرۆسەدا؟**

د. فەهمی: ڕەهەندی ئایینی لەگەڵ فەلسەفەی زانستدا، یا لەگەڵ ڕەهەندە زانستییەکەدا، لە هەندێ شوێندا ڕۆڵی خراپیان بینی. لە هەندێ شوێندا شاخیان گیراند لە یەکتر، وە لە هەندێ شوێنیشدا ڕۆڵی جوانیان بینی. ئەگەر دیقەتتان دابێت دوو بەرە دروستبوو، بەرەی زانستیی و بەرەی ئایینی. زانستگەراکان دەیانگوت: «تەواو ئەمە زەنگی کۆتایی و مەرگی ڕووحانییەت و خودایە، ئەگەر نەبێ بە قسەکەی نیتچە (خودا مرد)، ئەمانیش هەمان قسەیان بە فۆرمێکی تر دووبارەکردەوەن گوتیان: ئیتر تەواو دین کۆتایی هات. ئێستا مەیدانی ئێمەیە و فەرموون بزانین ئێوە بە دوعاکانتان چیتان پێ دەکرێ؟!» ئەمە قسەی بەرەیەک بوو، بەڵام نەک بەم زمانە ڕاستەوخۆ و بێ گرێ و گۆڵە، بەڵام ناڕاستەوخۆ دەیانویست ئەم پەیامە بگەیەنن. لە بەرامبەریشدا دیدگا ئایینییەکە قسەی خۆیانیان هەبوو، پێچەوانەی قسەی بەرەی زانستگەراکان بوو، دەیانگوت: «ئەمە کۆتایی شاخی زانست بوو، ئیتر عیلم گلۆڵەی دەکەوێتە لێژی و بەرەو خوارەوە و کۆتایی دەچێت و دەستەوەستانە. دەبێ دوای ئەمە ڕوو بکەینە خوا»! بەڵام لە نێوەندەیشدا هەڵوێستی نامۆ بینرا، کەسی عەلمانیی و چەپ و سەرۆکوەزیرانی ئیتالیا و بەریتانیا دەیانگوت: «داوا دەکەین لە کڵێسا و مزگەوتەکان و ئایینزاکان کە دوعا بکەن، ئێمە ئیفلاسمان کرد و هیچمان پێنەما»!

**گوڵنار: دەکرێت ئەمە بە جاڕی دەستەوەستانی زانست دابنێین بەرامبەر بە ئایین، کاتێک لوتکەی دەسەڵاتی چەند وڵاتێک داوای ڕووکردنە ئایین و پەیوەندییە ڕووحییەکان بکەن؟**

د. فەهمی: کێشەکە لەوەدا بوو هەموومان پەلەمان کرد، ڕاستییەکەی جاڕی کۆتایی هیچ لایەکیان نەبوو، هەموومان کەوتینە هەڵەیەکەوە تێیدا، هەڵەی بەرچاولێڵی، بە کوردییەکەی وەکو بڵێیت جادوویان لێ کردین، ئەگەر جادووشیان لێنەکردبین جادوومان لە خۆمان کرد. ئەم پەلەپەلییەی نەدەویست، بە درێژایی مێژووش ئەم شتانە ڕوویان دابوو، نە دین مرد و نە زانست. ئەمانە کۆمەڵێک قسەی منداڵانەی کرچوکاڵ بوون، هەموومان پەلەمان کرد، ئەگەرنا دەکرا بڵێین وەک ئایینزا دواکەوتووەکان بڵێین: «ئەمە عیقاب و سزایەکی خوایی بوو، وە تووشی ئێمەی موسڵمان نابێت»! دەرکەوت تووشی ئێمەی موسڵمانیش بوو و کەسی

زۆر دینداریشی کوشتین، زاستگەراکانیش، ئەوانەیان کە زۆر فوویان کردە ناو بوارەکەی خۆیانەوە، دەرکەوت ئەوانیش دەستەوەستان بوون و شتێکی ئەوتۆیان پێ نەکرا، ئەگەرچی پێیاندەکرێ و چارەسەریش دەدۆزنەوە، بەڵام پێویستی بەم سەنگەر لەیەکگرتنە نەدەکرد، هەردووکیان پێویستن بۆ کۆمەڵگە، هەردوو بواری ئایین و زانست، دوو باڵی مەلێکن.

**گوڵنار: ئەمە هەڵە و دواکەوتوویی هەردوو بوارەکە بوو، ئەی کامە بوو ڕووە گەشەکەی هەردوولا؟**

د. فەهمی: هەمووومان کاتێک قسە لەبارەی شتێکەوە دەکەین، خێرا تیشک دەخەینە سەر خاڵە ڕەش و نەرێنییەکان، بەداخەوە. هەرچەندە ئەمە لە ڕووی سایکۆلۆژییەوە شتێکی باشە، تەنانەت گفتوگۆ قورئانییەکانیش هەمیشە لە نێوان دوو شتی ئەرێنی و گەشبینانەدا زەم و هەڕەشەیەک دەهێنێت. ڕووی گەشی ئایینی و زانستی لە پەتای کۆرۆنادا زۆر بوو، یەکێک لەوانە هەموو زانستگەراکان هێرشیان نەدەکردە سەر ئایین، بەڵام لەوێدا ڕقیان هەڵدەستا و تووڕە دەبوون کە کۆمەڵێک لە ئایینپەروەرەکان زانستیان تۆمەتبار دەکرد، زانستیان بە بە مەشلوول و بێدەسەڵات دەزانی بەرامبەر بە کۆرۆنا، بەڵام واش نەبوو. یا لە هەندێ شتدا (کە ئەمەش دەمانباتەوە بۆ تیۆریای موئامەرە) تۆمەتباری زانستیان دەکرد بەوەی کە خۆتان ئەم بەزمەتان ناوەتەوە و خۆتان دروستتان کردووە. کە ئەمە لە سەداسەدیش ناتوانی بڵێیت وایە یا وا نییە. هەندێ سەرچاوە باس لەوە دەکەن کە ئەم ڤایرۆسە زنجیرەیەکی بازدانی سرووشتی نییە، چونکە ڤایرۆسەکان بە گشتی لە بازدانەوە دروستدەبن. هەندێ سەرچاوە و ڕاپۆرتی پزیشکی باسیان لەوەدەکرد کە ئەمە لە تاقیگەکانەوە درووست بووە، کێ ئەمەی دروستکردووە؟ خۆ زانایەکی ئایینی بە قەولی خۆیان نازانستی دروستی نەکردووە! کابرایەکی زانستی ئەمەی درووست کردووە. بۆیە تۆمەتبارکردنەکانی ئەمان ڕووەو ئەوان بوو، بە تایبەت ئەو کاتەی کە پێیان نەدەما بڵێن ئەمە غەزەب و سزایەکی خواییە، ئیتر دەیانگوت: ئەمە خۆتان دروستتان کردووە. کاتێک ئایینگەراکان بەڵگەی ئەوەیان پێنەدەما کە ئەمە غەزەبی خواییە، تۆمەتباری زانستگەراکانیان دەکرد کە ئەمە دەستکرد و فێڵێکی خۆتانە.

**گوڵنار: بەڵام دکتۆر زۆر جار ململانێ سیاسییەکە ڕۆڵی لەمەدا هەبوو، نەک ململانێ زانستیی و ئایینییەکە، بۆ نموونە زۆر جار دۆناڵد ترامپ لە لێدوان و تویتەکانیدا دەیگوت: «ڤایرۆسە چینییەکە»، وە لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانیشدا باس لە بوونی ڕۆڵی هەندێ وڵات دەکرا لە پەرەپێدان و تەشەنەپێکردنی ڤایرۆسەکەدا!**

د. فەهمی: ئەوەش هەر دەچێتە ناو بازنەی (تیۆریای موئامەرە)وە، تۆمەتبارکردنی یەکتر. تەبعەن تیۆریای موئامەرە زۆر ئاڵۆزە، فرەڕەهەندە، ڕەگوڕیشەیەکی دوور و درێژی هەیە، سەرەنجام ئەگەر ئەم تیۆریای موئامەرەیە ڕاست بێ، کۆی قسەی هەموو

فرەڕەهەندەکان بەتاڵ دەبێتەوە و ڕێسەکەیان دەبێتەوە بە خوری، تەنانەت ئەم دیدارەی من و تۆش هەمووی هەڵدەوەشێتەوە. ئەگەر دەرکەوێ ئەمە لە تاقیگەدا دروستکراوە و بڵاوەی پێ کراوە. لایەنی جوان و گەشی بواری زانستی ئەوەبوو کە زۆر خێرا هاتە سەر خەت، هەر لە توێژینەوە و کردنەوەی ناوەندی لێکۆڵینەوە و لەخۆبوردوویی و کاری خۆبەخشی و پێشنیازەکان بۆ دروستکردنی دەرمان و هاوبەشی پێکردنی کەیسەکان لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر. کاتێک تاکێک لە سۆماڵ یا ئەمریکا تووشی ڤایرۆسەکە دەبوو، ئێمە دەمانزانی و نیشانەکانمان دەستنیشان دەکردن. یا هەمان کەیس لە سلێمانی تۆمار دەکرا و وەک هەمان کەیسی وڵاتێکی تر بوو. بۆیە زانستی پزیشکی زوو هاتەپێشەوە و ئیشی زۆر باشیشی کرد، بە تایبەت لە دروستکردنی ڤاکسینەکەدا. هەرچەندە ئەویش لە ڕووی زانستی دەرمانسازییەوە پرسیاری زۆری لەسەرە، چونکە دروستکردنی ڤاکسین چەند ساڵێکی دەوێ و قۆناغی زۆری هەیە و هەر قۆناغەی چەند مانگ و ساڵێکی دەوێ، وە پێویستە پێشتر لەسەر چەند ئاژەڵێک تاقیبکرێتەوە و لەو جۆرە شتانە. بەڵام حاڵەتی کۆرۆنا زۆر ئیمێرجێنسی بوو، نەدەکرا هەموو قۆناغەکان و ئەو هەموو ساڵە ببڕێت. لە بەرامبەر ئەمەشدا ڕووی گەشی لایەنی ئاینی کەم نەبوو، بە تایبەتی لە گرووپی میانڕەوەکان، کە کەسی زانستی زۆر باشیان تێدابوو، ئەوانیش بەشداربوون لەم ڕەوتە زانستییە و دروستکردنی دەرمان و بڵاوکردنەوەی توێژینەوەکان و وە دەستخۆشییان لە زانستگەراکانی بواری پزیشکی دەکرد. وە ئەوان جۆرێک لە مێشککرانەوەیان تێدا بوو، دەیانگوت: «ڕاستە ئەمە یەکێکە لە بەڵا و نەخۆشییەکانی خوا، هاتووە و دەبێ چارەسەربکرێ، دەبێ خۆ بپارێزین، دەرمانی بۆ بدۆزینەوە و تا دواتر». بۆیە ڕێی سێیەممان دەبینی لە گوتاری ئاییندا بەرامبەر بە کۆرۆنا. بەڵام کۆرۆنا هەر خودی خۆی گۆڕانکاری زۆریشی لە تێگەیشتنە ئایینییەکاندا کرد، تۆ سەرنج بدە هەندێ چەمکی فیقهیی و تەنانەت عەقیدەییش خەریک بوو دەگۆڕدران، یا دەستکاریی دەکران. بۆ نمونە نوێژی بە کۆمەڵ، تەنانەت هەندێ موفتی فەتوای ئەوەیان دەدا کە هەرکەس بچێتە نوێژی بە کۆمەڵەوە، تاوانبار دەبێ. تۆ سەرنج بدە ئەو نوێژە بە کۆمەڵەی کە جاران دەگوترا: «هەرکەس نوێژی تاک لە ماڵەوە بکات، هەر لێی قەبووڵ ناکرێ»، کەچی ئێستا ئەنجامدانی بۆتە جۆرێک لە تاوان و سەرپێچی. سەرنجی ئەم چەمکە فیقهییە بکە کە چۆن لە چاوترووکانێکدا گۆڕدرا؟! حەج و عومرە هەر پێچرانەوە، بە تایبەت کە حەج یەکێکە لە فەرزە گەورە و کاریگەرەکان، جەژن و بۆنە ئایینییەکانی وەک پرسە و مەولوودنامە سانسۆرکران. بۆیە کۆرۆنا چەمکی فیقهیشی گۆڕی، مرۆڤی هێنایەوە بەرەو زیاتر تاکپەرستیی و خودی، واتە پەرستشی نێوان خۆت و خوا.

جا هەندێ لە بیرمەندە دیندارەکانی جیهان (لە هەموو ئایینەکاندا) دەڵێن: «دەستی تیۆری موئامەرە لێرەدا ئاشکرا دەبێت، کە ئەمە بۆیە دروستکرا تا لە ڕێیەوە گورز لە هەندێ تێگەیشتن بدەن. وە هەندێ چەمکی پێبگۆڕن کە لە ئاییندا قابیلی گۆڕان نین و ناکرێ بگۆڕدرێ». تۆ سەرنج بدە چ بڕیارێکی سیاسیی و ئابووری دەیتوانی حەج بگۆڕێ و لاببرێت؟ کەس نەیدەتوانی. چ کارەکتەرێک هەبوو لە جیهاندا جورئەتی ئەوە بکات و بڵێت نابێ لە دونیادا نوێژی جومعە و جەماعەت بکرێ؟! کەچی ڤایرۆسێک هات و بە ویستی خۆت ئەو بڕیارەی لا دروستکردی و مەلا و زاناکان خۆیان چوونە سەر مینبەر و داوایان دەکرد کە خەڵک نەچێتە پەرستشە کۆمەڵکارییەکانەوە. وە گومانەکەشیان تا ڕادەیەک جێی باوەڕە. لە مێژوودا پەتای لەم جۆرە ڕوویان داوە، وەک ئەوەی سەردەمی ئیمامی عومەری کوڕی خەتاب (تاعوونی عەمواس)، کە چۆن ئەو ئاوەدانییە عەزل دەکات و ڕێ نادا کەسی لێوە بێتە دەر و کەسیشی بۆ بچێت. تەبعەن ئێمە هەموو وردەکارییەکانمان پێنەگەیشتووە، بە دڵنیاییەوە ئەویش لەو سەردەمەدا فەتوای دەرکردووە کە کەس جەماعەت نەکات. چونکە فەرمانڕەوایەکی عاقڵ و بیرتیژی وەک ئیمامی عومەر، کە فیکری بۆ کەرەنتینەکردنی خەڵک چووبێت، بێگومان بیریشی لە هەڵوەشاندنەوەی پەرستشە کۆمەڵکارییەکان کردووەتەوە، چونکە لە ڕووە شەرعییەکەوە زۆر شارەزاتر بووە، بۆ ئەوەی بەریەککەوتنی کۆمەڵایەتی ڕوونەدات!

لەبەر ئەوە کە دەڵێین کۆرۆنا فرەڕەهەند بوو، ئەو کاتە ڕەهەندی مێژوویشی تێ دەکەوێ، کە تۆ شارەزای مێژوو بوویت، ناکەویتە هەندێ هەڵەوە. شارەزاییت لە زانستی پزیشکی و هەندێ ڤایرۆسدا هەبێ، ناکەویتە هەندێ هەڵەوە. کە شارەزاییت لە ڕەهەندی ئایینیی هەبوو، وەک پزیشکێک کە قسەت کرد، هەندێ هەڵە هەیە نایکەیت. ئەگەرچی سیاسەت (بەشێوەیەکی زۆر ناشیرین) دێت هەموو ڕەهەندەکانی تر کۆدەکاتەوە و بۆ بەرژەوەندیی خۆی لە هەر یەکێکیان بەشێک دەکاتەوە و بەکاریان دەهێنێت. لەبەر ئەوە من لەو بڕوایەدام لە مێژوودا چارەسەری ئەم کێشانە هەبووە و قسەی زۆر جوانتریش کراوە، وە ئەسڵەن ئەوەی لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتتاب و دواتریشدا کراوە لە ڕووی کەرەنتینە و خێرا هاتنە سەرخەتی حوکمڕان و ئیجرائات و ناردنی پەیامی خۆپارێزی بۆ ویلایەتەکان، بەراورد بە هیی ئەم سەردەمە زۆر پێشکەوتووتر بووە، ئەڵبەتە بۆ هەموو وڵاتێک نا. بۆیە لە مێژوودا ئەمانە هەمووی ڕوویان داوە، بەڵام ئێستا خێرابوونی پەیوەندی و لێکنزیکبوونەوەی کەلتوورەکان ڕوویداوە، وە یەکێک لە جیاوازییەکانی پەتای کۆرۆنا لەگەڵ پەتاکانی تردا ئەوەیە کە

ئەوەی جاران زۆر لۆکاڵ بوون، سەدەکانی پێشوو لەوە دەچێ دوای پەنجا ساڵ خەڵک بیستبێتی و گوتبێتیان: وەڵا پەنجا ساڵ پێش ئێستا دەڵێن تاعوونێک داوییەتی لە فلان وڵات. بەڵام ڤایرۆسی کۆرۆنا دوێنێ لە شاری وهان بوو، دوای مانگێک لە شاری سلێمانی کەیس تۆمار کرا. ئەمە پەیوەندی بە نزیکبوونەوەی جوگرافی و پێکدادانی کەلتوورەکانەوە هەیە.

جا ئەگەر لە ڕووە کۆمەڵایەتییەکەوە باسی بکەین، ئەمەیە کە دەڵێن کۆرۆنا جۆرێک لە یەکسانیی هێنایە ئاراوە و جیاوازی و سنوور نەما، دەوڵەمەند و هەژار نەما، سەرکردە و کەسی ئاسایی نەهێشت. ئەوەی کە دەڵێن مردن حەکەمێکی عادلە، کۆرۆناش ئەگەرچی هاتنی نەخۆشییەکە ئاسایی بوو وە حەکەمێکی عادل بوو و لە ناو هەموو کۆمەڵگەکاندا بڵاوبوویەوە، بەڵام ئێستا لە چارەسەرەکەیدا خەریکە جۆرێک لە نادادی و ستەم پەیدا دەبێت. ئەوەی کە ئێستا باس لە چەمکی نائەخلاقییبوونی دابەشکردنی ڤاکسینی کۆرۆنا دەکرێت لە ناو ژینگە فەلسەفیی و کۆمەڵناسییەکاندا. ئیمارات لەبەر ئەوەی دەوڵەمەندە و دارایە، پێنج ملیۆن جورعەی ئەم ڤاکسینەی کڕیوە، ژمارەی دانیشتووانەکەی خۆی ئەوەندە نابێ، بەڵام وڵاتێکی وەک کینیا کە پەنجا ملیۆن دانیشتووی هەیە، نەتوانێ نیو هێندە بکڕێ! کوا چەمکی عەدالەت و ئەخلاق؟! نەخۆشییەکە خۆی یەکسانی بڵاوکردەوە، کەچی چارەسەرەکەی نایەکسانی بوو.

**فەرمانڕەوایەکی عاقڵ و بیرتیژی وەك ئیمامی عومەر، کە فیکری بۆ کەرەنتینەکردنی خەڵك چووبێت، بێگومان بیریشی لە هەڵوەشاندنەوەی پەرستشە کۆمەڵکارییەکان کردووەتەوە، چونکە لە ڕووە شەرعییەکەوە زۆر شارەزاتر بووە، بۆ ئەوەی بەریەککەوتنی کۆمەڵایەتی ڕوونەدات!**

بۆیە ئەگەر لە ڕەهەندە فیکرییە ئایینییەکەیشییەوە تەماشای بکەیت، ڕەنگە ئەگەر بۆ مەجازیش بێت بتوانی بڵێیت: «خودا نەخۆشییەکەی بە یەکسانی نارد، بەڵام ئێمە چارەسەرەکەتمن بە نایەکسانی کرد»! پێم وابێت لە فەرموودەی قودسیدایە کە خودا دەفەرمووێت: «من هەژار دروستدەکەم نەک هەژاریی». بە واتای ئەوەی کە لەناوبردنی هەژاریی لە دەست خۆتدایە، بۆیە ئەگەر مۆراڵی باڵای مرۆڤایەتی و لایەنی مۆراڵییە دینییەکە بهێنیت و جێبەجێی بکەیت بەسەر ئەم دابەشکردنی ڤاکسینی کۆرۆنایەدا، دەتوانی ئەمەی لێ بخوێنیتەوە.

**گوڵنار: دکتۆر لێکەوتە فیکریی و کەلتوورییەکانی کۆرۆنا چی بوون؟**

د. فەهمی: تەبعەن ئەویش بە هەمان شێوە، ناتوانیت باسی لێکەوتە فیکریی و کەلتوورییەکانی بکەیت، ئەگەر تێگەیشتنت بۆ لایەنەکانی تری نەبێ، ئەگەر باسیش بکرێ، باسکردنێکی کرچوکاڵ دەبێ، باسکردنێکی زۆر زانستیی و پتەو نابێت. لێکەوتە کەلتووریی و فیکرییەکانی کۆرۆنا، ڕەنگە ئێستاکورتخایەن بن و لەوانەشە درێژخایەن بن، چونکە مرۆڤ بە ئاسانی تەبع وەرناگرێ و بە ئاسانییش ئەو تەبعەی لەناو ناچێ. جا ئیتر تەبع و سیفەتی کەلتووری، یا سیفەتی مەعریفی بێت. بە کورتییەکەی کۆرۆنا زۆر گۆڕانکاریی لە بواری فیکریی و کەلتووریدا کردووە. زۆر چەمکی کۆمەڵناسی و کۆمەڵایەتیشی گۆڕیوە، دەرەنجامی ئەوەیش زۆر چالاکی و ڕەوشت و رسوماتی کۆمەڵایەتی گۆڕدراوە. بۆ نمونە جاران تەوقەکردن و دەستگوشین نیشانەی موحیببەت و دینداریی و نزیکی کۆمەڵایەتی بوو لە نێوان ئەو دوو کەسەدا، ئاڵوگۆڕی سۆز و خۆشەویستی بوو لە ڕێی ئەو تەوقەکردنەوە، بەڵام ئێستا بە زیادبوونی مەعریفە پزیشکییەکەمان و زانینی ترسی گواستنەوەی ئەم ڤایرۆسە لە ڕێی تەوقەکردنەوە، تەماشا دەکەیت خەریکە ئاکارێکی کۆمەڵایەتیی و کەلتووریی و ئایینیمان دەگۆڕێت، کە ئەویش بریتییە لە سەردانیکردن و تەوقەکردن. ئەمە لە نمونەیەکی زۆر بەرجەستەی ڕۆژانەدایە کە دەیبینی و هەستی پێدەکەی، ئیتر باسی گۆڕانە فیکرییە قووڵ و ڕیشەدارەکان ناکەم کە چەندە ئاڵۆزن، تەنها ئەو نمونەیەم باسکرد کە هەموومان لێی تێدەگەین و دەرکمان پێکردووە و پەیوەندیدارە بە کەلتوور و مەعریفە و کۆمەڵناسییەوە. تەبعەن گۆڕانکاریی تر و گەورەتر زۆر ڕوویانداوە، بەڵام لەوانەیە هەندێکیان کورتمەودا بن یا دوورمەودا بن و لە کاتەدا هەستیان پێ نەکەین. لەوانەیە وەک ئاکاری کەسێتیی و نەتەوەییش بمێننەوە، لەوانەیشە نەمێننەوە. بۆ نموونە ئەم دوورکەوتنەوە کۆمەڵایەتییانە لەوەچێ دوو ساڵ بخایەنێت، یا دەگونجێ بە هەتاهەتایی بمێننەوە و ئێمەش ئولفەتیان پێوە بگرین. بۆیە دەڵێم ڕەنگە ئەمەش مەوجەیەکی تر بووبێت لە مەوجی بە ڕۆژئاواییبوونی کۆمەڵگە ڕۆژهەڵاتییەکان، لە زۆر ڕووەوە، بە تایبەتی لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە و درەوشانەوەی تاکبوونەوە و کاڵبوونەوەی کۆمەڵایەتیبوون. کاتێک تۆ لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە لاواز دەبیت، لە ڕەهەندەکانی تریشەوە کاریگەریت لەسەر جێدەهێڵێ، من کە دەڵێم هەموو ڕەهەندەکان لە کۆرۆنادا پێکەوە پەیوەستن، هەر لە خۆمەوە نایڵێم. بۆ نمونە کۆمەڵایەتیبوون بە تەنها هەر خۆی نییە، ئایین تێکەڵ بە کۆمەڵایەتییمان بووە، کاتێک نزیکی کۆمەڵایەتی ڕوودەدات و تەوقەکردن دەکرێ، دوو حەدیسی پەیامبەری ئیسلام جێبەجێدەکرێت، دەی بە پێچەوانەشەوە کاتێک ئەمانە نامێنن و وازیان لێدەهێنین، ئۆتۆماتیکییەن دوو فەرموودەی پێغەمبەریش ڕەتدەکرێنەوە و ئیلغا دەبنەوە. کۆمەڵێک تێگەیشتنی عەقیدەیی و فیقهیی

هەڵدەوەشێنەوە، ئەمە تەنها پەیوەندییەکی سادەی کۆمەڵایەتیی ئەم هەمووە گۆڕانکارییە دەکات، جا وەرە پرسە گرنگە تێکەڵبووەکانی نێوان ئایین و کۆمەڵگە هەڵوەشێنەوە، بزانە چ گۆڕانکارییەک ڕوو دەدەن؟! ئەم شتانە چی گۆڕیونی؟ کەلتوورێکی کۆمەڵایەتیی گۆڕیونی. لەسەر بنەمای ئەوە گۆڕاوە کە ڤایرۆسێک بە دەستی منەوەیە و دەکرێ لە ڕێی تەوقەکردنەوە بگوازرێتەوە بۆ تۆ و ببێتە هۆی مردنت، بۆیە من تەوقە ناکەم. عوزری شەرعیشی بۆ دەهێنرێتەوە لە ئاییندا (ولاتلقوا بأیدیکم الی التهلکه)، بۆ ئەوەی کەس نەڵێ ئەمە خیلافی ئایینە و دەرچوونە لە فەرمانی خوا. بۆیە شتەکان زۆر ئاڵۆزن.

**گوڵنار: ئەگەر سەیری ڕەهەندی ئابووریش بکەین، هەموومان پارەیەکی زۆر بۆ پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە تێکەڵبووەکان بە ئایین تەرخان دەکەین، دەعوەتیی و پرسە و شایی و سەیرانکردن، کە ئەمانە لەگەڵ ئەوەی کارێکی کۆمەڵایەتیین, بەڵام بنەمایەکی ئایینیشییان هەیە، کاتێک ئەمانە نامێنن، پارە لە دەستی دەسەڵاتدارەکان نایەتە بازاڕ و خەڵکێکی کەمتر سوود لە پارەی خڕبووەوەی لای دەوڵەمەندەکان وەردەگرێت، کە وایە لە ڕووی ئابووریشەوە کاریگەری هەبووە؟**

د. فەهمی: ڕاستە، سەرەنجام دەگونجێ لە کۆتاییدا ماکینەی جووڵاندنی هەموو ڕەهەندەکانیش فاکتەری ئابووری - سیاسەت بێت. سەرباری ئەمەیش بە گوێرەی بۆچوونی شارەزایانی ئابووری، کاریگەری و لێکەوتە ئابوورییەکانی ئەم پەتایە هیچی لە کاریگەرییە تەندرووستییەکانی کەمتر نییە. ئەگەر تەماشایەکی سەرپێیانەی نرخی دراو و نەوت و ئاڵوگۆڕە بازرگانییەکانی جیهان بکەیت، زۆر شتت بۆ دەردەکەوێ.

بیرمان نەچێت ئەم پەتایانە لە مێژوودا زۆر شتی کەلتوورییان گۆڕیوە، ئەسڵەن جاری وا هەبووە یا زاراوەیان گۆڕیوە یا زاراوەیان داهێناوە. بۆ نموونە ئێستا کە دەڵێن: «شلونک» وەک ئەوەی کە عەرەبی عێراقی بەکاریدەهێنن، کاتی خۆی لە بری وشەی (شنو لونک) بەکاریانهێناوە، واتە ڕەنگی تۆ چۆنە؟ دەڵێن: پێم وابێت عەلی وەردییە باسی دەکات کە کاتی خۆی پەتا و تاعوونێک هاتووە، کاتێک لە عێراقدا بڵاوبووەتەوە، یەکێک لە کاریگەرییەکانی کە هەیبووە، لەسەر پێست بووە، وە پێستیش بەپێی گۆڕانکارییەکان و ڕەنگەکانی، نیشانەیەک بووە بۆ نەخۆشییەکە، وەک چۆن ئێستا ئێمە دەڵێین یەکێک لە نیشانە باوەکانی کۆرۆنا تەنگەنەفەسییە، بەرزبوونەوەی تایە، کەمبوونەوەی ئۆکسجینی ناو خوێنە، دوای ماوەیەکیش نەمانی هەستی تامکردن و بۆنکردنیشی هاتەسەر، بۆیە ئێمە زۆر جار بە کەسی نەخۆش دەڵێین: «ئێستا بۆنت چۆنە»؟ کەچی جاران بە هەڵگرانی ئەو تاعوونەیان گوتووە: «شنو لونک»، چونکە ئەگەر ئەو کەسە ڕەنگی پێستی سەوزی فستەقی بووایە، یا زەردێکی کیماویی بووایە، گوتوویانە: دەمرێ و نامێنێ. بۆیە کە یەکێکیان دەبینی پاش چاکبوونەوەی، پێیانگوتووە: ڕەنگت چۆن بوو؟ ئێستا ئەم وشەیە

کورتکراوەتەوە وگۆڕانکاریی بەسەردا هاتووە و بووەتە «شلونک»! وە ئێستا ئەو وشەیە لە بری (کیف حالک) بەکاردێ، لە کاتێکدا (شلونک) لە بنەڕەتدا لە بری (کیف حالک) بەکارنایەت لە زمانەوانیدا. بەڵام کە دەگەڕێیتەوە بۆ مێژوو، ئەوسا دەزانی ئەمە لەوەوە هاتووە. ئەی چ شتێک ئەم کەلتوورە زارەکییەی هێنایە ناوەوە و ئەوە سەدان ساڵە بەکاردەهێنرێت و بووەتە کەلتوور؟ پەتایەک کردی. کە وایە تۆ سەرنج بدەرە کاریگەریی دوورمەودای پەتا. بۆیە ئێمە کاریگەرییە کورتمەوداکانی کۆرۆنامان بینین، دەگونجێ لە داهاتوودا کاریگەرییە درێژمەوداکانیشی ببینین. لەبەر ئەوە دەبێ ئێمە ئاگامان لە هەندێ شت بێ، بۆ نمونە لە فیقهی ئیسلامییدا شتێک هەیە، دەگونجێ دڵسۆزی و ئیخلاسی تابێت بێ، بەڵام نەیپێکابێت (صواب). چونکە دڵسۆزی هەندێجار زیان دەدات. کاتێک کە پزیشکێک یا وەزیرێک لە دڵسۆزی خۆیەوە دەڵێ با دەرگای قوتابخانەکان نەکرێتەوە، ئەوسا دەزانی ئەم بڕیارە چ لێکەوتەیەکی کۆمەڵایەتیی و مەعریفیی و ئابووریی و فیکریی کاریگەری دوورمەودای لێدەکەوێتەوە. دووبارەی دەکەمەوە، لاوازیی هەموو ڕەهەندەکانی ئەم پەتایە کە ئێمە باسمانکرد، هەموویان ئیعتیمادیان خستبووە سەر لایەنی پزیشکی، دەسکەلای دەستی هەموویان زانستی پزیشکی بوو، ئێ زانستی پزیشکییش ڕۆژ لە دوای ڕۆژ دەگۆڕێ، شتێکی هێندە پتەو و بەهێز نییە کە تۆ هەموو ئیعتیمادێکی خۆتی بخەیتە سەر.

ئینجا با بێینە سەر ڕووە سیاسییە سیستەمییەکەی، تەبعەن زۆر سەرچاوە دەڵێن: «ئەم دیاردەیە مانیفێستۆی ئەزمەیەکی سیاسی – ئابووریی جیهانییە». یان ژانی ئەزمەیەکی سیاسی – ئابووریی جیهانییە، خۆشتان دەزانن لە جیهانی نوێدا، ئابووری بزوێنەری سیستەمەکانە، سەرمایەدارییە هەموو شتەکان دەگۆڕێ، ئەنزیمەی حوکم دەگۆڕێ، دەستکاری هەموو شتەکان دەکات و بووەتە غول و ئەختەبووتی هەموو شتەکان، هەموو شتەکان بۆ بەرژەوەندی خۆی دەجوولێنێ و ئاراستە دەکات. یا هەندێکی تر دەڵێن: «ئەمە ژانی لە دایکبوونی سیستەمێکی تری چاوەڕوانکراوە»! چونکە دەڵێن تەنانەت داڕێژەرانی سەرمایەداری تازە دەڵێن: ئەم شێوازە لە سیستەمی حوکمڕانی بەسەرچووە و کەڵکی نەماوە! گوایە ئەم کۆرۆنایە یەکەم دەرگای کرانەوەیە بە ڕووی ئەم سیستەمە نوێیە جیهانییەدا. بەڵام ئەگەر دیقەت بدەین زۆر شتی سەیرمان بۆ دەردەکەوێ لەم پەتای کۆرۆنایەدا، یەکێک لەوانە نەمانی ڕەهایی ئازادی بوو. نەمانی ڕەهاییەتی مافی مرۆڤ، کە کۆڵەکەی دامەزراندنی کۆمەڵگەی دیموکراتی و ڕۆژئاوایی بوو و، تاککەرایی لێکەوتەوە، تێیدا تاک هەموو مافێکی هەبوو، بۆت نەبوو توخنی مافەکانی و ویستەکانی بکەوی! بەڵام کۆرۆنا هات، پێی گوتی: «نەک هەر دەتوانی توخنی بکەویت، بگرە دەتوانی بە داریش

لێیدەی». بەبێ ماسک بێیتە دەرەوە، سزات لەسەرە، لە وڵاتێکی وەک نەیجیریا ڕووی دابوو، کۆرۆناکە هات، وابزانم یازدە کەسی کوشتبوو، پۆلیس لەبەر ماسک نەبەستن هەژدە کەسیان کوشتبوو! ئەمە لە نەیجیریا وابوو، لە فەڕەنسای دایکی دیموکراتیشدا بە جۆرێکی تر ڕووی دا بەڵام لە فۆڕمێکی تردا و تەنانەت خۆپیشاندانیش کرا و پرۆتیستۆ کرا. بۆیە ئەم کۆرۆنایە بووە دەرچەیەک کە سیستەمی سەرمایەداری (وەک خۆیان دەیڵێن) دەستی فریاگوزاری ڕابکێشێت بۆ ئیشتراکییەت! چونکە لە ئیشتراکییەتدا هەموو شتێک سەنتەری بوو، حکومەت هەموو شتێک بوو، وە دەستیشی وەردەدا لە هەموو شتێک. خاوەندارێتی هەموو شتەکان بە دەست حکومەتەوە بوو. حکومەت خۆی ئاو و کارەبای دەدایتێ، تەنانەت ئازادییش حکومەت خۆی دەیبەخشی بە تاکەکان، بەڵام ئەورووپا لە ماوەی شەو و ڕۆژێکدا هەمووی بوو بە ئیشتراکییەت. کەم کەسیش دەرکی بەوە دەکرد، بەڵام بتەوێ و نەتەوێ ئەو ڕەفتارانەی کە لە ئەورووپا دەبینران، هەموویان ڕەفتاری سیستەمی ئیشتراکی بوون. تەنانەت هەندێ بیریاریی ڕۆژئاوایی بە گشتی، بە جۆرێک لە جۆرەکان دانیان بەوەدا نا کە سەرمایەداری بەم فۆڕمە فەشەلی هێنا. ناوی ئابوورییناسەکەم نایەتەوە بیر کە لەم چەند ڕۆژەی ڕابوردوودا لە (بی بی سی) قسەی دەکرد، باسی (نیوکاپیتالیزم) دەکات، کە دەڵێت: «ئەم نیوکاپیتالیزمە موتوربە کراوە بە ئیشتراکییەت». چونکە دەرکەوت ئیشتراکییەت لە حاڵەتێکی وادا سوودی زۆرە، ئەگەر بە مانا کۆنترۆڵییەکەی قسە بکەین نەک بە مانا عەسکەرتارێتییەکەی، چونکە سەرمایەداری بەوە تانە و تۆمەتی دەخستە پاڵ ئیشتراکییەت، کە وەک ئەختەبووت هەموو شتێکی کۆنترۆڵکردووە و مرۆڤ سەنتەری خزمەت و ئازادی نییە! لە کاتێکدا سەرمایەداری خۆی وایە، هەموو ئەو سیفەتە ناشیرینییانەی کە سەرمایەداری دەیانساوێ بە ئیشتراکییەتدا، بەرهەمی سەرمایەداری خۆین! سەرمایەداری خۆی هاتووەتە ناو دیوارەکەتەوە، لە ماڵەکەی خۆتدا دانیشی، سەرمایەداری وایکردووە بەبێ هیچ شتێک دەبێ پەنجا دۆلاری بدەیتێ لە بەرامبەر کارتی تەلەفۆن و ئینتەرنێتدا. لە کاتێکدا ئەمە دژی یاسای بایۆلۆجی و سایکۆلۆجی مرۆڤە. دژی سادەترین پێناسەی مافی مرۆڤە، بە پێی هەڕەمەکەی ماسلۆ دەبێ یەکەم نانخواردن و پاشتر شوێنێک بۆ حەوانەوەی هەبێت. ئەمە ئیتر بنکەی هەڕەمەکەیە. ئایا ئەمە ئەختەبووتییە یا ئیشتراکییەت، حکومەت دەبێ ئینتەرنێت و نەوت و کارەبا و ئاو و کەرتی تەندروستی بە خۆڕایی بدات بە هاوڵاتییەکانی. حکومەت خۆی دەتپارێزێ و ناتدات بە کۆمپانیا تا پارێزەرت بێ و پێداویستییەکانت بۆ دابین بکات. بۆیە دووبارەی دەکەمەوە ئەو تۆمەتانەی کە سەرمایەداری دەیساوی بە ئیشتراکییەتدا، خۆی بە ناشیرینترین شێوە ئەنجامی دەدان. وە هەمووشیان دانیان بەم حەقیقەتەدا نا و گوتیان: «ئەم سیستەمە نەک هەر بەسەرچووە، بگرە پڕووکاویشە و دەبێ بگۆڕدرێ»!

وە چۆنیش بیگۆڕن؟ تێکەڵەیەک لە هەردوولا دروستبکەن. ئەمەی کە ڕووی دا، نمایشی تەرزێکی جیاوازی ئیشتراکییەت بوو، بە فۆڕمێکی جیاواز، ئیشراکییەت بوو لەناو گەرووی سەرمایەدارییدا. ئەم قسانە بۆ باشپیشاندان و بەفریشتەکردنی ئیشتراکییەت نییە، نەخێر، ئەویش تەژییە لە عەیبوعاری فکری و فەلسەفی و ئەخلاقی.

**گوڵنار: لەم پەتای کۆرۆنایەدا باس لە چەمک و تێگەیشتنێک دەکرا، ئەویش نەمانی تاک جەمسەریی و دروستبوونی دوو جەمسەری یا فرە جەمسەری, بە تایبەت لە ململانێی نێوان ئەمریکا و چیندا؟**

د. فەهمی: قسەی زۆر لەسەر ئەمە دەکرا، تەنانەت بە ئاشکرا بیریارە ڕووسییەکان و ئەوانەشی کە مەیلیان بە لای ئەورووپای شەرقییدا هەبوو، (دوژمنی دوژمنەکەم دۆستمە) بە ناڕاستەوخۆ بە باڵای چیندا هەڵدەدەن لە دژی ئەمریکا، باسیان لەمە دەکرد، دەیانگوت: «ئەمە ژانی لە دایکبوونی جەمسەری دووەمە»! هەندێ سەرچاوەی ئابووری دەڵێن: «لەم پەتایەدا تاکە وڵات لە جیهاندا کە ئابووری بەهێز بووبێت، یا زیانی نەکردبێ چین بووە»، گوایە چین پێشتر ئامادەکاریی کردووە بۆ ئەمە، بەڵام مەرج نییە ئامادەکارییەکە ئەوە بووبێت کە چاوەڕێی هاتنی ئەم ڤایرۆسە بووبێ یا ئاگاداری هاتنی بووبێت. لەوانەیە ئەگەر پەتای کۆرۆنا نەبووایە، ئەوا پەتایەکی ئابووری بڵاوببووایەتەوە، وەک چۆن پەتا ئابوورییەکەی ساڵی ٢٠٠٧ی ئەمریکا لە سەردەمی جۆرج بۆشدا، کۆمەڵێک ملیاردێری جیهانی و کۆمپانیای زەبەلاح ئیفلاسیان کرد، خەڵکێکی زۆر کەوتە ژێر قەرزی بانک و خانووبەرە و عەقاراتەوە، پاشتر ئۆباما هات و چاکسازی تێدا کرد. کۆمەڵێ دەستەبەری (چمان) ی مەعریفی و تەندروستی و ئابووری لە ئیشتراکییەتدا هەبوون، بەڵام سەرمایەداری هەمووی کردووە بە پارە، هەرچی کەرتی تەندروستیی گشتی هەیە هەرەسی هێناوە و  کەرتە تایبەتەکان جێیان گرتوونەتەوە، تەنانەت لە ئەورووپایشدا. لە وڵاتی خۆیشماندا بەو ئاراستەیە دەڕوات. سەرمایەداری دەڵێ: بە بیانووی کرانەوەی بازاڕی ئازاد، هەموو کەس ئازادە بگات بە لوتکەی دەوڵەمەندبوون. لە کاتێکدا ئەمە فەوزا دروست دەکات، لە سەرمایەداریدا تاک بۆی هەیە لە حکومەت دەوڵەمەندتر بێت. بەڵام ئیشتراکییەت ڕێ بەمە نادات، دەڵێ: دەبێ من بەهێزترین ئابووری و سوپام هەبێت. بەڵام لێرە کاک فلان و کاک فیسار لە حکومەت دەوڵەمەندترن، هەڕەشە لە حکومەت بکەن دەیرووخێنن. ئێستا ڕەنگە حکومەت قەرزاری دەوڵەمەندەکانی وڵات بێت، تەنانەت لە ئەمریکایشدا وایە. بۆیە فەلسەفەی ئیشتراکییەت (تا ڕادەیەک) فیکرەیەکە ئەخلاقی و دینی و مرۆڤانەیە. تەنانەت شیوعییەت لەگەڵ ئیسلامدا لە ڕووی ئابوورییەوە خاڵی هاوبەشی زۆرە. تاک ناکاتە بتێک، دەبێ بەرژەوەندیی گشتی بە دەوری ئەو تاکەدا بسووڕێتەوە.

**گوڵنار: داخرانی دەوڵەتان بە ڕووی خۆیاندا و زاڵبوونی نەتەوایەتی و گرنگی نەدان بە پرسە جیهانییەکان، کە لە کۆرۆنادا هەستی پێکرا.**

د. فەهمی: ئەمە جۆرێکە لە نەرجسییەتی نەتەوەیی، مرۆڤ خۆی وەک تاک زۆر بوغرا بووبوو، جۆرێک لە نەرجسییەتی لا دروست بووبوو، زۆر سەرسامبوو بە خۆی، مرۆڤ پێش کۆرۆنا فووی کردبووە خۆی، بەمە تووشی لەخۆباییبوون بووبوو، وەک چۆن کاتی خۆی دەیانگوت: «زەوی ناوەندی گەردوونە»، کەچی دواتر دەرکەوت ناوەندی هیچ نییە! نەرجسییەتەکەی مرۆڤیش فشۆڵ دەرچوو. جا ئەم نەرجسییەتە لە تاکەوە لە کۆتاییەکانی سەدەی حەڤدە و هەژدە و نۆزدە دەستی پێکرد و لە سەدەی بیستدا گەیشتە ترۆپک. ئەم نەرجسییەتەش لە تاکدا نەمایەوە، تەنانەت نەتەوە هەبوو دەیگوت: من جیاوازم و هەڵبژێردراوی خودام (نحن شعب الله المختار). زۆر نەتەوە تووشی ئەم غرووره بووبوو، تووشی ئەم گراندیۆسیەتیە بووبوو (نەخۆشیی خۆبەگەورەزانین)، تا وای لێهات باڤارییەکان و نازییەکان هاتن و گوتیان: «ئێمەش شعب اللەی المختارین»، وە لەوەوە ئەو جەنگە جیهانییەیان خولقاند، وە پیرێک هەبوون دەیانگوت بە کورد: «ئێوە نەوەی جنۆکەن و ئێوە تورکی شاخاوین». ئەم نەرجسییەتە بەرگێکی ڕێزدارانەی وەرگرت و ناونرا نەرجسییەتی جوگرافیایی وڵات و دەوڵەتی. ئەمە جۆرێک بوو لە نەخۆشی. وڵاتانێکی وەک بەریتانیا و فەرەنسا کاتێک ناهێڵن تاکی ڕۆژهەڵاتی بچێتە سنوورییانەوە، دەڵێن: «ئێمە نەخۆشییەکەمان هەیە و نامانەوێ تۆ تووش بیت»! قەرزارباریشت دەکات، ناڵێت: «تۆ ڕەفز دەکەم». لە کاتێکدا ئەمەش جۆرێکە لە سنوور، جاران تەنها سنووری سیاسی - جوگرافی هەبوو، ئێستا سنووری سیاسیی و پەتاییش دروستبووە. ئەوەی کە جاران نەرجسییەتی نەتەوەیی جەنگی جیهانی پێ دروستدەکرد و دەیگوت: نەتەوەی من لە هەموو نەتەوەکان باڵاترە، ئێستا مەفهوومەکەی گۆڕاوە و دەڵێت: ناهێڵم بە هیچ شێوەیەک تێکەڵم ببیت! تەبعەن ئەمە لە مانا فەلسەفییە دوورمەوداکەیدا ئاوا قسە دەکەن. ئەم مەسەلەی جیاکاریی و داخستنی سنوور زۆربەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوە. دونیای نوێ بەرەو دونیای کرانەوە و نەمانی سنوور دەچوو، بەڵام سەرهەڵدانەوەی قەومییەتی نوێ و ئەم نەرجسییەتە قەومییە و دروستبوونی نەزعەی قەومییەتی توند زۆر ئیستیفادەیان لە کۆرۆنا کرد. ئیتر ئایا سوودەکە لە ڕووی داخستنی سنوورەوە بووبێت، لە ڕێی پەلاماردانەوە بووبێت، لە ڕووی دانانی یاسا و ڕێساوە بووبێت؟! بۆیە زۆر جار مەرج نییە نەرجسییەتەکە تەنها نەرجسییەتێکی نەتەوەیی و قەومی بێت، لەم نموونانەی پێشوودا نەرجسییەتەکە دەگۆڕدرێ بۆ نەرجسییەتێکی حوکمڕانی. بۆ مەسەلەی تەمیزی عونسووری و داخستنی سنوور و ئەوانە، من تا ڕادەیەک باوەڕم پێیەتی. ئەسڵەن ئەگەر ئەم قسەیەش ڕاست نەبێت، دابەشکردنی ڤاکسینەکە گومانی ئەم قسەیە زیاتر دەکات. تا

ئێستا شێوازی پێدانی ڤاکسینەکە بەپێی ژمارەی دانیشتووان، ئیسرائیل هەژدە لە سەد، ئیمارات هەشت لە سەدە. بۆیە جۆرێک لە عونسورییەت دەبینی لەم دابەشکردنەشدا. تەبعەن من باس لە خراپی ئیسرائیل ناکەم، بەڵکە من ئەمە بە شتێکی جوانی حکومەتی ئیسرائیلی دەزانم بۆ هاوڵاتییەکانی خۆی و شایەنی دەستخۆشی و چاولێکردنیشە، چونکە بە تەنگییانەوەیە، زۆرترین ڕێژەی ڤاکسین دەکرێت بۆ هاوڵاتییەکانی خۆی.

گوڵنار: کاریگەریی کۆرۆنا لەسەر بەخۆداچوونەوەی فیکریی لای تاکی کورد، بە تایبەت کۆمەڵێک بۆچوونی نالۆجیکی بەشێک لە کەسە دیارەکانی ناو کوردستانمان دەبیست پێش تەشەنەسەندنی ڤایرۆسەکە، کە ئەمە پاشتر ئاماژە بوو بۆ لاوازی فیکریی ئەو جۆرە کەسانە لە هەموو چین و توێژەکاندا، تا چەند پێویستە کۆرۆنا ببێتە سەرەتای بەخۆداچوونەوەی فیکریی لای تاکی کورد بە خوێنەوار و نەخوێندەوارییەوە؟

د. فەهمی: با ئێمەش وەک ئەوان نەبین، ئەوان یا ڕەش دەبینن یا سپی. میانڕەوی لە هەموو بیرێکدا باشترین شتە. مروونەت پیشاندان باشترین شتە. چونکە بەڕاستی ئەوەی لە ئاییندا باسدەکرێت، ئەوەیە کە باس لە یەقینی خوای گەورەیە کە مەجالی گریمانەی تیا نامێنێت. کە ئەمە بابەتێکی ئیمانییە و تۆ دەبێ تەسلیمی بیت، ئەگەرنا تۆ بە ڕیازییات ناگەیت بەم یەقینە، هەمیشە میانڕەوبیت لە بڕیاردا، باشترین چارەسەرە، چونکە دواتر شەرمەزار نابیت و تووشی ئیحراجی نابیت، پاشتر ژیانت بەرتەسک نابێتەوە. ئەوەی کە دەڵێین میانڕەوی باشە، ئەم قسەیە زۆر ڕاستە، ئۆکسجین کە هۆکاری بوون و زیادبوونی ئاگرە، لە هەموو گریمانەیەکدا ناسووتێ، بەپێی گریمانە بێت لە ملیارێکدا بۆی هەیە جارێک نەسووتێ. نازانم کام بیریاری ئیسلامییەیە دەڵێ: لەوەچێ لەو یەک ملیار جارە ئەوە بووبێت کە ئیبراهیم پێغەمبەر کەوتبێتە ناوئاگرەوە! بۆیە نەسووتانی ئیبراهیم لە ئاگردا، مانای گەرمنەبوونی ئاگر نییە، چونکە ئاگر بە مەفهووم و چەمکە باوە گشتییەکەی شت دەسووتێنێت، بەڵام ئیتر نابێ بڵێی بەبێ گومان و ببەردەوام ئاگر هەر سووتێنەرە. نەخێر، دەکرێ ئاگر شت نەسووتێنێت. لەبەر ئەوە نابێ تۆ لەسەر شتێک هێندە سووربیت کە بڵێی لە سەدا سەد هەر ئەوەی خۆمە. مەبەستم لەم مەسەلەیە چی بوو؟ مرۆڤ کە فرەمەعریفە نەبوو، مەوسووعی نەبوو دەکەوێتە هەڵەوە. من کە هەموو سەرچاوەی زانیارییەکانم یەک شت بوو، دەکەومە هەڵەوە. تۆ سەرنج بدە لەناو موفتییەکاندا قسەی کامیان زۆرتر بەری دڵ دەگرێ؟ ئەوەیان کە زانیاریی زۆری لەبارەی زانستەکانەوە هەبێت، بەسەر زانستەکانی پزیشکی و جەبر و فیزیا و کیمیا و زانستی شەرعی و ڕیازیات. بەراورد بەو موفتییەی کە تەنها زانستە شەرعییە ئیسلامییەکانی وەرگرتبێ. پێم وابێ موستەفا مەحموود عەققادە کە ڕوو دەکاتە ئیعجازییەکان و دەڵێت:

«له خۆتانەوە مەڵێن قورئان گوتوویەتی زەوی خڕە، ئەی ئەگەر دەرکەوت سێ گۆشەیە؟» دواتر چۆن پینەی ئەوە دەکرێت؟! بە کورتییەکەی، کەمیی مەعریفە، تاکسەرچاوەیی مەعریفە، نەبوونی زانیاریی پێویست لە بوارە جیاوازەکانی ژیاندا، وا دەکات مرۆڤ بیرتەسک بێت، کە قسەش دەکات قسەکانی زیاتر حەددین، یا ڕەش دەبینێ یا سپی، لە کاتێکدا لە نێوان ڕەش و سپیدا هەزاران ڕەنگ هەن.

**گوڵنار: دکتۆر کۆتا قسە و پەیامتان چییە؟**

د. فەهمی: زۆر سوپاسی بەسەردنەوە و دیدارەکەتان دەکەم. ئەگەر بڵێم ئەم پەتایە هیچ نییە و شتێکی ئاساییە، ئەی بۆچی ئەم هەموو قسەیەی لەسەر دەکەم؟ وەکو لە دەستپێکدا وتم مرۆڤ کائینێکی کۆمەڵایەتییە و دانەبڕاوە لە ماجەرای ژینگە جۆرارجۆرەکانی ژیانی و بەشدایشە تێیاندا. بۆیە دەکرێ  قسەی هەبێت لەسەریان. شەست حەفتا ساڵە لێکۆڵینەوە لەسەر ڤایرۆس و مێشوولە دەکرێت، ئاساییە کە باس لە دیاردەیەکی پزیشکی و سیاسیی و کۆمەڵایەتی بکەین، چونکە ئەمە ئێستایش و لە داهاتوویشدا ڕوو دەدات. بۆیە بە سەرنجی من کۆرۆنا دیاردەیەک بوو هەر هەبووە و هەر دەیشبێت. وەک ئەوە وایە بڵێی: فڵانە کەس لەدایک بوو و، فڵانیش مرد. ئێ پێش ئەویش و دوای ئەویش خەڵک هەر لەدایک بووە و دەیشمرێ. کۆرۆناش هەر وابوو، بەڵام تیشکی خرایە سەر. ئەوەی کە لای من زۆر کاریگەر بوو لەم دیاردەی کۆرۆنایەدا و هەستمپێکرد، دەرکەوتنی  ئاشکرای نەرجسییەتی مرۆڤ بوو، بەخۆنازین و غرووری، وە شکانی ئەو غروورەشی! مرۆڤت بینی گریا، زەلیل بوو بوو. دڵنیام ڕۆژێک دێت ئەم مەسەلەیە لەناو ناواندا نەماوە، مرۆڤ دەچێتەوە دۆخەکەی جارانی و وەکو بڵێی، نە بای دیبێ و نە باران. ئەمەیشیان هەر شتێکی نامۆ نییە، چون مرۆڤ هەر وا بووە. ئەم سیفەتەیشی، خاڵی نییە لە جوانی و ناجوانی.



ئامادەکردنی: ڕێدار ئەحمەد

# نەخۆشی کورۆنا لەهەرێمی کوردستان
# چیرۆکە خۆش و ناخۆشەکان

ساڵی ٢٠٢٠ بۆ هەموو جیهان بەهۆی بڵاوبوونەوەی پەتای کورۆناوە ساڵێکی جیاواز بوو، مرۆڤایەتی لەم ساڵەدا و ئێستاشی لەگەڵدا بێت ڕووبەڕووی نەخۆشییەکی کوشندەی وەها بوویەوە، نەك هاتووچۆی نێوان وڵاتان، یان شارەکان، یاخود گەڕەکەکان، بگرە هاتووچۆی نێوان دراوسێکانیشی ڕاگرت. ئەم نەهامەتیەش بەدەر نییە لەبەسەرهات و چیرۆکی خۆش و ناخۆش، ئەوەی لەم بابەتەدا دەخرێتە ڕوو، شارۆیەکی کەم و پوختی هەندێك بەسەرهاتە لەنەخۆشخانەکانی تایبەت بەکورۆناوە بۆمان ئامادە کردوون، ناوی پزیشك و نەخۆشەکانمان نەنووسی، چونکە بەسەرهاتەکان نموونەن بۆ چەندین ڕووداوی هاوشێوەی خۆیان لەشوینی دیکە.

### پزیشک و کارمەندانی تەندروستی، سەربازە جەربەزەکانی شەڕی نوێ

کاتێ باس لەنەخۆشی کورۆنا دەکرێت، نابێت ڕۆڵی ئەو پزیشکە گیانفیدایانە لەبەرچاو نەگیرێت کەلەپێناوی پاراستنی هاونیشتمانیانیدا، لەکاتێکی سەخت و بێموچەییدا، شەونخونیان کێشا و خزمەتی توشبووانیان کرد، لەهەموو شارەکانی هەرێمی کوردستان ئەم دکتۆرە لەخۆبردووە قارەمانانە جێدەستیان دیارە و جێگای ڕێزن، خۆزگە وەک وەفایەک لەهەر نەخۆشخانەیەک پەیکەرێک، دیوار بەندێک، یان هەرشتێک کەیادیان زیندوو ڕابگرێت، دروست دەکرا. نابێت ئەوەشمان لەیاد بچێت کەچەندین دکتۆر گیانیان لەدەستدا، خوای گەورە بەشەهیدیان قبوڵ بکات.

کەلێرەدا باس لەدکتۆر ئەکەین لەپاڵ ئەواندا مەبەستمان هەموو ئەو کارمەندانەی تەندروستییە کە لەخۆبردووانە خزمەتیان کردووە. ئەو مرۆڤە مەزنانە گیانی خۆیان خستە مەترسییەوە لەپێناو پاراستنی گیانی هاونیشتمانیانیان.

### خێرخوازان پاڵەوانێکی تر بوون

لەبەرەنگاربوونەوەی کورۆنادا پاڵەوانێکی تر دەرکەوت، ئەویش خێرخوازان بوو، لەزۆربەی شارەکانی هەرێمی کوردستان زۆر بەخێرایی نەخۆشخانەی تایبەت دروست کران و تەواوی پێداویستی پزیشکیان بۆ دابین کرا، ئەمەش یەکێکە لەدیمەنە مرۆییە دڵخۆشکارەکانی کۆمەڵگاکەمان، کەبەڕاستی خزمەتێکی گەورەیان پێشکەش کرد، شایانی هەموو ڕێزو تەقدیرێکن.

### ئەزموونێکی نوێ

پەتای کورۆنا ئەزموونێکی تازە بوو بۆ حکومەت و دامەزراوە پزیشکییەکان، چونکە پێشتر شتی وا نەبوو، نەئەزانرا چۆن مامەڵە لەگەڵ ڕێگری لێ کردنی بکرێت، ئەگەر ئێمە پۆلێنی بکەین کورۆنا بەدوو قۆناغدا تێپەڕی، قۆناغی یەکەم کە سەرەتاکانی ٢٠٢٠ کەبەسەردەمی کەرەنتینە دەناسرا، چونکە هێشتا نەخۆشیەکە بەتەواوی نەگەیشتبووە وڵاتی خۆمان، ئەگەر هەشبووبێت ئەو نەخۆشانە بوون کەنیشانەیان نەبوو، مامەڵەکردن لەگەڵ نەخۆشێکدا زۆر قورسە کە نیشانەکانی نییە و کەرەنتینی دەکەیت بۆ ئەوەی کە نیشانەی لێ دەرکەوت جیای بکەیتەوەو بیبەیتە نەخۆشخانە، یاخود کەسێک نیشانەی نەبێت و پێی بڵێیت تۆ تووشی نەخۆشیەکە بوویت، ئەزموونی ئەوەی کە ڕووبەڕووبوونەوەی کورۆنا بەشێکی باش تێکەڵ بە سیاسەت کرا، متمانەیان بە دامەزراوە تەندروستییەکان نەبوو،

بەتایبەت دامەزراوە حکومییەکان، بەڕاستی قورس بوو وەک دامەزراوەیەکی تەندروستی قەناعەت بەخەڵک بکەیت، لەماڵەوە کەرنتینی بکەیت، لەکاتێکدا کە نیشانەی نییە، قۆناغی دووەم ئەو قۆناغە بوو متمانە گەڕایەوە بۆ نەخۆشخانەو دامەزراوە تەندروستییەکان و پزیشک و کارمەندانی تەندروستی و خەڵک ڕوویکردەوە نەخۆشخانەکان و سوپاسگوزار دەبوو کە خزمەتێک بکرێت، بەڵام بۆ ستافی نەخۆشخانەکان بەهۆی کەمی توانای مرۆیی و ماددی ڕووبەڕووبوونەوەی کورۆنا زۆر زۆر نارەحەت بوو، چونکە کورۆنا هاوتەریب بوو لەگەڵ قەیرانی درایی و نەبوونی موچەدا. لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە کورۆنا کاری زۆری کردە سەر پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، کورۆنا پێوەرەکانی گۆڕی، بیرکردنەوەی گۆڕی، ئەنجامگیرییەکی هەبوو کە پێش کورۆنا جیاوازە لەپاش کورۆنا و ئەوەش دەبینین.

هەر لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە ئەوەی جێی سەرنجە دابەشبوونی خەڵک بوو بەسەر چەند گروهێکدا، گروهێک کاتێ یەکێکیان تووشی کورۆنا دەبوو زۆر بەخەمییەوە بوون، گروهێکیش هەبوو کاتێ کەسێکیان تووش دەبوو بەتەواوەتی فەرامۆشیان دەکرد، لەو نێوەندەدا گرۆهی وەسەت کەم بوو، چەندجار هەبووە نەخۆش زۆر زۆر نارەحەت بووە، کەس و کارەکەی بەشتێکی سادە وەریان گرتووە، تا نەمردووە نەیان هێناوەتە خەستەخانە، نەخۆشیش هەبووە هەڵامەتێک یان تایەکی کەمی هەبووە بەزۆر هێناویانە بۆ نەخۆشخانە و داوایان کردووە داخڵ بکرێت و دوو سێ کەسی لەگەڵدا بووە.

خاڵێکی تر ناهاوسەنگی لەمامەڵەکردن لەگەڵ نەخۆشی کورۆنا لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە، بەتایبەتی ئەو کەسانەی کە هاودەم و موڕافیقی نەخۆشەکان بوون، بەچاوی خۆیان ئەیانبینی نەخۆشیەکە جددییە، نەخۆشەکەیان هیلاکە، لەوانەیە هەندێکیان نەخۆشەکەشیان دوای ماوەیەک لەتووشبوونی بە کورۆنا مردبێت، بەڵام هەر ئەو کەسانە پاش ئەوەی نەخۆشەکەیان دەمرد، یان سوپاس بۆ خوا چاک دەبوویەوە، دەتبینین هیچ پابەندییەکیان بەڕێنماییە تەندروستییەکانەوە نەبوو.

یەکێک لە خاڵە ناخۆشەکانی تر هەوڵدانی خەڵک بوو بۆ نۆبە بڕی و واسیتەکردن، خاڵێکی دیکە ئەوە بوو نەخۆشی کورۆنا نەخۆشیەک نەبوو بتوانی مامەڵەیەکی زانستی ڕەهای لەگەڵدا بکەیت، لەبەر ئەوەی زانیارییەکان ڕۆژانە ئەگۆڕا، چۆنیەتی ڕووبەڕووبوونەوەو چارەسەری گۆڕانی بەخۆیەوە دەبینی، بەداخەوە تا ئێستاش ڤاکسین وەک چارەسەرێکی بنەڕەتی نییە، بۆ نموونە ئەگەر دووکەس لەیەک ماڵدا دوانەش بوونایە، هەمان بڕی ڤایرۆس لەگیانیاندا بووایە، هەمان عیلاجیان بۆ بەکار بهێنرایە، بۆی هەبوو یەکێکیان سوودی لەعیلاجەکە وەربگرتایە، کەسەکی تریان وەرینەگرتایە.

## چیرۆکە خۆش و ناخۆشەکان

کاتێ لەگەڵ ئەو پزیشک و کارمەندە تەندروستیانەدا قسە دەکەیت، کە لەخۆبردووانە لەنەخۆشخانەکانی تایبەت بەکورۆنا خزمەتیان کردووە، چەندین سەربردەو چیرۆکی ناخۆش و خۆشیان لایە، خستنە ڕووی ئەم چیرۆکانە لەلایەک بۆ گواستنەوەی دیمەنێکی نەهامەتیەکەیە، لەلایەکی دیکە بۆ پەند وەرگرتنە لەڕووداوەکان، لێرەدا بەهاوکاری چەند پزیشکێکی بەڕێز، چەند بەسەرهاتێک دەخەینە بەردەستی خوێنەران.

## یەکەم کەس ئەمرێت ئەبێت من بم

لەیەکێک لەنەخۆشخانەکانی تایبەت بەڕووبەڕووبوونەوەی نەخۆشی کورۆنا، دکتۆرێک بۆی باس کردین: «ئەو کاتەی بڕیاری کەرەنتینە دراو هەرێمی کوردستانیش ئامادەسازیی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی نەخۆشی کورۆنا دەست پێکرد، وەک یەکەم پزیشک لەشارەکەم دیاری کرام، حاڵەتێکی ناخۆش بوو بۆم، چونکە ڕۆژانە دەمانبیست لەوڵاتی ئێران چەندین کەس بەهۆی کۆرۆناوە گیان لەدەست دەدەن، نەخۆش ئەمرێت، دکتۆر ئەمرێت، کارمەندی تەندروستی ئەمرێت، بەڕاستی مانگی سێ زۆر ناخۆش بوو، لەبەر ئەوەی یەکەم کەس ئەوانەی دەگەڕانەوە هەرێمی کوردستان من ئەمبینین لەبەر ئەوە ئەگەر هەبوو یەکەم کەسیش ئەمرێت من بم».

## بژاردەیەکی تاڵ

ئەو لەیەکەمینی ئەو کەسانە بوون لەئێران گەڕانەوەو دەبوو کەرەنتینە بکرێن، ئاوا باسی گەڕانەوەیان دەکات: «لەڕاستیدا هەواڵی بڵاوبوونەوەی کورۆنا تۆقێنەر بوو بۆمان، کە گەڕاینەوە هەرێمی کوردستان نەماندەزانی لێرە چی دەبێت، دوو بژاردەمان لەبەردەمدا بوو، وەک عەرەب ئەڵێ (أحلاهما مر) خۆشترینەکەیان تاڵ بوو، دەبوو بچینە کەرەنتینە، ئەوەش یەکەم وەجبەی کەرەنتینە بوو، کە هیچمان لەبارەیەوە نەدەزانی، یان بەقاچاغ بچینەوە ناو ماڵ و منداڵ و کەس وکاری خۆمان، ئەمەشیان ناخۆش بوو، لەبەر سەلامەتی ماڵ و مناڵمان، بۆیە هەردوو بژاردەکە یەک لەیەک تاڵتر بوون، هەرچۆنێک بێت من ئەوەم هەڵبژارد بچمە کەرەنتینە و چواردە ڕۆژ لەوێ مامەوە، بەداخەوە بەشێک لەوانەی ڕێگای قاژاغیان گرتەبەر و نەچوونە کەرەنتینە ئەوانە بوون لەخوێندنی باڵا دەیانخوێند، ئەوەش جێگای سەرنجە، کەسێک گەیشتبێتە ئاستی خوێندنی باڵا بەڵام لەخەمی تەندروستی گشتیدا نەبێت، هەندێک لەمانە دواتر بۆیان باس دەکردین خۆزگەیان دەخواست بچونایەتە کەرەنتینە چونکە لەنێو خێزان و بنەماڵەو خزمانیاندا بەچاوی گومان، یان وەک تووشبوو نەخۆش سەیریان دەکرا، ئەمەش لەسەر دەروونیان زۆر ناخۆش بووە».

## ئەترسم بمرم و ئەو منالەمان نەبینم

دکتۆرێک وتی:

«باسکردنی ئەم بابەتە سەختە، چونکە شتە ناخۆشەکانی زۆر زیاترە لەشتە خۆشەکانی، لەمانگی شەش و حەوتدا شتی زۆر ناخۆشم بینی، کۆمەڵێک نەخۆشی زۆر زۆر هەبوو، خەڵکی زۆر ئەمرد، بەشێکیان گەنج بوون، بۆ نموونە نەخۆشێکمان هەبوو مرد، تەمەنی سی و نۆ ساڵ بوو، سێ چوار منالی هەبوو، ژنەکەی دووگیان بوو، ئەیووت دکتۆرگیان بەخوا ئەترسم بمرم و ئەو منالەمان نەبینم».

یەکێکی دیکە لەڕووداوەکان دکتۆرێک بۆی باس کردین:

« کوڕێک لەئەوروپا گەڕابووەوە، لێرە سەرپەرشتی مۆتێلێکی دەکرد، خێزانەکەی ئەورووپی بوو، ژنەکەی دووگیان بوو گەڕابووەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی تالەوێ منداڵی ببێت، ئەم کوڕە لێرە تووشی کورۆنا بوبوو، لای ئێمە لەنەخۆشخانە داخڵ کرا، کەس و کاری هیچیان لێرە نەبوون، هەموویان لەئەوروپا بوون، ڕۆژێکیان پێی وتم: دکتۆرگیان لەدوێنێوە دەستی سەرئاوم هەیە ناتوانم بڕۆم، چونکە ئۆکسجینەکە لێ بکەمەوە ئەخنکێم، کەس نییە بمبات، زۆرم پێ ناخۆش بوو کە وای وت، ئیتر لێرە لەڕێی دکتۆرێکی ناسیاوی خۆیانەوە کەسێکمان بەکرێ بۆ تەرتیب کرد تا ئاگای لێی بێت، بەڵام ڕۆژ بەڕۆژ حاڵی خراپتر ئەبوو، زۆر زۆرم پێ ناخۆش بوو، ئاخر دەقە کەحاڵی زۆر ناڕەحەت بوو وتی: دکتۆر توخوا مەڕۆ، بڕیارماندا کە سۆندەی هەناسەدانی دەستکردی بۆ دانێین، لێی پرسیم دکتۆر تۆ ئەڵێیت چی؟ زۆر هیلاک بوو، تەحەمولی نەمابوو، هەرئەبوو بۆی دابنێین، وتم دایبنێین باشترە، بەداخەوە مردو کۆرپەی تازەی نەبینی».

## ناخۆشترین ڕۆژ

ناخۆشترین ڕۆژمان ئەو ڕۆژە بوو کە ویستمان نەخۆشەکان لەنەخۆشخانەیەکەوە بگوازینەوە بۆ نەخۆشخانەی تایبەت بەکورۆنا، قەیرانی نەمانی ئۆکسجین دروست بوو، ئەو ڕۆژە حەوت نەخۆشمان مرد، بەڕاستی ئەوە ناخۆشترین ڕۆژم بوو، ئەو ڕۆژە زۆر گریام، هەتا تەلەفونم کرد بۆ بەڕێوەبەری گشتی تەندروستی و داوام کرد واز بهێنم، چونکە ئێمە زۆر هیلاک ئەبووین لەملاوە، لەولاوە کەمی ئۆکسجین زەربەی گەورەی لەئێمە ئەدا، نەخۆش هەبوو یەک مانگ خزمەتمان کرد، ئەو ڕۆژە وەفاتی کرد، بۆیە بەڕاستی زۆر زۆر ناخۆش بوو، لەسەر تەکلیفی چەندین کەس پەشیمانیان کردمەوە لەوازهێنان، ئیتر بەردەوامیمان دا بەکارەکەمان».

ئەمە گێڕانەوەی پزیشکێکە لەنەخۆشخانەیەکی تایبەت بەکورۆنا.

### گەنجانیش قوربانی بوون

« نەخۆش هەبوو، گەنج بوو، حەفتاو هەشت ڕۆژ لەگەڵیا خەریک بووم، نەخۆش هەبوو شەست ویەک ڕۆژ لەگەڵی خەریک بووم، بیست و سێ ساڵ بوو، کەچی لەکۆتاییدا وەفاتیان کرد، ئەمە بۆ ئێمە زۆر ناخۆش بوو، چونکە حەفتاو هەشت ڕۆژ لەگەڵ نەخۆشێکدا بیت و چارەسەری بکەیت و ئاگات لێی بێت و زۆر بەرەو باشی بچێت، بەڵام لەپڕێکدا ئەمردن زۆر زۆر ناخۆش بوو، ئەتوانم بڵێم ئێمە ڕۆژانە ئەوانەمان دەبینی».

### کاسبکارمان نییە جگە لەمە

نەخۆشێکی ترمان هەبوو تەمەنی پەنجاو سێ ساڵ بوو، ڕۆژێکیان خێزانەکەی وتی: دکتۆر نۆ منداڵمان هەیە، هەشتی کچەو یەکێکیان کوڕە، توخوا هەوڵ بدەن ئەم پیاوەم تیا نەچێت، بەخوا کاسبکارمان نییە، بەخێوکاریان هەر ئەم پیاوەیە، زۆر زۆر هەوڵمان لەگەڵدا، بەرەو باشیش دەچوو، بەداخەوە ئێوارەیەکیان لەپڕدا وەزعی تێکچوو، ئەویش وەفاتی کرد، بەڕاستی ئەوە زۆر ناخۆش بوو بۆ ئێمە».

### ڕۆژی ناخۆش زۆرە

«نەخۆشێکمان هەبوو، دکتۆر بوو، تەمەنی چل ویەک ساڵ بوو، منالی بچوکی هەبوو، لەعینایە بوو ئیستیجابەی هەبوو، باش بوو، بردمانە قاوش دامان نا، دڵمان زۆر پێ خۆش بوو کەئەمە بەرەو باشی ئەڕوات، ئەویش عەسرێکیان لەپڕدا وەزعی تێکچوو لەماوەی یەک سەعاتدا گیانی لەدەستدا، ئەمەش ڕۆژێک بوو لە ڕۆژە ناخۆشەکانمان».

### پێشتر لەپەتای تر چاک بووبوویەوە

«نەخۆشێکمان هەبوو تەمەنی چل و دوو چل وسێ ساڵ دەبوو، ڕۆژێک چووم بۆ لای زۆر هیلاک بوو، بەڵام منی ناسییەوە، وتی: دکتۆر من دەمێکە بەدوای تۆدا ئەگەڕێم، سەیرم کرد ئەم نەخۆشە دوو ساڵ پێش ئێستا تووشی نەخۆشی ئەنفلۆنزای بەراز بوبوو، لەنەخۆشخانەی جمهوری داخڵمان کرد چووە سەر سۆندە، ئەوەند هیلاک بوو چووە سەرسۆندەی هەناسەدان، یەکێک بوو لەنەخۆشە زۆر هیلاکەکانی ئەو ساڵەی نەخۆشی ئەنفلۆنزای بەراز، کرێکار بوو، ماڵ و منالێکی زۆری هەبوو، لەخوا بەزیاد بێت لەئەنفلۆنزای بەراز دەربازی بوو ڕۆشتەوە، کەچی تووشی کورۆنایەکی زۆر خراپ بوو، داخڵ کرا، کەچاوی بەمن کەوت منی ناسییەوە، وتی: دکتۆر توخوا فریام کەوە، من دەمێکە بەدوا تۆدا دەگەڕێم، زۆر زۆر هیلاک بوو، عیلاجمان پێدا، کەمێک بەرەو باشی چوو، بەڵام زۆری نەبرد حالی خراپ بووەوە، سۆندەمان بۆ دانا، بەڵام بەداخەوە وەفاتی کرد».

### یەکێک لەڕۆژە هەرە ناخۆشەکان

یەکێکی تر لەڕۆژە ناخۆشەکانی من، باوکێک و دایکێک و کوڕێک لەوێ بوون، لەماوەی دە ڕۆژدا هەرسێکیان وەفاتیان کرد، ئەوەش بۆ ئێمە زۆر زۆر ناخۆش بوو، یەکەمجار باوکەکە مرد، دوای ئەوە دایکەکە، خوشکەکانی دەیانووت توخوا دکتۆر هەوڵ بدەن ئەم برایەمان گەنجە بەڵکو نەمرێت، زۆر بەداخەوە پاش هەوڵێکی زۆر، بەڵام ماوەیەکی کەمی برد ئەویش وەفاتی کرد».

### نەخۆشی بێکەس

یەکێک لەو ناخۆشیانەی ڕووبەڕوومان دەبوویەوە لەنەخۆشخانەکانی تایبەت بەکورۆنا ئەوە بوو نەخۆشمان هەبوو هیچ کەس لە کەس و کارەکەی نەیاندەوێرا بێن بەلایدا، بەڵام دەهاتن معاون طبیان بەکرێ دەگرت بۆی، تا مردیش خۆیان نەهاتن بەلایدا، ئەوەم زۆر پێناخۆش بوو».

«بەیانییەکیان کەچووم بۆ لای نەخۆشەکان، بینیم نەخۆشێکمان کە پیاو بوو دەگریا، وتم: بۆ ئەگریت؟ وتی: دکتۆر من سێ چوار مانگ پێش ئێستا خێزانم مردووە، منداڵی وردم هەیە، هەموویان لەلادێیەکن، کەس نییە ئاگای لێیان بێت، پارەیان پێ نییە، دەیوویست بڕواتەوە، پێمان وت ئێمە ئەوەت بۆ چارەسەر ئەکەین، لەڕێی دکتۆرێکی برادەرەوە لەشارێکی نزیک ئەو لادێیە ڕامان سپارد بڕێک پارە ببات بۆ ئەو ماڵە، بەوەش قەناعەتمان پێکرد تا نەڕواتەوە».

### خۆشترین ڕۆژ

ئەوەی کە خۆش بوو، نەخۆشێکمان هەبوو تەمەنی چل و سێ ساڵ بوو، ڕۆژێک چووم بینیم ئەگری، وتی: دکتۆر تەنها دوو کچم هەیە، توخوا لەبەر ئەو کچانە شتێ بکە نەمرم، لەخوا بەزیاد بێت پاش مانگێک مانەوە لای ئێمە چاک بوویەوەو ئێستا لەنێو ماڵ و منداڵی خۆیدایەو سەلامەتە و ئیش و کاری خۆی ئەکات.

نەخۆشمان هەبووە سێ مانگ لەلامان بووە، نەخۆش هەبووە سەدو دە ڕۆژ لامان بووە و بەسەلامەتی ڕۆشتووەتەوە ناو ماڵ و منداڵ و کەس وکاری، ئەوانە لەڕۆژە خۆشەکانن. کەنەخۆشێک چاک دەبوویەوە زۆر زۆر بۆ ئێمە خۆش بوو.

### گەڕانەوەی نادیار

لەسەرەتای بڵاوبوونەوەی نەخۆشی کورۆنادا بەهۆی ئەوەی لەوڵاتی ئێران زۆر زوو بەخێرایی بڵاو بوویەوە، بۆیە ئەوانەی لەئێران گەڕانەوە کەرەنتین کران، ئەمانیش چەندین چیرۆکی خۆش و ناخۆشیان هەیە.

### کەرەنتینەی نارێک

یەکێک لەو خوێندکارانەی لەئێران گەڕابوونەوە ئاوا باسی گەڕانەوەیانی کرد:
«لەڕاستیدا گەڕانەوەی لەناکاومان بۆ هەرێمی کوردستان تووشی ترس و شڵەژانی کردین، نەخۆشیەکە زۆر خەڵکی تۆقاندبوو، لەهەمووی ناخۆشتر ئەوە بوو هەموو ئەوانەی لەئێران هاتبووینەوە تێکەڵ یەک دەکران و پاسەکان پڕبوون لەنەفەر، هەربۆیە ترسەکەمان زیاتر دەبوو، چونکە کەسێکی تووشبوو ئەگەر هەبێت لەپاسێکدا ئەوا بەسە بۆ ئەوەی هەمووان تووش بکات».

### شوێنی کەرەنتینە

لەسەرەتاوە شوێنی تەرخانکراو بۆ کەرەنتینە نارێک بوو، دیسان لێرەش زۆر کەس بەیەکەوە دانرابوو، تا دواتر ڕێکیان خست و ژووریان تەرخانکرد بۆ چەند کەس بەیەکەوە بن، لەهەمووی ناخۆشتر ئەوە بوو زۆرکەس وایدەزانی هەموو ئەوانەی لەئێران هاتوونەتەوە تووشی ئەم نەخۆشییە بوون، خزم و کەس و کاریشمان تەنها بەتەلەفون پەیوەندییان لەگەڵمان هەبوو، خەمی زۆری ئێمەیان بوو.

### حیکایەتەکانی کەرەنتینە

کەرەنتینە بەدەر نییە لەبەسەرهاتی خۆش و ناخۆ، لەڕووداوە ناخۆشەکان، کەس هەبوو تەنها یەک سەعات بوو گەیشتبووە شاری مەریوان و بڕیاری گەڕانەوەو کەرەنتینە دەرچوو بوو، ئەمە زۆر ناخۆش بوو بۆی ئەو هەموو ماوەیە لەبەر یەک سەعات چوونە شاری مەریوان بمێنێتەوەو لەچاوەڕوانی ئەنجامی پشکنینەکەیدا بێت.
شوێنی مانەوە لەکابینە گەشتیارییەکانی سەرچنار لەسلێمانی زۆر خۆش بوو، گەنجێک دەیووت: هەموو جارێک کەبەلای ئەم شوێنەدا تێپەڕ ئەبووم خۆزگەم ئەخواست بۆ یەک شەویش بێت لێرە بمێنمەوە. لەنێو ئەوانەی لەئێران گەڕابوونەوە هەبوو خێزانەکە پێکەوە لەئێران بوون و گەڕابوونەوە، کابینەی گەشتیاریان وەرگرتبوو، کیشەیان نەبوو، سێ ژەمە خواردنیان بۆ دەهات، ئەمانە دەیانووت ئەگەر حکومەت دەرمان نەکات حەز ئەکەین هەر لێرە نیشتەجێ ببین.
پاش چەند ڕۆژێک لەکەرەنتینە کرانمان، شوێنی مانەوەمان خۆش بوو، پشکنینمان بۆ دەکرا، خواردن باشتر بوو، هێڵی ئینتەرنێتمان بۆ دابین کرابوو، لەکاتی ناوتۆمارکران سەرپەرشتیارانی کەرەنتینەکە بۆیان دەرکەوت یەکێک لەو گەنجانەی لێرە کەرەنتینە کراوە سەفەری ئێرانی نەکردووە، لەشارەکەی خۆی نەچووەتە دەرەوە، بۆیان دەرکەوت هاتووە لێرە لەم شوێنە بەئیسراحەت پاڵی لێداوەتەوەو سێ ژەمی نانی باشی دێتە بەردەست و ئینتەرنێتی بەلاشی دەستکەوتووە، بۆیە زوو بەڕێیان کرد.

## بێکەسی کەس زۆر

یەکێک لەدکتۆرەکان بەدەم هەڵکێشانی هەناسەیەکی قوڵەوە وتی: ئەوەی ئێمە لەنەخۆشخانەی تایبەتی کورۆنا ئەمانبینی، یاخوا کەس لەخەویشا نەیبینێت، نەخۆش هەبوو کەسی زۆر ناسراوو دیار بوو، یەک کەس لەخزم و کەس و کارەکەی لای نەمابوونەوە، خۆیشی زۆر بێ ورە بوو، هەمیشە چاوی لەسەر جیهازی دەرخەری ڕادەی ئۆکسجین بوو، یەک نمرە کەمی بکردایە ئەیووت ئەمرم، بەداخەوە کەس و کارەکەی کەسیان خەمی جددیان لێ نەخوارد، ئەو ڕۆژەی وەفاتی کرد، هەموو تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان پڕبوو لەوێنەی، پڕ کرابوو لەشیعر و پەخشان و لاواندنەوەی، بێکەسی کەس زۆر ئەمەیە.

## دابەزینی ورە

یەکێک لەو کێشانەی لەنەخۆشخانەکانی تایبەت بەکورۆنا هەمانبوو دابەزینی ورەی نەخۆش و ترسانی بوو، یەکێک لەنەخۆشەکانمان نووسەرێک بوو، کەلای ئێمە داخلکرا حاڵی باش بوو، بەڵام پێش چەند ڕۆژێک خزمێکی نزیکی بەهۆی کورۆناوە وەفاتی کردبوو، ئەوەی لەدڵدا بوو، هەردەیووت منیش وەک ئەو ئەمرم، ورەی بەتەواوەتی لەدەستدابوو، ئەوە بوو پاش چەند ڕۆژێکی کەم وەفاتی کرد.

## خانەوادەی باش

ئافرەتێک تووشی کورۆنا بووبوو، مێردەکەی و کوڕ و کچێکی بەردەوام لەلای دەمانەوە، زۆر بەجوانی و دڵسۆزانە خزمەتیان دەکردو بەدەمییەوە بوون و ورەیان بەرز دەکردەوە، ئەم ئافرەتە حاڵی باش نەبوو، سی و دوو ڕۆژ لای ئێمە مایەوە، ئەم خێزانە ماندوو نەبوو لەخزمەتکردنی، یەکێکیان بخەوتایە دووانیان بەخەبەر بوون بەدیارییەوە، سوپاس بۆ خوا چاک بوویەوەو ئێستا بەسەلامەتی لەناو ماڵ و منداڵیدایە.

## دیمەنی جەرگبڕ

یەکێک لەو دیمەنە جەرگبڕانەی دووبارە دەبوویەوە ئەوە بوو، کاتێ بەکەسێک دەگوترا تووشی کورۆنا بوویت و پێویستە داخڵ بکرێیت، یەکسەر توانای لەدەست ئەداو ئەکەوتە سەر زەوی، دوو برا بەیەکەوە هاتن و پشکنینەکانیان وا دەرچوو کە تووش بوون، هەمان حاڵەتی توانا لەدەستدان ڕوویدا، پاش ماوەیەک برایەکیان گوێزرایەوە بۆ بەشی چاودێری چڕ، بەداخەوە وەفاتی کرد، براکەی تری بەمردنی ئەوی نەدەزانی تا ئەوکاتەی چاکبوویەوەو لەنەخۆشخانە دەرچوو.

## ناشتنی مردووان

نەک هەر لەکاتی نەخۆشی، بەڵکو بە مردووییش زۆر کەس نەیدەوێرا توخنی ئەوانە بکەوێت کەبەهۆی کورۆناوە گیانیان لەدەستداببوو، ئیتر ئەمە بەهۆی ئەو ڕێوشوێنانەی ناشتنەوە بووبێت یان تۆقینی کەسەکان. ئەوەبوو دەمانبینی لاشەی مردووەکە لەسندوقدا بە گوریس شۆڕ دەکرانە ناو گۆڕەکە. زۆر جار خاوەن مردوو نەیدەتوانی بۆ دواجار ڕووی مردوەکەی خۆی ببینێت، ئەمەش لەدیمەنە جەرگبڕەکانی ئەم کارەساتە بوو.

## ڕۆڵی ڕاگەیاندن لە کاتی پەتاکەدا

لەهەموو ڕووداو و کارەساتەکاندا ڕاگەیاندن ڕۆڵی خۆی دەگێڕێت، لەڕاستیدا میدیای کوردی ڕۆڵێکی تۆقێنەری هەبوو، سەیری هەر کەناڵێکی بینراوت دەکرد نووسرابوو بەپەلە ئەوەندە کەسی تر لەفلانە شار مردن، لەفیسارە وڵات کورۆنا ئاوای بەسەر خەڵک هێناوە، تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان پڕبوو لەوێنەی مردووان، ئەمەش ترسی لای هاوڵاتیان زیاتر کردبوو، بەڕاستی بابەتی میدیا لەکاتی بڵاوبوونەوەی کورۆنادا حەق وایە ماستەرنامەو دکتۆرای لەسەر بنووسرێت، لەپاڵ ئەمەدا ناکرێت ئەوەشمان لەیاد بچێت کە ڕۆڵیان هەبووە لەبڵاوکردنەوەی هۆشیاری خۆپاراستن.

## نامەی کەسێک لەو نەخۆشییە چاکبووەتەوە

«سوپاسی خوای گەورە بەهێندەی نیعمەتەکانی کە ئێستا هەست بە باش بوون دەکەم لە نەخۆشی کورۆنا، قەرزار و منتەباری نزاکانی ئێوەم دڵنیام کە دوعای ئێوەی خۆشەویست بووە هۆی شیفای حاڵی من. خوای بەڕەحم و بەزەیی هەموو دوعای خێرەکانتان لێ قبوڵ بکات، سوپاسی هەواڵ پرسینەکانتان دەکەم، داوای لێبوردن کە نەمتوانیوە وەک پێویست وەڵامی ئێوە بدەمەوە، گەردنم ئازاکەن، گەردنتان ئازاد بێت.

ئازیزەکانم عیبرەتێک بۆ ژیان، زۆر سەیرە چل و سێ ساڵ ئۆکسجینی خۆڕایی و بۆنی گوڵ و گیا و باران و بەشەو و ڕۆژ ... بەراورد بە تەنها پانزە ڕۆژ ئۆکسجین بە بتڵ و سۆندە و جهازی هەناسەدان، چۆن و بە چەند حیسابی بکەم باری نیعمەتەکانت بەمن هەژمار ناکرێت، ژیری هەژمارەکەیش هەژماری دەوێت».

بیرەوەریەکانی
مەولود باوەمراد
بەشی پێنجەم



# ساڵێکی پڕ لە ڕوداو و کارەساتی گەورە

ڕژێمی بەعس لە مانگەکانی سەرەتای ساڵی ١٩٨٨وە دەستی بە هەڵمەتەکاتی ئەنفال بۆ وێرانکردنی کوردستان و جینۆسایدکردنی گەلی کورد و بەسوتماککردنی خاکەکەی کردبوو، لە ١٩٨٨/٢/٢٢دا یەکەم قۆناغی وەک ناونرابوو»پرۆسەکانی ئەنفال» لە پارێزگای سلێمانی دەستپێکرد و هەشتەم قۆناغی لە ٦/ ١٩٨٨/٩ لە پارێزگای دهۆک و سەرجەم ناوچەی بادینان کۆتایی پێهات.

حکومەتی عێراق لە کفرییەوە تا زاخۆ و پێشخاپوری سنوری تورکیای کردە گۆرەپانی ئۆپەراسیۆنە سەربازیەکانی ئەنفال و هەمووی وێران و چۆلکرد، ئەم کارەساتە دووبارەکردنەوەیەکی جەهەنەمی و ترسناکی ڕووداوی ڕاگواستنەکانی خەڵکی سنورەکانی نێوان عێراق و ئێران بوو بۆ ئۆردووگا زۆرەملێکان، پاش ڕێکەوتنی شومی جەزائیر لە ١٩٧٥/٣/٦ لە نێوان شای ئێران و سەدام حسین دا، بەڵام ئەمجارەیان حکومەتی بەعس پێش ڕێکەوتنەکەی لەگەڵ ئێراندا ئەم کارەساتەی خولقاند.

هەرلەم ساڵەدا – وەک پێشتر ئاماژەم بۆ کرد- کارەساتی کیمابارانکردنی شاری هەڵەبجە لە ١٩٨٨/٣/١٦دا لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە بەسەر خەڵکی مەدەنی و بێدەرەتانی شارەکەدا هێنرا. هەر لەم ساڵەدا شەڕی عێراق/ ئێران کە لە ١٩٨٠/٩/٢٢ لەلایەن ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشەوە–مجلس قیادە الثورة- بە فەرمی ڕاگەیەنرا و دەستپێکرد لە ٨ی ئابی ١٩٨٨دا بەگوێرەی بڕیاری(٥٩٨) ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیەکگرتووەکان ڕاوەستا، لە ٢٠ی ئاب هەردوولا پابەندبوونی خۆیان بە ئاگربەست ڕاگەیاند، بەگوێرەی هەمان بڕیار هێزەکانی ئاشتی پارێزی نەتەوەیەکگرتووەکان، لە گۆڕەپانی جەنگی نێوان هەردوو وڵاتدا جێگیرکران.

لەگەڵ کۆتایی دوا قۆناغەکانی ئەنفالدا لە ١٩٨٨/٩/٦ و هاوکات لەگەڵ ڕاگرتنی شەڕی نێوان عێراق ـ ئێران، حکومەتی عێراق لێبوردنی گشتی بۆ کورد دەرکرد.

ژمارەیەک کەس و خێزان لە ئۆردوگاکان گەڕانەوە بۆ عێراق، بەڵام هێڵی ڕێکخستنی ئێمە ژمارەیەکی زۆر کەمیان گەڕانەوە؟ بەپێچەوانەی چاوەڕوانی (د.ابو یونس ) و برایانی تری سەر بە ڕێکخستنی ئێخوانی تاراوگە لە ئێران؟ وەک بڵێی ئێوە گرەوتان لەسەر زەمەن و چاوەڕوانی فرسەتێکی گۆڕانی دۆخەکەتان دەکرد بۆ گەڕانەوە، عەجەبا؟ چەند کەسێک نەبێت کەستان نەگەڕانەوە؟ چەند کەس ئەو پرسیارەیان ئاڕاستەی بەندە کرد.

هاوکات حکومەتی عێراق نووسینەوەی پرۆژەی دەستوری هەمیشەیی بۆ عێراق ڕاگەیاند، کە جۆرێک لە چاوەڕوانی لای کەسایەتییە سیاسیی و حزبییەکان دروستکرد، بەهیوابوون حزبی بەعس دەرسێکی لەم هەمووماڵوێرانی و دارمانەی تەواوی بونیادەکانی دەوڵەت و کۆمەڵگەی عێراقی وەرگرتبێت و گۆڕانکارییەک بەسەر سیستمی سیاسی

عێراق و دەسەڵاتی تاکحزبی فەرمانڕەوادا بێنێت و کرانەوەیەکی سیاسی بێنێتە ئاراوە، لەوانە د.ئەبو یونس بوو، ڕای وابوو لەوانەیە لە دەستوری نوێدا ڕێگە بەفرەیی سیاسیی و کاری حزبی بدرێت، ئەمەش فرسەتێکی باشە تابرایانمان لە ناوخۆ لانیکەم لە گرتن و ڕاوەدونان ڕزگاریان ببێت. دواتر پرۆژەی دەستورەکە ڕاگەیەنرا هیچ گۆڕانکارییەکی بە ئاقاری فرەیی و دەستبەرداربوونی حیزبی بەعسی لە تاکحزبی و حزبی سەرکردەی تیانەبوو، بەڵام نەخرایە بواری کارپێکردن تا ڕووخانی ڕژێم. ڕاگەیاندنی ڕاگرتنی شەڕ لەلایەن کۆماری ئیسلامیی ئێرانەوە دوو لێکەوتەی جیاوازی لەناو خەڵکی ئاوارەی کوردستانی عێراق لە کۆماری ئیسلامیی ئێراندا لێکەوتەوە:

١- چارەنووسی هێز و لایەنە سیاسییە چەکدارەکان لەمەوپاش چی و چۆن دەبێت؟

٢- هەڵوێستی خەڵکی سڤیلی ئاوارە و پەناهەندەی نیشتەجێ لە ئۆردوگا و شارەکانی کۆماری ئیسلامیی ئێراندا، بە چ ئاقارێکدا دەڕوات؟

بەشێکی زۆر لە حیزب و ڕێکخستنە سیاسییە چەکدارەکان، بەم بڕیارە نێودەوڵەتییەی ڕاگرتنی شەڕی هەشت ساڵەی نێوان عێراق و ئێران و جێگیرکردنی هێزە ئاشتی پارێزە نێودەوڵەتییەکان بەسیفەتی چاودێری ئاگربەست لە نێوان هەردوو بەرەی شەڕدا، بەکردەیی و لەسەر زەوی سەنگەری دواوەی هەرجۆرە چالاکییەکی سەربازیان لە دژی حکومەتی بەعس و بە ئاڕاستەی ناوخۆی عێراق لێداخرا، بەدڵنیاییی وەک پێویستییەکی پابەندبوون بە ڕێکەوتنەکە و یەکەم هەنگاوی ئاگربەست بەرپرسانی حکومەتی کۆماری ئیسلامیی ئێران بە هەموو ئەو حیزب و هێزە سیاسییانەی کە هێزی چەکداریان هەبوو وەک ئۆپۆزسیۆنی عێراق ڕاگەیاندبوو، کە ئەوان بە بڕیاری ڕەهبەری گەورەی کۆماری ئیسلامیی ئێران(ئایەتوڵڵا خومەینی) بڕیاری ڕاگرتنی شەڕیان لەلایەن نەتەوەیەکگرتووەکانەوە لەگەڵ عێراق قبوڵکردووە، ئاگربەستیان ڕاگەیاندووە دەبێت ئێوەش ئاگری تفەنگەکانتان لەسەر سنوری هەردوولا خامۆشکەن.

هێزە کوردییەکان کەوتنە کۆبوونەوە و کۆنفرانس بەستن بۆ وەرگرتنی بڕیاری پێویست لەسەر چۆنیەتی تەعامولکردن لەگەڵ ئەم دۆخە نوێیەدا، بەشێکی بەرچاو لە کەسایەتییە سیاسیی و خێزانی بەرپرسانی هێزە کوردییە چەکدارەکانی نیشتەجێی ئێران سەرقاڵی پەیداکردنی پاسپۆرت بوون بۆ چوونە دەرەوە لە ئێران. پاش عەسرانێک بەندە و کاک محەمەد ڕەئوف لە ماڵی مامۆستا صدیق بووین لە شاری سنە، ویستمان بڕۆین، مامۆستا وتی: دانیشن مامۆستا علی باپیر خەبەری ناردووە سەردانمان بکات لێرە بن، مامۆستا علی دووکەسی تری لەگەڵبوون هات، کورتەی گفتوگۆ ئەمەبوو، وتی: هاتووم مەشوەرەتێکت پێبکەم ئەم برایانەش لێرەن باشتر، بە هەموو ئەو لایەنانەی هێزی چەکداریان هەیە ڕاگەیەنراوە کە دەبێت پابەندی ئاگربەست و ڕاگرتنی شەڕبن،

ئەگەر لێرە دەمێننەوە ئەوە کۆماری ئیسلامی ئێران ماڵی خۆتانە، ئەگەر بۆ هەر جێگەیەکی تر دەڕۆن ئارەزووی خۆتانە، ئێمە هەرچیمان پێ بکرێت هاوکارتان دەبین، ئەوەندەی بیستومانە برادەرانی مەجلیسی ئەعلا بەنیازن بچنە لوبنان بۆ دەشتی بیقاع، ئێمەش تاوتوێی خۆمانکردووە، ڕایەک لەسەر ئەوەیە سەرکردەکان و بەشێک لە هێزی موجاهدیان بچینە پاکستان، ڕای تریش هەیە، بەڵام من لەسەر ئەو ڕایەم بچینەوە ناو خاکی کوردستان لەو چیا و ئەشکەوتانە خۆمان لەگەڵ دۆخەکە سازدەین و هەرچیش پێمان بکرێت لە ڕووبەڕووبوونەوەی ڕژێم دەیکەین، تابزانین وەزعەکە بەکوێ دەگات.

قسەی زۆرکران، دواجار مامۆستا صدیق وتی: هێشتا وەزعەکە بەتەواوی ڕوون نەبووەتەوە، پێمباشە سەبر بکەن و چاوەڕوانی ڕوونبوونەوەی ئاقاری ڕووداوەکان بکەین.

**دوا وێستگەی جەبریەتی شەرعیەت:**

بەپێویستی دەبینم کەمێک لەسەر دوو بابەت ڕاوەستم کە لە گێڕانەوەکانی ئەڵقەی پێشوودا ئاماژەم بۆ کردن:

یەکەم: سەرکردایەتی ڕێکخستنی ئیخوانی عێراق لە دەرەوە فەرمانی یەکلاکەرەوەیان دابوویە دکتۆر عبدالمجید (ئەبو زەڕی عێراق و ئەبو یونسی ئێران) دەبێت بەگوێرەی لائیحەی کاری ڕێکخستنی ئیخوان لە دەرەوە کۆتایی بەم کێشەیە بێنێت، لە سەردانەکەی کرماشاندا بەڕوونی باسی بەگیرهاتنی خۆی لەم کێشەیەدا بۆ کردم و، منیش تەواوی قسەکانیم بۆ مامۆستا صدیق گێڕایەوە.

مامۆستا صلاح لە یاداشتەکانیدا بەناونیشانی»٥٠ ساڵ لەکار و کاروان» کە بەشێوەی کۆپیە و نوسخەیەکی هەدیە کردووە بە بەندە، لە ٢٠٠٢/٣/١٩، ئاماژە بەوەدەکات کە سەرکردایەتی ئیخوانی دەرەوە فەرمانیان بە د.ئەبو یونس کردووە بە پەیوەستبوونی مامۆستا صدیق و هاوکارانی بە سەرکردایەتی کاری ئیخوانی عێراق لە ئێران و دەڵێت: د. ئەبوزەڕ لە پاکستان گەڕایەوە و فەرمانی پەیوەستبوونی ئەوانی بۆ هێنان لەسەر زمانی سەرکردایەتی برایانەوە، بەڵام پێش ئەوە چەند دیدارێکی لەگەڵیان ئەنجامدا و قەناعەتی پێکردن کە چارەسەر پابەندبوونە بەکاری برایانەوە لە ئێراندان و چارەیەکی تریان لەبەردەمدا نییە، ئەگەر بیانەوێت لە ڕیزی برایاندا بن. (لاپەڕەک ١١٠)

دووهەم: وتم بەندە زۆر بێزار و نیگەرانبووم لەو دۆخی بۆشاییەی هێڵی ئێمەی تێکەوتبوو، مامۆستا صدیق و برایانی تریش تاڕادەیەک هەستیان بەم بۆشاییە نەدەکرد، چونکە مامۆستا سەرگەرمی ئاگالێبوون و بەدەمەوەبوونی کاری مامۆستا مەلا عوسمان بوو وەک شەخسی مامۆستای براگەورەی کە ئەرکی ڕابەری گشتی بزوتنەوەی لەئەستۆدا بوو، نەک بەسیفەتی هەبوونی پلە و جێگەیەک لە بزوتنەوەی ئیسلامیدا.

برایانی تریش هەریەکە و لە ئۆردوگایەکدا وەک هەموو ئەو خەڵکە سەرگەرمییەکیان بۆ خۆیان دروستکردبوو چاوەڕێی گۆڕانی وەزعەکە بوون، چەند جار بەڕوونی بە چەند برایەکم وتبوو با یەکێک لەم سێ خیارە هەڵبژێرین، یان چوونە ناو بزوتنەوەی ئیسلامی، یان پابەندبین بەڕێکخستنی ئیخوانی ئێرەوە، یان باخۆمان حزبێک، کۆمەڵەیەکی سیاسی پێکبهێنین؟ سەرباری ئەمانەش دووبارە دەستەویەخەی قەیرانی کێشەی شەرعیەتی ئینتیما بۆ ئیخوان بووینەتەوە، لەوەش خراپتر ئێمە لەم وڵاتەدا کە بە هێڵی مامۆستا صدیق ناسراوین -بۆ خوا و لەبەر خاتری کاری ئیسلامیی!!!- دراوینەتەبەر ڕەهێڵەی تانە و قسەی تاڵی زۆر کەس و ناکەس، خۆشمان نە شورایەک نە ئۆرگانێکی سەرکردایەتی نە بەرنامەیەکی کار لانیکەم بەرنامەیەک بۆ خۆسازدان و خۆپێگەیاندن، هیچ لەئارادا نیە!! جگە لە وتی وتی و گێڕانەوەی قسەی ئەم و ئەو؟

جارێکیان لە کۆبوونەوەیەکی پێنج قۆڵیدا لە کامیاران، کە یەکێکیان مامۆستا محەمەد ڕەئوف بوو هەموو ئەم قسانەم بەڕوونی و ڕاشکاوی بە مامۆستا صدیق ڕاگەیاند، دەشمزانی ئەم قسانەم بەنوسخەی تر گەیشتووەتە لای، زۆر نیگەرانبوو، بەڵام هەردووکمان بێدەنگیمان لێکرد- نامەکەی برای بەڕێزم کاک تۆفیق کەریم بۆ بەندە لە هەمان ئاڕاستەی هەستکردنی بوو بەو بێزاریی و نائومێدییەی من. شتێکی سروشتییە لە زۆر جێگە و بەتایبەت لە کۆمەڵە و حیزبی سیاسیدا ناشێ و نابێ چاوەڕوانی ئەوەبێت هەموولایەک هاوڕات بن و بیروڕاکانت بسەلمێنن، بەڵام ناسروشتی ئەوەیە کە هەست بەکێشەکە نەکەن، یان تەفسیر و تەئویلی شەخسی بۆ بکەن، یان بەشێوەیەکی تر بڵێم سروشتییە بیروڕاکانت قبوڵ نەکەن، بەڵام دەبەنگییە هەست بەو کێشەیە نەکەن کە سەرچاوەی ئەو بیروڕایانەیە. پاش ئەم فەرمانەی دەرەوە برایانی هێڵی مامۆستا صەلاحیش کێرڤی داواکارییەکانیان گەیاندە دواخاڵی ترۆپک، گفتوگۆی تر ناکەین، یان پابەند دەبن بە ڕێکخستن و قیادەی کاری ئیخوانی دەرەوە-ڕێکخستنی ئێران- بێ هیچ مەرجێک یان شەرعیەتی هیچ کارێکیان بەناوی ئیخوان و لەژێر لافیتەی ئیخواندا نییە؟

دکتۆر ئەبو یونس هەوڵەکانی خۆی بۆ ڕازیکردنی مامۆستا صدیق و تەکلیفلێکردنی بە ڕێکەوتن لە نێوان هەردوو هێڵدا بۆ چارەسەری ئەم کێشەیە چڕکردبوویەوە، سەرەنجام مامۆستا قایلبوو، کار گەیشتە وێستگەی کۆبوونەوە و گفتوگۆی ڕووبەڕوو لەسەر ڕێکەوتن.

ئێوارەیەکی ڕۆژی ١٩٨٨/١١/٩ لە شاری کرماشان پاش نوێژی ئێوارە و نانخواردن ئەم چوار کەسە (د. ئەبو یونس، مەلا محەمەد مەلا عومەر، مامۆستا محەمەد ڕەئوف، مەولود موراد) بەرەو ماڵی مامۆستا صەلاح ڕۆشتین، لایەنی ئێمە بە سەرۆکایەتی دکتۆر ئەبو یونس نوێنەری هێڵی مامۆستا صدیق بووین، مامۆستا صدیق لەبەر هەر هۆیەک ئامادە نەبوو، هەرچی لە منە دەچین بۆ گفتوگۆی بەرایی و دواتر هەریەکە ئەنجامەکان

دەباتەوە بۆ گفتوگۆ و پرس و ڕاوێژی لایەنەکەی خۆی و دانیشتنێکی تر بۆ ڕێکەوتن لەسەر خاڵە هاوبەشەکانی هەردوولا دەبەسترێت و ڕێکەوتنی کۆتایی ئەنجامدەدرێت، بەڵام ئەوەل و ئاخری هەموو شت ئەو کۆبوونەوە چەند سەعاتییەی ئەوشەوە بوو، چونکە نوێنەر و دەمڕاستی لایەنی هێڵی مامۆستا صدیق-دکتۆر ئەبو یونس- هاوڕا و هاودەنگ بوو لەگەڵ لایەنی هێڵی مامۆستا صەلاح لە مەسەلەی چەسپاندنی جەبرییەتی شەرعیەتدا بەهەر نرخێک بێت. نوێنەرانی هێڵی مامۆستا صەلاح تەنها مامۆستا عومەر ڕێشاوی و مامۆستا صەلاح خاوەنی قسە و ئاڕاستەکردنی گفتوگۆکان بوون، مامۆستا عومەر ڕێشاوی بسم اللەی لێکرد و بە خوێندنی چەند دوعا و ئامۆژگاریی و بیرخستنەوەیەک کۆبوونەوە دەستپێکرد.

**قسە زۆرکران بەتایبەت لەسەر دووخاڵ:**

یەکەم: موناقەشەیەکی زۆر کرا لە نێوان مامۆستا صەلاح و دکتۆر ئەبوزەڕدا لەسەر ئەو بڕیارەی سەرکردایەتی ئیخوانی دەرەوە لەسەر ئەوەی کە هەرکەس و گرووپێک پەیوەندی بە ڕێکخستنی نهێنی ئیخوانی ناوەوەی عێراق کرد و پاشان لە عێراق دەرچوو بۆ ئەو وڵاتانەی کە ڕێکخستنی ئیخوانی دەرەوە کاری تیا دەکات، پێویستە پابەندبێت بەو ڕێکخستنەوە- لەباسی نامەکەی دکتۆر نوعمان سامەڕایی بۆ مامۆستا مەلا عوسمان بە درێژی باسمکرد-.

لەوەش زیاتر باس لەوەشکرا کە کاری ڕیکخستنی ناوەوەش شەرعیەتی لەم ڕێکخستنەی دەرەوە وەرگرتووە، ئەگینا دکتۆر عەبدولکەریم زەیدان هێشتا لە ژیاندایە- لە بەرواری ئەو ڕێکەوتنەدا- بڕیاری ڕاگرتنی ڕێکخستنی ئیخوان موسلیمینی عێراقی هەڵنەوەشاندووەتەوە، ئەم شەن و کەوە بۆ زیاتر تێگەیاندنی ئامادەبووانی کۆبوونەوەکە و قسەبڕکردنی لایەنی ئێمە بوو، کە تێبگەن جگە لە پابەندبوون بیرکردنەوەیەکی تر لە ئارادا نییە، لەم نێوانەدا ئەبو یونس یان قسەکانی بۆ مامۆستا صەلاح تەواودەکرد یان سەری دەلەقاند و دەیگووت: ئی نعم.

لەڕاستیدا بەشێکی زۆر لەو قسانەی لەو کۆبوونەوەیەدا کران، لانیکەم بۆ بەندە نوێبوون و پێشتر شتێکم لەوبارەوە نەبیستبوو، بەتایبەت ئەو بڕگەیەی کە ئاماژە بەوە دەکات «ڕێکخستنی ئیخوان موسلیمین لە ناوەوە شەرعییەتی کاری لە قیادەی ئیخوان موسلیمینی دەرەوە وەرگرتووە»!! لێرەوە تێدەگەیت، چەندین ڕاستی لە هەناوی کارەکان و جوڵەکانی ئەم کارەکتەرانەی ئیخوانی عێراقی دەرەوە و ناوەوە پێچراوەتەوە و حەشاردراوە، کاتێک لەگەڵ ڕاستییەکان ڕووبەڕوو دەبیتەوە ئیتر کات بۆ هیچ دەرەچە و مناوەرەیەک لەبەردەست نەماوە، دەبێت یان دەستبەرداری ئەم ڕێگە و ڕەوتە بیت، یان مل بەو ئاڕاستەوە بنێیت کە بۆت دیاری دەکرێت.

دووهەم: چۆنێتی تێکەڵاوکردن و پەیوەستکردنی هێڵی مامۆستا صدیق بە ڕێکخستنی ئیخوانی لەم خاریجەی ئێران- هێڵی مامۆستا صلاح -.

سەرەنجام دەستکرا بە نووسینی ڕێکەوتنامەکە بە قەڵەم و دەستوخەتی مامۆستا محەمەد ڕەئوف، دوا سیغەی وەک لە خوارەوە تەرجەمە کوردیەکەیم نووسیووە، داڕێژا:

**بسم الله الرحمن الرحيم**

سوپاس بۆ خودای تاک و تەنیا، درود و سڵاو بۆ ئەو کەسەی پێغەمبەرێکی تر پاش ئەو نییە، لەسەر ئال و ئەسحاب و یارانی، خودا لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: {واطيعوا لله ورسوله ولا تنازعوا فتفشلوا وتذهب ريحكم واصبروا ان الله مع الصابرين}.

**بڕیار:** کۆی برایانی کاری ئیخوان موسلمین لە ناوخۆ و دەرەوەی عێراق سورن لەسەر یەکڕیزی مسوڵمانان و لادانانی هۆکارەکانی تەفرەقە و ناکۆکی و هێنانەدی ڕەزامەندی خودای باڵادەست بۆ سەرخستنی دینەکەی بەڕیزێکی پێکەوە جۆشدراوی هەماهەنگ، نوێنەرانی برایانی کاری ئیخوان، لە ناوخۆ و دەرەوە کۆدەنگ بوون لەسەر ئەمەی خوارەوە:

**یەکەم**: پابەندیی هەموو برایانی کاری ئیخوان لە ناوخۆی عێراقدا بەرامبەر سەرکردایەتی گشتی کاری ڕێکخستنی ئیخوان دەبێت لە عێراقدا.

**دووهەم**: هەموو برایانی کاری ئیخوان لە دەرەوەی عێراق پابەند دەبن بە سەرکردایەتی کاری ئیخوان لە دەرەوەی عێراق، لە ماوەی مانەوەیان لە دەرەوەی عێراق، هەریەکە و لەو وڵاتەی تیایدا نیشتەجێیە.

**سێهەم**: أ. پەیوەندی ڕێکخستن بەهەر تاکێکەوە دەپچڕێ، کە پابەندی ئەم فەرمانە نابێت.

ب. ئەم بڕیارە پاش سێ(٣) مانگ لە بەرواری دەرچوونییەوە جێبەجێ دەکرێت، لەم ماوەیەدا بەیەکگەشتنی برایانە ئەنجامدەدرێت بۆ تەرتیبی پاش ئەوە.

**چوارەم**: ئامۆژگاری سەرجەم برایانی پابەند دەکەیەن بە تەقوای خوای پەروەردگار و پابەندبوون بە فەرمانی جەماعەت کە هەردوو ڕیکخستنی ناوخۆ و دەرەوە کۆدەنگیان لەسەریەتی لەپێناو ڕەزامەندی خودای باڵادەست و شوێنکەوتنی فەرمودەی ئەو خودا باڵادەستە: {ياايها الذين آمنوا اطيعوا االله واطيعوا الرسول وأولي الأمر منكم، فان تنازعتم في شيئ فردوه الى الله والرسول إن كنتم تؤمنون بالله واليوم الآخر وذلك خير وأحسن تأويلا}.

داواکارین لە خودای باڵادەست هەمووان سەرکەوتوو بکات بۆ تاعەت و تەقوای خۆی، بمانکاتە ئەوانەی نیەتەکانیان بۆ ئەو خاوێن دەکەنەوە، کارەکانمان چاک کات، بمانکاتە سەربازی کاری بڵندکردنی وشەی ئەو. درود و سڵاو لەسەر سەروەمان محمد و ئال و ئەسحابی بێت.

الله اكبر ولله الحمد

**ئیمزا: ئەبوزەڕی بەغدادی** | **ئیمزا: ئەبو یحیی**

دەقی ئەم بڕیارەی کە ناونراوە ڕێکەوتنامەی نێوان برایانی کاری ئیخوانی دەرەوە و ناوەوە (٤) جار ئەم دەستەواژەیە لە بڕیارەکەدا دووبارەکراوەتەوە، و دواتر پاش گەڕانەوەی هەردوولای هێڵی مامۆستا صدیق و مامۆستا صەلاح بۆ کوردستانی عێراق، بوویە جێگەی مشتومڕێکی زۆر و تەفسیری جیاوازی لێکەوتەوە، بەخوێندنەوەیەکی سادە دەشێت ئەم تێبینیانەی لەسەر تۆمار بکرێن:

١. هەر لە سەرەتاوە لەبری وشەی»ڕێکەوتن» وشەی «بڕیار» نوسراوە، کە گوزارشت لە ئیرادەی سەپاندنی جەبریەتی شەرعیەت دەکات. مامۆستا صەلاح لە هەمان لاپەڕەی ١١٠ی یاداشتەکانیدا دەڵێت: بەم شێوەیە نووسراوێکمان ئیمزاکرد و بڕیاری پابەندبوونیانماندا.

٢. ناوەڕۆکی خاڵی یەکەمی بڕیارەکە دروست هەمان ناوەڕۆکی بەیاننامەی هاوینی ساڵی ١٩٧٨ی هێڵی ڕێکخستنی مامۆستا صدیقە، کە ئەوکات دەرمانکرد بۆ ڕاگەیاندنی هێڵی بوژانەوەی ڕێکخستنی ئیخوان موسلیمین لە ناوچەکەدا، بەم مانایە تێدا هاتبوو: هەرکات قیادەی ئیخوان موسلیمینی عێراق دەستی بەکاری ڕێکخستن کردەوە ئێمە سەربازی وەفاداری دەبین و پابەندەبین بە بڕیار و فەرمانەکانییەوە.

ئەم بەیاننامەیە ئەوکات بە ئینشا و وتنی مامۆستا صدیق و مامۆستا مەلا ئەحمەد شافیعی و مامۆستا محەمەد ڕەئوف و بەنووسینی دەسخەتی مولود موراد نووسرایەوە، مامۆستا صدیق نوسخەیەکی پیشانی مامۆستا ئیبراهیم ڕێشاوی دابوو، گوایە دڵنیای بکاتەوە ئەو کار و ڕەوتە سەر بە ئیخوان موسلیمینی عێراقە و پابەند و وەفادار دەبێت بەقیادەی ڕێکخستنی ئیخوان موسلیمینی عێراقەوە، لە هەر کاتیکدا دەستی بەکاری ڕێکخستن کردەوە، مامۆستا ئیبراهیم وتبووی جا ئەوە چیە ئینشایەکی عەرەبیە هەمووکەس دەتوانێت بینووسێت. دواتر لە ڕاگەیاندنی بزوتنەوەی ڕاپەڕینی ئیسلامیدا بەڕێبەرایەتی مامۆستا صدیق، کرایە دەستپێکی مێژووی کاری ڕێکخستن و دامەزراندنی ئەو بزوتنەوەیە«وەک لە بەیاننامەی ڕاگەیاندنیدا ئاماژەی بۆ کرابوو.

٣- ئاماژەی دروستکردن و پێکهێنانی هیچ جۆرە میکانیزم و ئامرازێکی تیانییە کە گوزارشت لەو یەکگرتنەوەیە بکات کە بە وشەی «اجمع» کۆدەنگی و چەند جار بەناوی نوێنەرانی برایانی ئیخوانی ناوەوە و دەرەوە ئاماژەی بۆ کراوە، مامۆستا صەلاح لە یاداشتەکانیدا ئاماژە بەوەدەکات کە گوایە یەکێک لە خاڵەکانی نووسراوەکەی کە ئیمزامان کرد: هەڵبژاردنێک بکرێت لەناو ڕیزەکانی ڕێکخستندا. بەڵام دەقی بڕیارەکە هیچ ئاماژەیەکی وای تێدا نییە. هەمووی سپێردرا بە وشەی تەرتیباتی پاش ئەوە. لەمەوە دەردەکەوێت کە ئەو بڕیارە تەنها بۆ قیادەی ئیخوانی عێراقی دەرەوە نووسرا، تا بەڵگەی ئەوەبێت ئەبوزەڕ فەرمانەکەی ئەوانی جێبەجێ کردووە و خۆشی لەو تەنگژەیە قوتارکردووە! لەلایەکی تریشەوە دەسکەوت و سەرکەوتنێک بێت بۆ قیادەی هێڵی مامۆستا صلاح.

**سێ مانگی متمانە:**

پاش بڵاوبوونەوەی هەواڵی ئەم بڕیارە ژمارەیەک لە برایانی ئێمە پێی نیگەرانبوون، بەڵام لەبەرئەوەی دەرەتانی شتی تریان نەبوو لە ئاڵوگۆڕی قسەی نێوان خۆیان نەچووە دەرەوە، هەموویان دەیانزانی تا چ بەندە ئاستێک بێزارم لەو دۆخەی تێیکەوتووین، بۆیە بەڕاشکاوی وتم: ئەگەر ئیخوان دەروێشێکیش بکاتە بەرپرس من قبوڵی دەکەم، کەمێک واقیان وڕما پیامدا و هیچیان نەگووت.

وابڕیارە ئەم سێ مانگە سەردان و تێکەڵاوی دەستپێبکات، لەڕێگەی کردنەوەی خولی هاوبەشەوە قیادە و شورای جەماعەت کە ئێستە هی هەموومانە بەرنامەی بۆ دابنێن، بەند زۆر تامەزرۆم کە خولێ دوو خولم بەرکەوێت، بەڕاستی و بەدڵ حەزم دەکرد لەم ئەزموونە نوێیەدا شتێکی نوێ بە ژیانی ئیخوانی خۆم زیاد بکەم، ئێستە وا شوکر وەک دەیانگووت، قەیرانی ئیخوانی ناشەرعی و تەزویرمان تێپەڕاند، هەندێک لە برایانی هێڵی مامۆستا صەلاح لێرە و لەوێ کە یەکترمان دەبینی بەڕوویەکی کراوەوە سەلام و کەلامێکی گەرمیان هەبوو، دەیانووت شوکر هینەکە تەواوبوو، هەردووکمان تێدەگەشتین هینەکە چیە! زۆری نەخایاند خەبەریان دامێ کە سەردانی کرماشان بکەم چوومە کامیاران لەگەڵ مامۆستا محەمەد ڕەئوف و مامۆستا مەلا ئەحمەد شافعی و کاک شیخ ئومێد پارەزانی پێکەوە ڕۆشتین، لای ئێمەوە ئەم چوار کەسەبووین، خولەکە شەو و ڕۆژێکی خایاند، سێ موحازیر و موحازەرەم لەبیرماوە، موحازەرەیەکیان هی مامۆستا عومەر ڕێشاوی بوو، بابی عیلمی لە ئەحیا علوم الدین بۆ باسکردین، موحازەرەیەکی تریان هی برایەک بوو بەناوی ئەبو یاسر باسی بنەماکانی کاری ئیسلامی بۆ کردین «مقومات العمل الاسلامی»، موحازەرەیەکیان هی مامۆستا صەلاح بوو باسی برایەتی و کارکردن بۆ ئیسلامی بۆ کردین.

مامۆستا ئیبراهیم ڕێشاوی سەرپەرشتیاری خولەکە بوو ئیمامەتی نوێژەکانی بۆ دەکردین و شەویش لامان مایەوە، ئەویش هەرجارە لە نێوان موحازەرەکانی ئەواندا بابەتێکی لە تەفسیری چەند ئایەتێک پێشکەش دەکردین. پاشان ڕاسپاردەیان ئەوەبوو (اصول الدعوه)ی دکتۆر عەبدولکەریم زەیدان و (تهذیب مدارج السلکین و المسار)ی محەمەد ئەحمەد ڕاشد و یەک دوو کتێبی تر بخوێنینەوە.

ئەوەی دەمەوێت بیڵێم، بۆ کەمکردنەوەی نرخی هەوڵ و زانستی کەس نییە، یان بۆ خۆ بەشتزانین نییە، چونکە بۆ ئێستا زیاتر٣٠ ساڵی بەسەردا چووە، بەڵام قسە لەسەر ئەوەیە ئەگەر ئێمە کۆمەڵێک گەنجین و تەربیەمان تەواو نییە، بە گیانی حیزبی

کار دەکەین، کاری تەنزیمی ئێمە جۆرێکی جیاوازە لەوەی ئیخوان دەیکات، و پێویستە مەفاهیمیان ڕاستبکرێتەوە، من کە خۆم لە خوارتری برایانی بەشداربوو دەزانم، بەڵام کە لە قۆناغی دوو و سێی کولیەدا بووم کتابی (منجیات و مهلکاتی احیا علوم الدین)م لە بەرگەوە بۆ بەرگ خوێندبووەوە، دوو مانگ لەوەوبەر موحازەرەی (مقومات العمل الاسلامی) لە گۆڤاری مجتمعی کوەیتی بڵاوکرابوویەوە. جگەلەوەش چەندین سەرچاوەی ئیخوانی زانستی و ڕۆشنبیریمان بۆ کارمان بەکاردەهێنا وەک کتێبەکانی محەمەد ئەحمەد راشد و یوسف قەرزاوی و فەتحی یکن و سعید حوی و ...هتد، مانگانە گۆڤارێکی ناوخۆیمان بەناوی «نیگا» و دواتر «ڕۆشنبیر» بڵاودەکردوە، دواتر خولێکی تر کرایەوە تەنها برایانی لایەنی ئێمەی تیایدا بەشدار بوون هەر بەهەمان ڕیتم و ناوەڕۆک بوو.

کەواتە ئەگەر هەمان سەرچاوەی چوونیەک بنکەی مەعریفی و ڕۆشنبیری ئیسلامیمان پێکدەهێنێ؟ لێرەوە پرسیار لەسەر ئەم هەموو گومانە خراپە دروست دەبێت، بۆچی؟ لەچیەوەیە؟ ڕەنگە بگەیتە ئەگەری ڕاستاندنی-تصدیق- ئەو قسەیەی کە لە کۆتایی حەفتاکانەوە تا دەرچونمان بۆ ئێران لە شوباتی ١٩٨٧دا -واتە چەند ساڵ پێش دروستبوونی بزوتنەوەی ئیسلامیی، ئەم برایانە خستبوویانە سەر زمانی گەنجان و لایەنگرانیانی هێڵی دژە ڕێکخستن، کە مامۆستا صدیق بەم کارەی بەدوای مەجدی بنەماڵەکەیاندا دەگەڕێت و دەیەوێت بەم ناوی ڕێکخستن و منالبازاڕەوە ئیخوان بخاتەوە ژێر ڕکێفی بنەماڵەکەیان، کەواتە ئەمە شەڕی کێ سەربێ و سەرۆک بێیە، و ئێمەش قوربانی و باجدەری ئەم ناوزڕاندن و ناشیرینکردنەین، مادەم مامۆستا صدیق هیچ خیارێکی جگەلە سووربوون لە سەرمانەوە لەچوارچێوەی ڕێکخستنی ئیخواندا قبوڵ نەکرد، مامۆستا صەلاح گووتەنی کوتەکی شەرعیەت و ڕەسمیەت ئەمەی یەکلایی کردەوە.

**پەراوێز کەوتن:**

سێ مانگی متمانە و تێکەڵاوی و بە قەولی خۆیان بارهێنانەوە و ئولفەت تەواوبوو، کەوتینە ساڵی ١٩٨٩، مامۆستا صدیق و مەلا محەمەدی مامۆستا مەلا عومەر و کاک محەمەد ڕەئوف و کاک عەلی عەبدوڵڵا لە کامیاران کۆبووینەوە ئەوان ماڵیان لە کامیاران بوو منیش بەسەردان چووبووم، هۆکاری کۆبوونەوەکە باسی بڕیاری ڕێکخستنەوەی پەیوەندییەکانی ڕێکخستنی ئێمە بوو، دوو وەرەقەی نیوەلاپەڕەیی درێژیان بەدەستەوە بوو ژمارەیەک ناو و بەرامبەرەکەی ناوی تر و ناوی شوێن، تومەزە ئەوان پێشتر خەبەریان لەم بڕیار و پرۆسەیە هەیە وائێستا وەک ئەنجامی دەرچوونی ناوی قوتابیانی

وەرگیراو لە کۆلێژ و پەیمانگاکان ناوەکان دەرچوون، فڵان کەس لە فڵان شوێن پەیوەندی دەکات بە فڵان کەسەوە، مووتم وەڵا وەکو گۆشتی قوربانی هەموومانیان دابەشکردووە، هەندێ ناو کە دەخوێنرایەوە پەیوەندی بکات بە فڵان کەسەوە هەموومان بەجارێک چلوچپمان دەستپێ دەکرد و، دەمانگووت بەخوا حەیفە؟ ناوەکان تەواوبوون ناوی من لە هیچ جێگەیەک دیارنییە، بەڵام هیچم نەگووت و پرسیارم نەکرد، بەحسابی ئەوەی من دانیشتووی شاری سنەم و ڕەنگە بگاتە لای کەسی خۆی لەوێ.

لەوماوەیەدا بیرم نییە خۆم بە مامۆستا صەلاحم گووت یان خۆی پێشنیازی بۆ کردم کە دەستبکەم بەخ وێندنی علومی شەرعی لە حوجرەی مەرحومی مامۆستا سەید نەجمەدین لە شاری سنە، منیش ڕۆیشتم مامۆستا ئاگادار کرابوویەوە، دەستمکرد بەخوێندنی (الهدایە فی النحو و تصریفی زنجانی) و پاشنیوەڕوانیش دەچووم بۆ کتێب فرۆشییەکەم لە پاساژی عزەتی، ئەم خوێندنە زۆری نەخایاند.

دوو مانگ و زیاتر تێپەڕی هیچ خەبەرێک نەبوو، بە ناڕاستەخۆ سۆراخێکم کرد هیچ دیار نەبوو، تومەزە ئەو کەسانە هەواڵپرسینەکانی منیان گەیاندووە، بەڵام ئایا بە چەند پلە دەگاتە جێگەی بڕیار؟ ڕۆژێک لە کتێبخانەکەی مامۆستا عەلی ڕەحمانی لە هەمان جێگەی کتێبخانەکەی خۆم بوو، مامۆستا حەسەن پێنجوێنیم بینی پاش چاک و چۆنییەکی گەرم، گووتی: ئەم نیوەڕۆیە پێکەوە دەچینەوە بۆ ماڵی ئێمە، منیش سوپاسم کرد و گووتم: پێویست ناکات، دەزانیت ماڵم لێرەیە، گووتی: نا ئاخر پێویستە بێیت. چوینەوە ماڵەوە تا نوێژی عەسر پێکەوەبووین، گووتی دەبوو زووتر و زۆرتر یەکترمان ببینیایە، بەڵام قەدەر وابوو، بەزۆری باسی نووسین و وەرگێڕان و شێوازی نووسین و...هتد کرا، لەمیانی قسەکانیدا لوتفی کرد و گووتی: تۆ بالقوە نووسەری، بەڵام نازانم بۆچی نانووسی؟ پێشنیازی هەندێ نووسین یان وەرگێڕانیشی بۆ کردم، نوێژی عەسرمان پێکەوە کرد و باسی ئەوەی بۆ کردم دەیەوێت بە ماڵەوە سەفەری دەرەوە بکات.

ماوەیەکی تر تێپەڕی ڕۆژێک مامۆستا سەید نەجمەدینی ڕەحمەتی گووتی: ئەرێ مامۆستا حەسەن پێنجوێنی هیچ قسەوباسێکی لەگەڵ نەکردووی؟ وگوتم: نەخێر، سەرێکی لەقاند و هیچی تری نەوت. تومەزە من دراوەمەتە دەست ئەم زاتە و ئەویش لە چاوەڕوانی ئەمڕۆ و سبەی دەرچوونی پاسپۆرت و سەفەردایە، ڕەنگە گووتبێتی با دەستی نەبرم، بەڵکو کەسێکی تر پەیدابێت.

دواتر درامە دەست مامۆستا محەمەد ڕەئوف، دوو جەلسەمانکرد، پاش ئەم درامە دەست کەسێکی تر و هاتە ماڵی خۆمان لە سنە، بەڵام بەڕاشکاوی ڕەفزم کرد، پاش ئەو

درامە دەست مامۆستا جەعفەر و دەبوو بەگوێرەی مەوعید بچمە خزمەتی لە کامیاران، سێ دانیشتمان کرد، ئەویش ڕاوەستا. بەماوەیەک پێش گیرانەکەی نامەیەکم بۆ مامۆستا صەلاح نووسی، بەناوی ئەبو سروە، باسی ئەم دۆخەی خۆم بۆ کردبوو، ئەوەی لەبیرم بێت نووسیبووم: مرۆڤ کە متمانەی بەخۆی هەبوو لە هەر جێگەیەکی مەجلسدا دانیشێ بۆی گرنگ نییە، بەڵام ناچاری دانیشتنی بکەن لەبەر هەر هۆیەک قابیلی تەحەمول نییە.

خەبەری بۆ ناردم سەردانی بکەم، لە ماڵی خۆیان لە کرماشان بێ ناوبردنی کەس هەموو ئەو پەراوێزکەوتنەم بۆ باسکرد، زۆر گرفتی تریش، گووتی: گرفتاری زۆرە و داوا و من من زۆرە، ڕەنگە بۆ دڵدانەوەی من بووبێ کڵاوێکی لەسەردابوو، گووتی: ئێستە فەرقی من و تۆ ئەم کڵاوەیە بەسەرمەوە، فەرموو بیکەسەرت و سەیری ساحەکە بکە بزانە چی دەبینیت؟ هەتا گەڕاینەوە بۆ عێراق ناوە ناوە سەردانی ئەوم دەکرد.

**تێبینی**: دەقی ئەو بڕیاری ڕێکەوتنەی هەردوولا، لە ئەرشیفی مامۆستا محەمەد ڕەئوف کۆپی دەقەکەیم دەستکەوت. لە کتێبی: ئیدریس سیوەلی: ڕەوتی ئیسلامیی لە باشووری کوردستان، ل١٣٢، تەرجەمەکەی و لەدۆکیۆمێنتی ژمارە(١٠) کۆپیەکەی هەیە. هەروەها لە کتێبی: عەبدولڕەزاق عەبدولڕەحمان محەمەد: بزاوتی ئیسلامی، بەرگی سێیەم، ل١٦٢، تەرجەمە کوردییەکەی، ل٢٨٠-٢٨١ کوپی نوسخە ئەسڵییەکەی هەیە.




# چەند سەرنجێك دەربارەی کتێبی بزاوتی ئیسلامی

ئیدریس سیوەیلی

کتێبی بزاوتی ئیسلامیی لە نووسینی (عەبدولڕەزاق عەبدولڕەحمان محەمەد)، لە شەش بەرگ پێکهاتووە، کتێبەکە بە هەمووی (٣٢٩١) لاپەڕەیە، سەلاحەدین محەمەد بەهادین پێیداچوەتەوە و پێشەکی بۆ نووسیوە، ساڵی ٢٠٢٠ چاپکراوە، وەك لە ناونیشانەکەدا ئاماژەی پێدراوە، کتێبەکە تایبەتە بە مێژووی ڕەوتی ئیسلامیی لە عێراق و باشووری کوردستان، جێگەی دەستخۆشییە بابەتێکی لەو جۆرە لەچوارچێوەی پرۆژەیەکی گەورەدا و لە چەند بەرگدا چاپ بکرێت، بێگومان هەر کارێکی لەو جۆرە جێگەی دڵخۆشی و بەرزنرخاندنە، هاوکات لە کەموکورتی و ڕەخنەش بێبەش نابێت، بەوپێیەی زیاتر لە ١٧ ساڵە سەرقاڵی توێژینەوەم لە مێژووی ڕەوتی ئیسلامیی لە باشووری کوردستان و چەندین توێژینەوەم لەو بوارەدا بڵاوکردووەتەوە، ئەو مافە بە خۆم دەدەم لەسەر کتێبی (بزاوتی ئیسلامی) سەرنج و تێبینی خۆم بخەمەڕوو و کەموکورتییەکانی دەستنیشان بکەم، هەڵبەتە قسەکردن لەسەر کەموکورتییەکان بەو مانایە نییە کە ئەم کتێبە لایەنی ئەرێنی نییە، بەڵکو هەر خودی نووسینی کتێبێك دەربارەی مێژووی ڕەوتی ئیسلامیی و پاراستنی ئەو مێژووە بەلای منەوە جێگەی پێزانینە، بۆیە وێڕای دەستخۆشیم لە نووسەر هیوای بۆ دەخوازم و هانیدەدەم پاشماوەی نووسینەکەی تەواو بکات و چاپی بکات و ئەو کەلێن و کەموکورتییانەش پڕبکاتەوە کە لەم کتێبەدا هەن، منیش لێرەدا تەرکیز دەکەمە سەر کەموکورتییەکان بەهیوای پڕکردنەوە و چاکردنی نەك بەکەمگرتنی کاری نووسەر.

### گرفتی مەنهەجی نووسینەوە

کاتێک سەرنج لە بەرگ و ناونیشانی کتێبەکە دەدەیت، هەست بە گرفتێکی گەورە دەکرێت، ناونیشانی سەرەکی کتێبەکە کە لە هەموو بەرگەکان دووبارە بووەتەوە، ئەوەیە کە نووسراوە (بزاوتی ئیسلامی، لە ڕەگی ئیخوانەوە بۆ ڕاگەیاندنی یەکگرتوو ١٩٤٦- ١٩٩٤، خستنەڕوویەکی مێژوویی یە لە کار و چالاکی بزاوتی ئیسلامی لە عێراقدا بەگشتی و لە کوردستاندا بە تایبەتی)، دواتریش بۆ هەر بەرگێک ناونیشانی لاوەکی دانراوە، بۆ نموونە لەسەر بەرگی یەکەم نووسراوە (کورد و دەوڵەتی عێراق و کۆمەڵگە و ڕەوتە سیاسییەکانی و چەند باسێکی تر ...) بە سەرنجدان لەو ناونیشانە چەند هەڵەی ئەکادیمی، زمانەوانی، ڕێنووس و خاڵبەندی هەستپێدەکرێت، ئەمە یەکەم ئاماژەیە کە نووسەر تواناى نووسینی ئەکادیمی کەمە، نەیتوانیوە ئەم کتێبە لە قاڵبێکی ئەکادیمی چوارچێوەدار بکات و ناونیشانێکی ئەکادیمی بۆ دانێت، ڕەنگە پرسیارێکی زۆر سادەی ئەکادیمی ڕووبەڕووی نووسەر بێتەوە کە ئەگەر کەسێک ئەم کتێبە وەک سەرچاوە بەکاربێنێت دەبێت لە پەراوێز و لیستی سەرچاوەدا چۆن ئاماژە بەناونیشانی کتێبەکە بدات، کە بە کۆی گشتی ئەوەی لەسەر بەرگی یەکەم نووسراوە بەو ڕێنووسەی نووسەر (٤٠) وشەیە، ئایا دەکرێت ناونیشانی کتێب ئەو ژمارە زۆرەی وشە بێت؟! دواتریش لەژێر ناونیشانەکەدا نووسراوە (پێشەکی و پێداچوونەوەی لەلایەن بەڕێز مامۆستا صلاح الدين محمد بهاءالدين ئەمینداری گشتی یەکگرتووی ئیسلامی کوردستانەوە) ئەمجارەش بە چاوپۆشی لە هەڵەی ڕێنوس و زمانەوانی و تەنانەت ناوی حیزبەکەش بە هەڵە نووسراوە، نووسەر ناوی کەسەکەی بە عەرەبی نووسیوە و دواتریش نووسەر ناوی خۆی هەر بە عەرەبی نووسیوە، ئاماژەدان بە ئەمینداری گشتیی یەکگرتوو بە پلەی یەکەم ئەوەی لێدەخوێندرێتەوە کە نووسەر دەیەوێت بەمە هێزێک بداتە کتێبەکە کە ئەو کەسایەتییە پەسەندی کردووە و پێشەکی بۆ نووسیوە و پێیداچووەتەوە، چونکە ئەمینداری یەکگرتوو نە کەسێکی ئەکادیمییە نەک مێژوونووس، بەڵکو سیفەتێکی سیاسیی هەیە و ڕاستە بەشداربوویەکی مێژووی ئیخوانە، بەڵام زەقکردنەوەی پێگە سیاسییەکەی لەسەر بەرگی کتێبەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە بە سیفەتە سیاسییەکە پێشەکی بۆ کتێبەکە نووسیوە، ئەگەر ناوبراو ئەکادیمی بوایە نەیدەهێشت ئەم کێبە بەو هەموو کەموکورتییەوە چاپ بکرێت، دیارە نووسەر سەراسیمەبوونی خۆی بە ئەمینداری یەکگرتوو نەشاردۆتەوە، لەو کەسانەی ئەم کتێبەی پێشکەش کردووە نووسیویەتی: پێشکەشە بە ئەندازیاری بزاوتی ئیسلامی کورد و ئەمینداری گشتی یەکگرتووی ئیسلامی کوردستان بەڕێز جەنابی مامۆستا سەلاحەدین محەمەد بەهادین. هەرچەندە ئەمە مافێکی نووسەرە پێشکەشی هەرکەسی

بکات، بەڵام وەسفکردنی کەسەکە بەوشێوەیە لە بەهای زانستی کتێبەکە دادەبەزێنێت.

گرفتێکی سەرەکی ئەو کتێبە ئەوەیە نازانرێت لێکۆڵینەوەیە، یان بیرەوەری، یان ساغکردنەوەی مێژوو، نووسەر لە پێشەکیدا دەڵێت:»ئەم مێژووی بزاوتی ئیسلامییە من چیم پێکرابێت و توانام بووبێت لەم زنجیرەیەدا نووسیوومەتەوە، تاوەکو لێکۆڵەران و توێژەرانیش بەتایبەت دامەزراوە ئەکادیمییەکان و توێژەرانی زانکۆ و ... هتد، ئەم نووسینە و چەند نووسینێکی تر تاوتوێ بکەن و بیکەنە سەرچاوە بۆ توێژینەوەکانیان تا بگەنە ڕاستییەکانی مێژوو». کەواتە بەپێی ئەم قسەی نووسەر بێت، ئەم کتێبە هاوشێوەی کتێبە مێژووییەکەی تەبەری نووسەر بێ وردبوونەوە و بەراوردکردن و دڵنیابوون لە دروستی زانیارییەکان، لە زمانی کاراکتەرەکانەوە چی بیستووە نووسیویەتی، هەندێکجاریش کە زانیارییەک لای خۆی هەبووە و هیچ کەسێک باسی نەکردووە ئەم خۆی دەیگرێتەوە و دەبێتە سەرچاوە، بەمەش جارێکی تر گرفتی ئەوە هەستپێدەکرێت کە نازانرێت نووسەر لە نووسینی ئەم کتێبە پەیڕەوی لە چ مەنهەجێک کردووە، ڕەنگە باشترین ناوێک بۆ ئەم کتێبە ئەوەبێت کە کۆکردنەوەی زانیارییە دەربارەی ئیخوان لە باشووری کوردستان.

> **نازانرێت نووسەر لە نووسینی ئەم کتێبە پەیڕەوی لە چ مەنهەجێك کردووە، ڕەنگە باشترین ناوێك بۆ ئەم کتێبە ئەوەبێت کە کۆکردنەوەی زانیارییە دەربارەی ئیخوان لە باشووری کوردستان.**

دەبێت سەرنج لەوەش بدرێت نووسەر سەلیقەی پۆلێنکردنی بابەتەکانی نەبووە، جۆرێک لە شپرزەیی لە ڕیزبەندی بابەتەکان و پۆلێنکردنیان دەبینرێت، چەند بابەتی لاوەکی و سەرەباسی جیاوازی خستووەتە ناو کتێبەکەوە کە جۆرێک لە نەگونجاوی و ناتەبایی لە ڕیزبەندی بابەتەکان دروستکردووە.

**لایەنداری نووسەر:**

نووسینەوەی مێژوو پێویستی بە دیقەتی زۆر، وردبونەوە و بەراوردی زانیارییەکانە، تا نووسەر نەکەوێتە هەڵەوە و خوێنەریش بەهەڵەدا نەبات، فرەیی سەرچاوەکان بە دیوێکدا ئەرکی نووسەر قورستر دەکات و بە دیوێکیشدا دەبێتە کەرەستەیەکی باش بۆ نووسەر تا لەو نێوەندەدا ڕاستترین و وردترین زانیاری تۆمار

بکات و پشتئەستووربێت بەو سەرچاوانە، لە نووسینەوەی مێژووی هاوچەرخ بە ڕێژەیەکی بەرفراوان سوود لە کاراکتەرەکان وەردەگیرێت و چاوپێکەوتنیان لەگەڵ دەکرێت و زانیارییان لێوەردەگیرێت و تۆماردەکرێت، نووسەری ئەم کتێبە لە پێشەکیدا ئاماژەی بەوەدا نامەی ناردووە بۆ چەندین کەس و پرسیاری ئاڕاستەکردون و وەڵامی لێوەرگرتوون، و دەڵێت «گرنگی ئەم نووسینە ئەوەیە کە زۆربەی مێژووەکە لە دەمی کاراکتەرەکانەوە وەرگیراوە، و نووسراوەتەوە». نووسەر لە کۆتایی بەرگی شەشەم ناوی (١٥٨) کەسی نووسیوە کە سوودی لە دیدار و بیرەوەرییەکانیان وەرگرتووە و چەند پرسیارێکی ئاڕاستەکردون لە شێوەی چاوپێکەوتن، ئەوەی جێی تێبینییە و وەکو ڕەخنە ئاڕاستەی نووسەر دەکرێت بۆچی دیدارەکانی لەگەڵ کەسایەتییەکانی ناو یەکگرتوو کورتهەڵاتووە؟ نووسەر باس لە مێژوویەک دەکات کە بەر لە ڕاگەیاندنی یەکگرتووی ئیسلامییە و لە بەشێک لەو مێژووە لە باشووری کوردستان ئیخوان لەژێر هەردوو باڵی سەلاحەدین محەمەد و سدیق عەبدولعەزیز و بەناوی ئیخوانەوە کاریان دەکرد، هەرچەند نووسەر لە پێشەکیدا پاساوێکی لاواز دێنێتەوە تا خۆی پێ دەرباز بکات و دەڵێت:»جارێکیان چووم بۆ لای مامۆستا سدیق عەبدولعەزیز وتم بزانم وەزعی چۆنە! تاوەکو دیدارێکی لەگەڵ سازبکەم! بۆم دەرکەوت زەحمەتی نەدەم باشە، لەولاشەوە هەندێ بیرەوەری و چاوپێکەوتنی نووسراونەتەوە و خۆشم ماوەیەک لەگەڵ بەڕێزیدا ژیاوم، بەوە قەناعەتم کرد»، لێرەدا دەبێت بپرسین بەم نەفەسە مێژوو دەنووسرێتەوە؟ بەوە قەناعەتت کرد کە عەزیەتی نەدەیت زانیاری لێوەرگریت و خۆت ببیتە سەرچاوەی تۆمارکردنی زانیارییەکان؟ ئەگەر ئەم کتێبە بیرەوەرییە مافی خۆتە ببیتە سەرچاوەی زانیاری، بەڵام لە نووسینەوەی مێژوو بە چ پێوەرێک خۆت دەبیتە سەرچاوە و قەناعەت بە گێڕانەوەکانی خۆت دەکەیت؟! خۆ ئەگەر بڵێیت تەندروستی سدیق عەبدولعەزیز ڕێگربوو لەوەی دیداری لەگەڵ بکەیت، دەکرا دیدار لەگەڵ ئەو کەسانە بکەیت کە بە درێژایی ئەو مێژووە و تا ڕاگەیاندنی بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامیی لە ١٩٩٩ لە پاڵ سدیق عەبدولعەزیز لە خەباتدابوون و ئێستاش لە ژیاندان و دەکرا چاوپێکەوتنیان لەگەڵ بکەیت و ئەوانیش وەکو سەرچاوەی نووسینەکەت ئەژمار بکەیت، نەک تەنها ئەوانەی لەناو یەکگرتووی ئیسلامیدان، چونکە خۆت وتوتە گرنگی ئەم کتێبە ئەوەیە لە زمان کاراکتەرەکانەوە گێڕدراوەتەوە، باشە خۆ کادیرانی خەتی سدیق عەبدولعەزیز کاراکتەری ڕووداوەکان بوون، ئەی بۆ دیدارت لەگەڵ نەکردن؟ نموونەی ئەو کەسانەی دەکرا چاوپێکەوتنیان لەگەڵ بکرێت: نازم عەبدوڵڵا، ئارام قادر، مەحمود حەمەئەمین، تۆفیق کەریم، ئیکرام کەریم و ... تاد. ئەمە وێڕای ئەوەی لەو باسانەی پەیوەستە بە بزووتنەوەی ئیسلامی دەبوو سەرکردە دێرینەکانی

بزووتنەوەی ئیسلامیی کە ئێستا لە ژیاندان بدوێنێت و دیداریان لەگەڵ بکات، بۆ نموونە دیداری لەگەڵ ئەمانە بکردایا: کامیل حاجی عەلی، عەبدوڕەحمان نەورەسی، عەلی باپیر، عەبدولقادر برایەتی و ... تاد، بۆیە ئەوەی لەم نووسینەدا زەقە لایەنگری نووسەر و سەرچاوەکانە کە مەبەستمان ئەو (١٥٨) کەسەیە کە نووسەر دیداری لەگەڵ کردوون، بەمەش جۆرێک لە لایەنگری لە نووسینەکەدا دەبینرێت، بە سەرنجدان لەو باسانەی تایبەتە بە خەتی سدیق عەبدولعەزیز و هەڵوێستیان، نووسەر نەیتوانیوە بێلایەنانە ڕووداوەکان بخاتەڕوو و شەنوکەویان بکات و بە زەقی لایەنگری بۆ خەتی سەلاحەدین محەمەد بە نووسینەکەیەوە دیارە.

### سەرچاوە، پەراوێز و پاشکۆکان

یەکێک لەو کەموکورتیانەی لەم نووسینەدا هەیە شێوازی مامەڵەکردنی نووسەرە لەگەڵ سەرچاوەکان، نووسەر بەشێوەیەکی نازانستی لە پەراوێزدا ئاماژەی بە سەرچاوەی زانیارییەکان داوە، نەیتوانیوە پەیڕەوی لە یەک شێواز بکات، ئەو زانیارییانەی پێویستن دەربارەی سەرچاوەکان تۆماری نەکردووە، هەمان گرفت لە لیستی سەرچاوەکان دووبارەبووەتەوە، بۆ هەندێک سەرچاوە تەنها ناوی نووسەر و ناوی کتێبەکەی نووسیوە، هەندێکی تر ناوی چاپخانە و ساڵی چاپی نووسیوە، لە ڕیزبەندی تۆماری ئەو زانیارییانە پاشوپێشی کردووە و هەمووی بە یەک سیستم نەکردووە، ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی تێکەڵ کردووە، ڕیزبەندی سەرچاوەکانی لە ڕووی گرنگی و ئەو سیستمەی لە نووسینەوەی مێژوودا پەیڕەوی دەکرێت فەرامۆش کردووە، بۆ دیدارەکانیش تەنها ناوی کەسایەتییەکانی تۆمار کردووە، بێ ئەوەی ئاماژە بە مێژوو و شوێنی دیدارەکە بدات، لە کۆتایی هەر بەرگێکیشدا لە پاشکۆدا چەندین بەڵگەنامە خراونەتەڕوو، بەشێکی بەرچاوی ئەوەی لە پاشکۆکاندا خراونەتەڕوو زیادەیە و ئەگەر نەشخرایەتەڕوو هیچ کاریگەری نەرێنی نەدەکردە سەر ناوەڕۆکی نووسینەکە.

### زۆروبۆریی و بابەتی ناپێویست

بە سەرنجدان لە ناونیشانی کتێبەکە کە باس لە مێژووی ئیخوان دەکات لە نێوان ساڵانی ١٩٤٦- ١٩٩٤، بەڵام کە سەیری ناوەڕۆک دەکەیت، لێوانلێوە لە باسی بابەتی تر کە دوورە لە ناونیشانی کتێبەکە یان لە بەهێزترین ئەگەردا دەکرا بە کورتەیەکی کەم بابەتەکە بخرایەتەڕوو، بە نموونە لە بەرگی یەک لە باسی مێژووی کۆنی کوردەوە دەستپێدەکات تا هاتنی ئیسلام و خەباتی کورد لە کۆتایی دەوڵەتی عوسمانی، ٧٠ لاپەڕە بۆ ئەم باسە تەرخانکراوە کە بە نەبوونیشی هیچ کەلێنێک لە کتێبەکەدا دروست نەدەبوو، زیادەڕۆیی نییە ئەگەر بڵێین کۆی باسەکانی بەرگی یەکەم زیادەیە و ناچنە چوارچێوەی

ناونیشانی کتێبەکەوە و دەکرا بە باسێکی چەند لاپەڕەیی کۆتایی پێ بهێنرایە.

لە بەرگی دووەم، چەندین لاپەڕە تەرخانکراوە بۆ باسی حیزبی ئیسلامیی عێراق دوای ساڵی ١٩٩١ تا ٢٠٠٣ کە ئەمە زۆربەی لە دەرەوەی سنووری ئەو ناونیشانەیە کە نووسەر لەسەر بەرگ نووسیویەتی، لە بەرگی پێنجەم بە هەمان شێوە چەندین لاپەڕە تەرخانکراوە بۆ کار و چالاکی کۆمەڵەی نووسەران، دیسان لەوێشدا چەندین بابەتی دوای ١٩٩٤ باس دەکات. لە بەرگی چوارەم چەندین بابەتی مێژوویی دوای ساڵی ١٩٩٤ باس دەکات پەیوەست بە بزووتنەوەی ڕاپەڕین، بزووتنەوەی ئیسلامیی، کۆمەڵەی جیهاد، جوندلئیسلام، پشتیوانانی ئیسلام و ... تاد، زۆربەی ئەو باسانە لە دەرەوەی چوارچێوەی ناونیشانی ئەم کتێبەن و نووسەر ترانجونیەتە ناو کتێبەکە و بوونیان لەم کتێبەدا پێویست نییە، هەرچەند نووسەر لە پێشەکیدا ئاماژەی بەم تێپەڕاندنە داوە، بەڵام پێمان ناڵێت بە چ پاساوێک ئەمەی کردووە و پێویستی بوونی ئەو باسکردنە چییە!

سەبارەت بە وەرگرتنی زانیاریش لە سەرچاوەکان، نووسەر سەلیقەی پوختکردنەوە و کورتکردنەوەی زانیارییەکانی نەبووە، بۆیە هەندێکجار چەند لاپەڕە زانیاری وەرگرتووە لە یەک سەرچاوە و وەکو خۆی دایناوەتەوە، بۆ نموونە لە بەرگی چوارەم تەوەری یەکەم تایبەتە بە ڕاگواستن، هەڵەبجە و ئاوارەکان، پاشان تەوەری دووەم تەرخانکراوە بۆ ئەحمەدی موفتی زادە و ناسر سوبحانی و بانگەوازی سوننە لە ئێران، لە ل٣٩٠- ٣٩٧ دەقی گفتوگۆیەکی عەبدولڕەحمان پیرانی بڵاوکردووەتەوە کە باس لە کۆمەڵەی دەعوە و ئیسلاحی ئێران دەکات و پێشتر لە گۆڤاری ستاندەر بڵاوبووەتەوە، هەمووی جارێکی تر لێرەدا بڵاوکراوەتەوە، هەر لە بەرگی چوارەم ل٣٩٩-٤٧٨ تەرخانکراوە بۆ باسی سەلەفییەت بە گشتیی و سەلەفییەکانی کوردستان بەتایبەتی، نووسەر لە ل٤٠٢ لە پەراوێزدا نووسیویەتی:» ئەم بەشە وەک نامیلکەیەک پێشتر نووسیومە و بڵاومکردووەتەوە، بۆیە لێرەش وەک خۆی بڵاوی دەکەمەوە بە پێشەکی و ناوەڕۆک و کۆتاییەوە»، نووسەر لەم بەشەدا دەچێتە سەر باسی داعش کە هیچ پەیوەندی بەو مێژووەوە نییە کە لە ناونیشانی کێبەکەدا نووسراوە، تەنانەت لەم بەشەدا نووسەر دەچێتە ناو باسەکانی فیقهی ئیسلامی و مشتومڕ لەگەڵ سەلەفییەکان لەسەر بابەتی فیقهیی بچووک کە دور و نزیک پەیوەندی بە مێژووەوە نییە، لەمەوە ئەو ئەنجامە بەرجەستە دەبێت کە دەکرا نووسەر خۆی لەو بابەتە زیادە و ناپێویستانایە لادایا، لەجیاتی ئەوە تەرکیزی زۆرتری بخستایەتە سەر لایەنە مێژووییەکە و نووسینەکەی لەو چوارچێوەدا چڕبکرادایەتەوە کە لەسەر بەرگ ئاماژەی پێداوە و کارێکی زانستی پێشکەش بکردایە.

# ڕۆستێ

# گوندێکی کوردەواری لە باکووری ڕۆژهەڵاتی کوردستانی عێراق


**ج.پ.ن. گالۆوەی**

**لە ئینگلیزییەوە: ڕەوەند سەباح ئەحمەد**





لەدایکبووی ١٩٧٧، شەقڵاوە، ماستەر لە زمانی ئینگلیزی، مامۆستا لە وەزارەتی پەروەردە و وانەبێژ لە بەشی زمانی زانکۆی تیشکی نێودەوڵەتی لە هەولێر.

=کوردستان زیاتر زاراوەیەکی جوگرافییە نەوەک سیاسی، ئەگەرچی کوردەکان لەیەک ناوچەی جوگرافی نیشتەجێن، کەچی سنورەکانیان دابەش دەبێ. کوردەکان لە باشووری ڕۆژئاوای تورکیا و باکووری ڕۆژئاوای ئێران و باکووری ڕۆژهەڵاتی عێراق نیشتەجێن. ئەم باسە تایبەتە بە گوندێکی بچووکی دوورە دەست لە باکووری ڕۆژهەڵاتی عێراق. بۆ ئەوەی بگەینە ئەو ئاواییە لە باکووری ڕۆژهەڵات، هەر چوارمان، گەشتەکەمان لە شاری کەرکووکی دەوڵەمەند بە نەوت دەستپێکرد، بەرەو شاری دێرینی هەولێر ڕۆیشتین، لەوێشەوە لە ڕێگە بەناوبانگەکەی ڕواندوز بەرەو یەکەم  زنجیرە چیاکانی زاگرۆس و شارۆچکەی ڕواندوز بەڕێ کەوتین. لەوێ گوندێکی خنجیلانە هەیە، نزیکەی ٢٥ میلێک لە شارۆچکەی ڕواندوز دوورە، ئەم گوندە ناوی گەلاڵەیە. لە ئاقاری ئەو گوندە گەشتەکەمان دەستپێکرد. ئەو ڕێگە  دوو سەعاتی دەوێ تا بە هێستر بەسەر دەکەوی، هەرکە لەو ڕێیە سەرکەوتین، گەیشتینە شاخێکی ٧٠٠٠ پێ بەرز. لەسەر بەرزی ئەو شاخە یەکەم دیمەنی گوندی (ڕۆستێ)مان هاتە بەر چاوان، ڕیزە خانوویەکی ڕەنگ خۆڵەمێشی بە دیارکەوتن، هەندێکیان کەوتبوونە پشت دامێنی چیاکە، هەشت میلێک لە ئێمە دووربوون.




**گوندی ڕۆستێ نزیکەی ٤٣٠٠ پێ لە ئاستی ڕووی دەریا بەرزە،  هەروەها نزیکەی ١٠٠٠ پێ لە ئاست ڕووبارۆچکەکەی ڕۆستێ بڵندە.**

ئەم گوندە نزیکەی ١٣٠ ماڵی تێدایە، خانووەکانیان لە دامێنی چیا سەخت و سەرکەشەکە چین چین لەتەک یەک و لەسەر یەک بنیاتنراون. دانیشتوانی گوندەکە ٧٠٠ کەسن. گوندەکە ڕووی لە باشوورە و بەسەر دۆڵێکی کراوە و کشتوکاڵی دەڕوانێ، لەژێر دوو لووتکە و کەناری چیای هەڵگورد سەردەردێنێ. هەڵگورد بەرزترین چیایە لە عێراق و ١٢٠٠ پێ بەرزە. خانووەکانی گوندی ڕۆستێ لە بەرد دروستکراون و سەربانەکانیان تەخت و پانن. بەشی سەرەوەی هەندێک لە خانووەکان لە قوڕ و خشت بنیاتنراون، بەڵام بناغەکانیان لەبەرد ساز کراون، دەرگای خانووەکانیان لە داری تۆکمە و ئەستور جێگیر کراون و پەنجەرەکانیش هەندێک جار بە ئالو واڵای دارین ڕازێندراونەتەوە. دینگەی

بنمیچی خانووەکان بە قەدی داری سورەچنار ڕاگیرکراون و بە لق و پۆپ و گژوگیا ڕووپۆش کراون و پاشان بە باگردێن قوڕ لەسەر ڕووەکە پەستێندراوەتەوە. سەربان و بنمیچی خانووەکان بە باشی بە باگردێن دەپەستێندرێنەوە تاکو سەربانەکان لە مانگی ئەیلول و وەرزی باران بارینی زستان ئاوی تێنەچێ، ئەگینا بەهۆی درزی گەرمای هاوین سەربانەکان ئاوی لێ دەچۆڕێتەوە و دڵۆپە دەکا. لە مانگەکانی هاوین، ناو خانووەکان زۆر گەرم دادێ و گوندییەکان پەنایەک بۆ خۆیان لە سەوزایی و گەڵای دار لەسەر بانی خانووەکان یان لە نزیک باخ و بێستانەکانیان دادەمەزرێنن و بۆ خۆیان تا وەرزی بارانبارین لەو جێگەیانە دەمێننەوە.ماڵی دەوڵەمەند و ئاغاکانیش بە پەرژینێک لە دەرەوە و ناوە و دەورە دراون، دیوارەکانیش بە قوڕی سپی سواخ دراون.

بە پیتترین زەوییەکانی گوندی ڕۆستێ دەکەونە لێژاییەکانی خوارەوەی گوندەکە، لەو ناوە ئاوێکی سازگار هەڵدەقوڵێ، کشتوکاڵێکی زۆریشی لێ دەکرێ، بەتایبەتی دارگوێز، کە خاکەکەی زۆر لەبارە بۆئەم درەختە. ئەو قەتار و کێڵگە کشتوکاڵییانەی دۆڵەکە کە ڕووی لە باشوورە، تیشکی خۆری زیاتر بەردەکەوێ، ئەو شاخە قسڵییەی ٩٠٠٠ پێ لە پشت گوندەکە بەرز دەبێتەوە، ڕێگری لە بای باکووری ڕۆژئاوا دەکا. زەحمەتە بوترێ کامە لەو کێوە بەرزانە لەلایەن خەڵکە ڕەسەنەکەی بەهەند وەرگیراوە، بەڵام هەڵکەوتەی جوگرافی گوندەکە و هەڵقوڵاوی ئاوی ئەو کانیاوە سازگارانەی کە لە پشت گوندەکە و لەژێر کەندەڵانی شاخە کڵسییەکان دەزێن، لەوانەیە ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگربن.

سەرەکیترین بەروبومی کشتوکاڵی لەم دەڤەرە، بەروبومی گەنم و جۆیە، ئەو دوو بەروبومە زۆرترین ڕووبەری زەوییەکان داگیر دەکەن. لە زۆربەی ئەو زەوییە کشتوکاڵییانەی دەغڵ و دانەوێڵەی گەنم و جۆی لێ دەڕوێ، فاسولیاشی لێ دەچێنن، بەڵام لە پاش وەرزی دروێنەی بەروبومی گەنم و جۆ. بەروبومی جۆ بەگشتی دانەوێڵەیەکی بەهارییە، سێ مانگی پێدەچێ تا گەشە دەکات و پێ دەگا، عادەتەن لە مانگی ئادار دەچێنن و تۆو دەکەن، لە مانگی حوزەیران دەیدرونەوە. دوو جۆری گەنم لەم ناوە دەڕوێندرێ، یەکێکیان گەنمی زستانەیە و ئەوی تریان گەنمی بەهارییە (بەهاری). گەنمی بەهاری لەگەڵ جۆ دەچێندرێ لە مانگی ئازار و لە مانگی حوزەیران دەدروێندرێتەوە. گەنمی زستانە شەش مانگی پێدەچێ تا پێدەگا، لە مانگی ئاب دەچێندرێت و لە مانگی ئایاری ساڵێکی تر دەدروێندرێتەوە، کەچی گەنمی بەهاری، ئەگەر کەشوهەوا لەبار و گونجاو بێ، هەندێک جار لە مانگی شوبات تۆو دەکرێ، لە مانگی ئاب دەدروێندرێتەوە.

بەگشتی بەرهەمی دانەوێڵە لەو ناوچە بەرهەمێکی خراپ و لاوازە، شەن و کوتان و لە بێژینگدانی گەنم لەگەڵ ماددەیەکی تر تێکەڵ دەکرێ، ئەوەش بەهۆی شێوازی کوتان و لاوازی دانەوێڵەکەیە. هاوینان جووتیارەکانی دێیەکە بە داس دروێنەی گەنم و جۆ

دەکەن، ڕۆژانە بە شەغرە، بە گوێدرێژ و هێستر دروێنەکانیان دەگوازنەوە شوێنی خەرمانەکانیان کە زۆر نزیکن لەماڵەکانی دێیەکە. کە دروێنە تەواو دەبێت، نۆرەی گێرەکردن و کوتانی خەرمان بە جەنجەڕ دێت کە جووتێ لە گاکان یان گوێدرێژ یا هێستر ڕایان دەکێشن. جەنجەڕ قرشەی خەرمانەکانی دەبڕێ و وردی دەکا. دوا قۆناغی کوتانیش وردە کوتەیە. دوای کوتان، نۆرەی شەنکردن دێت، کە قرشەی خەرمانەکانیان وردەکوت دەکەن، خاوەنی خەرمانەکان، چاوەڕێی هەڵکردنی (بای شەماڵ) دەکەن، کە بایەکی فێنک و لەسەرخۆیە. بۆئەوەی شەن بکەن، بە شەنکردن بای شەماڵ کایەکەی لە دانەوێڵەکە دوور دەخەنەوە، چونکە کا لە دانەوێڵە سووکترە. بەم شێوەیە گەنم و جۆیەکانیان لە کا پاک دەکەنەوە. دوایش گەنم و جۆ پاک کراوەکە لە بێژنگ دەدەن، تا لە بەرد و زیخ و شتی تر پاکی بکەنەوە. دانەوێڵەکە لە ژووری خانووەکان لە گونییەی دەستکردی ئاوایی عەمبار دەکرێ و هەڵدەگیرێ.

توتن بەروبومێکی تری دانەوێڵەی ناوچەکەیە، لە پلەی سێیەم دێ لە بەروبومی ئاوایی. دانەوێڵەیەکی هاوینییە لە پارچە زەوی بچووک دەچێنرێ و دەبێ ئاودێرییەکی باش بکرێ. تۆوەکان لە مانگی شوبات لە شوێنی تایبەت دەچێنرێن و پاشان بۆ مانگی حوزەیران دەگوازرێنەوە کێڵگەیەکی تر سەر لەنوێ دەچێنرێنەوە. دانەوێڵەکە بە وریایی پاچەکۆڵە دەکرێ و لە گژوگیای پاک دەکرێتەوە. لە مانگی ئاب گەڵای توتن سەردەردێنێ و گەشە دەکات. دوای چاندن و گەورەبوون، لە سەرەتاکانی مانگی ئەیلول، گەڵای توتنەکە بە تەڕیی و سەوزی لێدەکرێتەوە و بە دەزوویەک هەڵدەواسرێ، لە شوێنی تایبەت کە پێیدەگوترێت زینانی توتن، یاخود زاخە، هەڵدەگیرێ، تاوەکو ڕەنگە سەوزەکەی زەرد یاخود قاوەیی دەبێ، دواتر بۆ جیاکردنەوە و فرۆشتن ڕەوانەی ڕواندوز دەکرێ. لە فرۆشتنی توتندا حکومەت سیاسەتی پاوانخوازی و قۆرخکردن بەکاردێنێ، نرخەکانی بەپێی جۆری توتنەکە جێگیر کردووە. باشترین جۆریان بە ١٠ شیلینگە و خراپترینیشیان بە ٣ تا ٤ شیلینگە (١٩٥٦).

بەروبومێکی تری دانەوێڵە لە ئاوایی گوندی ڕۆستێ، گاڕس (هەرزن)ە. ئەم دانەوێڵەیە دوو جۆری هەیە، جۆرە گەورەکەیان پێی دەگوترێت (هەرزن)، بچووکەکەشیان پێیدەگوترێت (دوخن). هەردوو جۆرەکە لە مانگی حوزەیران تۆو دەکرێن، لە مانگی ئاب یان ئەیلول دەدروێندرێنەوە، بەڵام ئەم دانەوێڵە بڕێکی زۆری لە ڕۆستێ لێ ناڕوێ. وەک پێشتر باسمان کرد، فاسۆلیا دانەوێڵەیەکی زستانەیە، عادەتەن لە پاش دروێنەی گەنم و جۆ دەچێنرێ. سێ جۆری تۆزێک لێک جیاواز لە فاسۆلیا هەن، ئەو جۆرانەش هاوشێوەی فاسۆلیای فەڕەنسی وان. بەروبومێکی تری ناوچەکە، داری سورەچنارە، ئەم ڕووەکە لە ڕووبەری بچووک، لە نزیک یەکتر دەڕوێندرێ، بۆ دینگە و کۆڵەکەی خانووەکان بەکاری دێنن.




بەروبومێکی تری ئاوایی ڕۆستێ، ترێیە، ئەگەرچی بەرهەمێکی کەمە بەڵام ناوبانگی خۆی هەیە. چەند ڕەزێکی ترێ لەم ئاواییە هەن، یەک دوانیان گەورەن، بەڵام هیچیان بە باشی چاودێری نەکراون، هەربۆیە بەروبومەکەیان کەم و لاوازە. لە گوندێکی نزیک، ئەگەرچی ترێیەکەیان هاوردە کردبوو، ترێیەکی شیرین و بەتام و ڕەنگ سپی بوو. ئەو بەروبومە بۆ خواردن میوەیەکی چاک بوو، ئەگەرچی کوردەکان شەرابی (خەل)ی لێ دروست دەکەن، ئەم شەرابە ماددەی کحولی تێدا نییە. زۆربەری زۆری ئەو دارمێوانە لە ڕەز و باخ دەچێنن، لە تەنیشت  ماڵ یان لە قوژبنێکی زەوییەکانیاندا بەدیدەکرێن و هەن. چەندەها جۆر دارمێو و ترێ لەناو باخچە و شینابیەکانیاندا هەن، لەنێو  ڕەز و باغ و بێستانەکانیان چەندین جۆر سەوزە بەر دەگرێ، وەکو تەماتە و بامیە و پیاز و کاڵەک و تاڕادەیەک پەتاتە و کەلەم. هەرچی بەربوومی میوەشە، لە زۆربەی زۆری باغەکان بەرچاو دەکەوێ، بەتایبەتی قۆخ و سێو. میوە داهاتێکی تری گوند و ئاواییەکەیە، نزیکەی ١٠٠ سێو و قۆخ بە پێنج شیلینگە. داهاتێکی تری بەروبوومی ناوچەکە، کە گوندییەکان دەستیان دەکەوێ، گوێزە، داری گوێزیش لە هەردوو ڕووی دۆڵەکە بەرچاو دەکەون. عادەتەن دارگوێزەکان لە نزیک ئاو شین دەبن و گەشە دەکەن، نزیکەی ١٠٠٠ گوێز بە قیمەتی ١٠ شیلینگە. هەندێک لە بەروبوومی گوێزەکان لە بازاڕەکانی نزیک ساغ دەکرێنەوە و بە خەڵکی ناوچە پیدەشتەکانی باشوور دەفرۆشرێن، بەڵام زۆربەشیان لە ناوخۆ ساغ دەکرێنەوە و بەگوندییەکان دەفرۆشرێن.

ئەو بەروبوم و دانەوێڵەیەی لە ڕۆستێ و ئاواییەکانی دەوروبەری دەچێنرێ و بەرهەم دەهێنرێ، پیدەچێ لە بارێکی زۆر باش نەبن. بۆ نموونە، لە یەکێک لەو گوندانەی نزیک ڕۆستێ (سیدەکان)، ئەگەرچی ئاوێکی زۆر و سازگاریشی لێیە و ئەو بەروبوومەی

لێی دەڕوێندرێن بریتین لە برنج و قامیشی شەکر و پەتاتە و کونجی و گەنمەشامی. هەرچەندە سیستەمی کشتوکاڵی لە سەرەتا پێدەچێ هەڕەمەکی بێت، بەڵام لە واقیع وەک بڵێی ئەو ئەرزە بەجێهێڵراوبێت و چەند ساڵێک کشتوکاڵی تێدا کرابێ و دواتر بەجێهێڵرابێ و فەرامۆش کرابێ.

لە ساتەوەختی ڕووپێوی کردنەکە، پێدەچوو زەوییەکی کەم کێڵدرابێ، چەند نیشانە و ئاماژەیەکیش هەبوون، کە زەوییەکان کشتوکاڵی تێدا کرابێ و پاشان جێهێڵدراون. زۆربەی زۆری ئەو زەوییانەی کێڵدراون و بەجێهێڵدراون، ئەو زەوییانەن، کە دانەوێڵەی هاوینەی وەک گەنم و جۆی تێدا چاندرابێ، دواتر بە جێهڵدرابێ تاکو بەهاری دادێ. کشتوکاڵ کردن و چاندن لە ڕۆستێ لەسەر بنەمای سیستەمی پشک پشکێنە، واتە لە بەرامبەر بەکارهێنانی ئاو و زەوی و زار، جووتیار بەشێکی خۆی ڕادەستی خاوەن موڵک دەکات. هەرچەندە ڕۆستێ لەو گوندانە نییە، لە مانگە وشک و گەرمەکانی ساڵ، کە کێشەی کەم ئاوی هەبێ. چاو لەسەر جوتیارەکانە تا لەوەی دەیخۆن و بەکاریدەهێنن بەشی دراوسێکانیش بدەن، هەریەکەیان دەزانێ، کەی سەرەی بەردانەوەی ئاوەکەیە بۆ ئاودێری لەکاتی پێویست. ئەو کرێکارانەی کار لە زەوییەکی بەراو دەکەن، ڕێژەی بەشکردنی داهاتەکەی لەگەڵ خاوەن زەوی دوو بە یەکە، بەڵام ئەگەر زەوییەکە بەراو نەبێ، پێویستی بە ئاودێری بێ دەبێ ڕێژەی پشکی داهاتەکە نیوە بە نیوە بێ.

لە سەرووی ئەو زەوییانەی بەردەوام کشتوکاڵی تێدا دەکرێ، چەند کێڵگەیەکی پەرش و بڵاوی هەرزن و کا هەن. دەستگەیشتن پێیان کارێکی قورسە، بەهۆی سەختی نزمایی و لێژاییەکان و دووری لە دێیەکە، گوندنشینەکان پتر گرنگی بە لەوەڕ و پاوان دەدەن. مافی هەمیشەیی لەوەڕ و پاوانی گوندییەکان لە ڕۆستێ تا لوتکە و تەپەکانی دەوروبەرە. خەڵکی گوندی ڕۆستێ نزیکەی ٢٥٠٠ سەر مەڕ و بزنیان هەیە، هەروەها ژمارەی ڕەشە وڵاغ و مانگا و گامێشەکانیش، کە لەو زەوییانەی کشتوکاڵی تێدا ناکرێ و پوش و پەڵاشن و یان ئەو شوێنانەی بە چڕی و پڕی چاندنی لێ دەکرێ، دەگاتە ١٠٠٠ دانە. لە مانگی شوبات، کاتێک بەفر تازە بە تازە دەست بە توانەوە دەکا، مەڕوماڵات بۆ لەوەڕگای ناوچە بەرزەکان دەبەن، بۆ زستانیش تاوەکو مانگی تشرینی دووەم، نایەنەوە خوارەوەی ئاوایی. گوندنشینانی ڕۆستێ بە درێژایی وەرزی هاوین هەر لەنێو ئاوایی نامێننەوە، بەڵکو لە دۆڵی ڕۆستێ بەرەو لەوەڕگای کوێستانەکانی چیای هەڵگورد کۆچ دەکەن و دەکشێن، لەوێ هەم گوندنشینان و هەمیش ڕەوەند و کۆچەرییەکان مافی یەکسان و هاوبەشیان بۆ لەوەڕاندی ئاژەڵەکانیان هەیە. چەند بنەماڵەیەکیش لە گوندی ڕۆستێ لە ئاوایی نامێننەوە لە هاوینان لە دۆڵەکەوە سەر دەکەون، لەوێ هەواری هاوینە هەڵدەدەن و خانووی بەردین دروست دەکەن یان خێوەت هەڵدەدەن، هەر لەوێش کشتوکاڵ و شینای دەچێنن،

بۆ زستانیش ڕیسی و گزرەگیا دەپێچن و گیای دوراوەی وشک بۆ خواردنی ئاژەڵ ئامادە دەکەن، دواتر لە ڕیسی گەورە بە باری گوێدرێژ دەگوازنەوە خوارەوەی ئاوایی.

خەڵکی گوندی ڕۆستێ تاڕادەیەکی بەرچاو بۆ بژێوی و گوزەرانی ژیانیان پشت بە بەخێوکردنی مەڕ و بزن دەبەستن، چونکە هەم خۆراک و هەمیش قوماش و جلوبەرگیان بۆ فەراهەم دەکەن. پێدەچێ بەهۆی کرانەوەی خەڵک و گوندەکە بە ڕووی جیهانی دەرەوە شێوازی کشتوکاڵکردن بگۆڕن و بەرەو پێشەوەی ببەن و زیاتر گرنگی بەو بەروبومانە بدەن، کە داهات و پارە پەیدا دەکەن، بۆ نمونە وەک چاندنی توتن. ئەگەر ئەمەش ڕوویدا، دابونەریتی کۆنی کۆچکردنی هاوینە بۆ کوێستانەکان لەناو دەچێ، چونکە مەڕ و بزن، بەتایبەت بزن زیانێکی زۆر بە دانەوێڵەی تازە دەگەیەنێت، هەربۆیە دەبێ یان زەوییە کشتوکاڵییەکان پەرژین بکرێن یانیش مەڕ و ماڵاتەکە لەو ناوچانە دووربخرێنەوە. بەڵام ئێستا ناچێتە ئەقڵەوە، ئابووری کۆمەڵگەکە لە کۆمەڵگەیەکی ئاژەڵداری و گوندەوارییەوە بۆ کۆمەڵگەیەکی کشتوکاڵی بچێ، خەڵکەکەی بەکاری ئاژەڵداریی و باخدارییەوە مژوولن، چونکە لەڕووی ئابوورییەوە مەڕ و بزن کەلوپەلێکی زۆری ڕۆژانە بۆ خەڵکەکە دابین دەکات، ئێستا کۆڵەکەی ئابوورییە، بۆ نمونە جلوبەرگ و ئەو خێوەتە ڕەشانەی شوانەکان بەکاریان دەهێنن، یان گوریس و گونییەی دەغڵودان و سەلەی گەورە و لغاو و تاقمی ئەسپ و هێستر و چەندین شتومەک و پێداویستی تر فەراهەم دەکات. ئەمە جگەلەو گۆشت و شیرەی دەستیان دەکەوێت، کە شیرەکە بە چەندین شێوە بەکاردەهێنن و خوانێکی سەرەکییە لەلای کوردان. لە شیری مەڕ و بزن و مانگا ماست هەوێن دەکەن، شیرەکە تا پلەیەکی گەرمی دیاریکراو گەرم دەکەن، پاشان شیرەکە دەبزرکێ و شیری ترشاوی تێدەکەن، ماستی لێ هەوێن دەکەن، دواتر ماستەکە بە نان دەخۆن، زۆرجاریش ماستاوی لێ دروست دەکەن. ئەو ماستەی سەرف نابێت و ناخورێت، دەیخەنە ناو مەشکە، ئافرەتانیش ڕایدەژنن و ئەملا و ئەولای پێدەکەن پەنیر و دۆی خەستی لێ دروست دەکەن، دۆیەکەش خواردنەوەیەکی پڕ چێژە، کوردەکان زۆر حەزی لێ دەکەن و دەیخۆنەوە، هەندێکجار هەر بە گاڵتە و بۆ خۆشی پێی دەڵێن دۆ کۆلا، بە کۆکا کۆلای کوردی دایدەنێن.

جگەلەو خۆراکانەی لە مەڕ و بزن دەستیان دەکەوێ، نانیش، کە لە ئارد دروستی دەکەن، گرنگی خۆی لەنێو ژەمە خۆراکەکان هەیە. لە ئاشیی ئاویی گوندەکان ئاردەکە دەهاڕن، ئەگەریش نەبێ بە دەستاڕ، بەدەست دەگێڕدرێ و دانەوێڵەکەی پێ دەهاڕن. ئاشی ئاویی بەبێ پێچکە و چەرخ دەکەوێتە گەڕ، پشت بە تۆربین دەبەستێ؛ مەکینەیەکی پێچکەدارە بەهێزی هەوا یا ئاو دەخولێتەوە. ئەو نانەی ئەوان دەیخۆن نانی کوردی پێدەڵێن، نانی کوردی خڕ و تەنکە، لەسەر سێڵی نان دەبرژێندرێ.

لە خۆراکە گرنگەکانی تری ناوچەکە، برنج و ساوەر و هەنگوینی چیایە. کوردەکان

حەز بە چا خواردنەوە دەکەن، لە ئیسکان چا دەخۆنەوە، بەڵام بەبێ شیر دەیخۆنەوە و شەکرێکی زۆری تێدەکەن. خواردنەوەی چا بە نەریت بەڕێوەدەچێ، خەڵکەکە لەسەر ئەرزی دادەنیشن و دەورەی لێ دەدەن، چەند چایەک لە ئیسکانەکان لەلایەن خانەخوێ دەخۆنەوە. ئەم گردبوونەوەیە ماوەی چەند سەعاتێکی پێ دەچێت و بە سەرچاوەی هەواڵ و قسەوقسەڵۆک دادەنرێ. ئەگەر کەسێک یان بێگانەیەک لە ئاوایی گوندەکە بمێنێتەوە، داوای لێ دەکرێ چایەک لەلایەن ئەو خەڵکە مێواندۆستە بخواتەوە.

ئەو خورییەی لە بزن و مەڕ بەدەستی دەهێنن، سەرمایەیەکی سەرەکییە بۆ هەردوو پیشەسازی دەستی ڕستن و چنینی جلوبەرگ و مافور و ڕایەخ. لە چنینی قوماش ئافرەتەکان سەرەتا بەدەست دەستیان بە شیکردنەوە و ڕستنی داوە خورییەکانیان دەکەن، دواتر دەیدەنە دەست پیاوەکان و دەستگای تەونکاری یان جۆلاییەکەیان بەگەڕ دەخەن. لە ڕۆستێ دەسگایەکی بچووک هەبوو، لە هۆڵێک، لەسەر زەوییەکە بە هەردوو دەست و قاچییان بەگەڕییان دەخست. مادەیەکی پتەو و چنراوێکی زبر بە کەژوی باریکی ٨ ئینج پانیان لێ بەرهەم دەهێنا، دواتر ئەو کەژوانە لەیەکتر دەچنران و جلوبەرگی کوردەوارییان لێ دەچنی. تا ئێستاشی لەگەڵ بێ، زۆربەی زۆری کوردەکان ئەو پۆشاکە دەپۆشن، لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر کەمێک لەیەکتر جیاوازە. سەبارەت بە گوندی ڕۆستێ کورتەکێکی کورت و نەخشێندرا و ڕازەو و شەرواڵی درێژ و فشۆڵ دەپۆشن، لەسەر ئەوانەش پشتێنی ئاوریشم چن یان لۆکەیی بە درێژی ٨ یارد چەند جارێک لە کەمەریان دەئاڵێنن، لەگەڵ ئەوانەش جامانەیەک لەسەریان دەبەستن.

چنینی ڕایەخ و فەرش زیاتر لە ماڵەکان دەکرا نەک لە پیشەسازی ڕستن و چنین، چونکە دەستگای تەونکاری زیاتر لە ماڵە تایبەتەکان دەبینرێن نەک لە باڵەخانەیەکی سەرەکی. ئەو پیشەسازییە بەتەواوی لەژێر دەستی ئافرەتاندایە، کە کاری شیکردنەوە و ڕستن و چنین و بۆیەکردنەکە دەکەن. فەرشی قەبارە جۆراوجۆر لە دەستگای جۆلا دەچنرێ، بە گشتی ئەو ڕایەخانەی لێی بەرهەم دەهێنرێن شەش پێ پانن، مەزەندە دەکرێت ڕایەخێکی ٨ پێ درێژ دوو مانگی پێ بچێ تا تەواو ببێ. ئەو نەخش و نیگارانەی باون پتر ڕەنگی شینی تۆخ و سوور و پرتەقاڵین. فەرشە چنراوەکە لە فەرش و ڕایەخی فارسی ئەستورتر و بریقەدارترن، بەڵام دەڵێن بۆیەکەیان کاتییە، چونکە هاوەردەکراون و لە سەوزەی سروشتی وەرنەگیراون. بەپێی ئەو باس و خواسانە بن، ئەندامانی گەشتەکە لە گەڕانە مەیدانییەکانیان چنگیان کەوتووە، ژیانی گوندی ڕۆستێ گوزەرانێکی سادە و ساکاری هەیە، لەوانەیە هێندە گۆڕانی بە خۆوە نەبینیبێ لە ماوەی ئەو سێ هەزار ساڵەی ڕابردوو.

گوندی ڕۆستێ لەو قوژبنەی کورستانی عێراق، نمونەیەکی دیار و زەقی ژیان و گوزەرانی کوردە نیشتەجێبووەکانە. بەپێی شینایی و سەوزایی و کشتوکاڵی ئاوایی

بێ، وا بیردەکەیەوە  ژیان و گوزەرانی خەڵکی گوندی پتر بە کشتوکاڵی بەندە، لات زەحمەتە بڵێی گوزەرانیان بەندبێ بە ئاژەڵداری، کەچی گوندی ڕۆستێ پشت بە هەردوو سەرچاوەکە دەبەستێ، بەڵام زیاتر بە کاری شوانکاریی و ئاژەڵداری خەریکن.

چەندین سەدەیە، باکووری ڕۆژهەڵاتی کوردستانی عێراق، شوێنێکی دوورەپەرێز و دوورەدەست بووە، ئەگەرچی تەکنۆلۆجیای نوێ ماوەیەکە سەری دەرهێناوە، ئەم پێشکەوتنە بەگشتی بۆ عێراق گرنگە، بەتایبەتیش بۆ کوردستانی عێراق، چونکە لە عێراق ناوچەیەکی  تێر بارانە. ئەو ڕێگەیەی ڕۆستێ بە گەلاڵە و ڕێگەی ڕواندوز دەبەستێتەوە لەژێر دروستکردندایە. ئەگەر ئەو ڕێیە تەواو ببێ، شێوازی ژیانی کۆنی لادێی و عەشایری پتر دەکەوێتە ژێر کاریگەری دەرەکی.

گەشتیاران لە باشوور لە شارە گەورەکان بەخۆیان و چیرۆک و سەربوردەی سەیر و سەمەرە ڕوو لەو ناوچەیە دەکەن، لە ئەنجامدا خەڵکێکی زۆر لە ڕۆستێ بۆ باشترکردنی بژێو و سەرچاوەی داهاتیان ڕوو لە باشوور دەکەن. زەویناسان و بەرپرسانی زانستی دارستان و ئەندازیاران و کاربەدەستانی پەروەردە، سەرنج دەخەنە سەر ئەو هەرێمە، لەگەڵ ئەوەشدا، پێوستی بە گەڕان و لێکۆڵینەوە و پشوودرێژییەکی زۆر هەیە تاکو هەوڵەکان بگەنە دەرەنجامێک.

ئەگەر پاش دە ساڵی تر گەشتێکی تر بۆ ئەم ناوچەیە بکرێ و بەراوردێک لەگەڵ ئێستا بکەی، گۆڕانکاریی و پێشکەوتنەکانی ڕۆستێ  بە تایبەتی و کوردستان بە گشتی، مایەی سەرنج و تێڕامان دەبێ. خەڵکەکەشی سەربەست دەبن و شانازی بەو دەستکەوتانەی باوباپیرانیان دەکەن، کە هەر لە سەردەمی سەرکردەیەکی مەزنی وەک سەلاحەدینی ئەیوبی  یاخود زووتر تاکو ئێستا بێ وچان هاتۆتە ئاراوە.

**تێبینی: ئەو زانیارییانە لەسەر بنەمای ئەو گەشتەی زانکۆی ئۆکسفۆرد ساڵی ١٩٥٦ کردوویەتی، کۆکراوەتەوە. ئەوەی خوارەوە پوختەی کاری ئەندامانی گەشتەکەیە:**

١. وەسفی جوگرافی ئەو هەرێمە لە ١٥،٠٠٠ وشە و نزیکەی ڕووبەری ١٠٠٠ میل چوارگۆشە، لە باکوور و ڕۆژهەڵاتی شارۆچکەی ڕواندوز تا دەگاتە سنورەکانی وڵاتی فارس و تورکیا پێکدێ. ئەو وەسفانە بە نەخشە و وێنە پاڵپشتی کراون و لەلایەن ج.س. وێلکینسۆن و ج.پ.ن. گالۆوەی نوسراون.

٢. نەخشەی گوندی ڕۆستێ و زەوییەکانی دەوروبەری بە پێوەری یەک گرێ و ٢١٠ یارد و هێلکاری ٢٠٠ پێ کێشراون. ئەم ڕووبەرە نزیکەی ٢٠ میل چوارگۆشەیە، هەروەها نەخشەکە ئەو زەوییە نیشان دەدات، کە ساڵی ١٩٥٦ ڕووپێو کراوە.

٣. دوو کۆمەڵە ڕووەک و درەخت کە هەریەکەیان نزیکەی ٣٠٠ جۆر ڕووەک و درەختی لەخۆ دەگرێ لە شوێنی گەشتەکە کۆکراونەتەوە. یەکێکیان ئێستا لە کۆلێژی ئاداب و

زانستە لە بەغدا، ئەوەی تریان لە مۆزەخانەی بەریتانیایە.

٤. لەمیانەی گەشتەکە کاری هەندێک جۆری گڵێنە و گڵکاری دەسکردی ئاشوورییەکانی گوندی دیانە بەدەستکەوتووە. گڵکارییەکە کارێکی سەرنجڕاکێشە، چونکە شێوازی دروستکردنی سەرتاییە و لە ڕێگەی خولانەوە بێ بەکارهێنانی پێچکە سازکراون. ئێستا ئەو پارچە گڵێنانە لە مۆزەخانەی پیت ڕیڤەری ئۆکسفۆردن.

٥. چەند پارچەیەکی لە پاشماوەی بەردبووەکان لە شاخە کلسییەکانی خوارووی ڕۆژاوای چیای برادۆست دۆزراونەتەوە، بەگشتی لە پاشماوەی گیانداری هیپوڕایت- Hippurites پێکهاتبوون، ئێستا لە کۆلێژی زەویناسیی زانکۆی ئۆکسفۆردن.

٦. یەکێک لە ئامانجەکانی گەشتەکە گەڕان بەدوای دۆزینەوەی چەند دراوێکی ئاسنی سەردەمی کۆنی فارس و پێش ئاینی ئیسلام بوو، بۆ مۆزەخانەی ئەشمۆلیانی ئۆکسفۆرد. ئەندامانی گەشتەکە لە بەدەستهێنانی ئەو پارچە دراوانە سەرکەوتوو نەبوون، ئەگەرچی لە ساتەوەختی ڕۆیشتنمان لە عێراق، موتەسەڕیفی هەولێر چەند پارچە دراوێکی ئاسنی لە کۆکراوە تایبەتییەکانی خۆی پێ داین.

**سەرچاوە:**

Galloway, J. (1958). A Kurdish Village of North-East Iraq. The Geographical Journal, 124(3), 361-366. doi:10.2307/1790787

٤



## لەئەرشیفەوە

# لەبارەی (کاتب) و (خاکی)

## چەند زانیاریی نوێ لە ئەرشیڤی عوسمانیدا




**پ.ی.د.هێمن عومەر خۆشناو**

لەدایکبووی ١٩٨٣، دکتۆرا لە ئەدەبی کوردی، خاوەنی ژمارەیەك کتێبی چاپکراو و چەندین وتار و توێژینەوەی زانستی بڵاوکراوەیە.

یەکێ لە ڕێگەکانی دەستگەیشتن بە مێژووی ژیانی شاعیر و زانایانمان، وێڕای ئەرشیڤە دەوڵەمەندەکەی عوسمانی، هەموو ئەو کەشکۆڵ، مەجمووعەی شیعر، قافیلەی شیعر، گوڵشەنی شوعەرا، تەشریفاتی شوعەرا، مەشاهیری شوعەرا، تەزکیرەی شوعەرا و تەزکیرەی عولەما و ئودەبایانەی سەردەمی عوسمانییە، کە هەندێکیان هەر ئەوسا چاپکراون و هەندێکی دیکەشیان تائێستا بەدەستخەت ماونەتەوە و زانیاریی باشیان لەبارەی شاعیران تێدایە. لە سۆنگەی پێویستیبوونی ئەو مژارە بۆ مێژووی زانا و کەسایەتی و شاعیرانمان، ماوەیەکە کەڵکەڵەی ئەو بابەتەم کەوتۆتە کەللە و خەریکی پەیداکردنی ئەو تەزکیرانەم کە بە تورکیی عوسمانی نووسراونەتەوە و هەندێکیان لە پاڵ نەتەوەکانی دیکەی بندەستی عوسمانی، شاعیر و زانای کوردیشیان تێدایە، کە هەندێ لەو زانا و شاعیرانە تائێستا باس نەکراون و هەندێکیشیان زانیاری زیاتریان تێدایە و ئەگەر بێت و هەموویان کۆ بکەینەوە، بەشێک لە ژیانی شاعیر و زانایانی کوردمان ڕوونتر دەبنەوە و لە دواجاریشدا بناغەی مێژووی ئەدەبی کوردیمان پتەوتر دەکەن.

ساڵی ٢٠٠٧ مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداغی خەمخۆری دەستخەت و کەلەپووری زانایانمان، دیوانی کاتبی لە سەفەری حەج و عومرە لە حیجاز دۆزییەوە و ساڵێک دواتر دیوانەکەی چاپ کرد. مامۆستا لە پێشەکیی دیوانەکەدا زانیاریی باش سەبارەت بە کاتب دەخاتە ڕوو و چەند پرسیاریش سەبارەت بە ژیانەکەی بەبێ وەڵام بەجێ دەهێڵێ و ڕایدەگەیەنێ کە (من وای بۆ دەچم کنە و پشکنینی ڕۆژانی داهاتووی دڵسۆزانی مێژووی کورد و زانایانی کورد پەردە لەسەر گەلێ لاپەڕە لادەدەن و گەلێ پەردەی نهێنیی هەڵدەدەنەوە) (١).

لەنێو ئەو زانیارییانەی کە لە پێشەکیی دیوانەکەدا خراونەتەڕوو، پەیوەندیی کاتبی شاعیرە بە عارف حیکمەت (١٧٨٦-١٨٥٩)ی شێخولئیسلامی عوسمانی، بەوهۆیەوە مەزەندەی زۆرم کرد کە دەستگەیشتن بە بەرهەمەکانی عارف حیکمەت ڕەنگە زانیاریی زیاتر سەبارەت بە (کاتب) بەدەستبێنین. بۆیە لەنێو ئەو بەرهەمانەی عارف حیکمەت کتێبێک هەبوو بەناوی (تذكرة الشعراء)، دوای پەیداکردنی ئەم کتێبە، وەک یەکێک لەو کتێبانەی کە لە سەردەمی عوسمانییەکاندا جێگەی کتێبی ئێستای مێژووی ئەدەبی گرتبوویەوە و لەنێو مێژووی نووسراوی سەردەمی عوسمانیشدا چەند تەزکیرەیەک دەبینرێن و هەریەک لەوانە چمکێک لە ژیان و نموونەی شیعری شاعیرانی خستۆتە ڕوو، تەنانەت کەسایەتییەکی وەک ئەمین فەیزی بەگ (١٨٦٠-١٩٢٨)ی کوردیش هەر لە شێوەی تەزکیرەی شوعەرا کتێبی «ئەنجومەنی ئەدیبانی کورد»ی نووسیوە.

ئەم کتێبەی عارف حیکمەت ٢٠٣ شاعیری تێدا باسکراوە، کە لە نێوان ساڵانی ١٥٩٢-١٨٣٧ ژیاون و چەند شاعیرێکی کوردیشی تێدایە. هەر لەنێو لیستی ناوی کتێبەکانی

عارف حیکمەتدا کتێبێک بەناوی (مجموعة التراجم) هەبوو، گومانی ئەوەم کرد لەوێشدا باسی کاتب کرابێ، دوای هەوڵێکی زۆر کتێبەکەم پەیدا کرد، بەڵام بەداخەوە کورتە ژیانی (کاتب)ی تێدا نەبوو. لە تەزکیرەی شوعەراکەی عارف حیکمەت لە بەشی پیتی کافدا یەکەم شاعیر کە باسی لێوە کرابێ، سلێمان ئەفەندی ناسراو بە (کاتب)ە. کە زۆر بە کورتیی بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

کاتب، سلێمان ئەفەندی کوڕی ڕۆستەم ئاغا کوڕی مەحموود ئاغایە، لە مونتەسیبانی عەبدولڕەحمان پاشای والیی سلێمانییە. دەوروبەری ساڵی ١٢١٧ی کۆچی لەدایکبووە. لە تەمەنی چوار پێنج ساڵیدا باوکی کۆچی دوایی دەکات و هەتیو دەبێ، دوای کۆچی باوکی، لەگەڵ برا و دایکی و خاڵۆوانی دەچنە سنە. پێنج شەش ساڵێک لەوێ دەمێننەوە و دواتر دەگەڕێنەوە شاری سلێمانی. لەوێ فارسی و نووسین و شیعر فێردەبێت. والیی ناوبراو کاتب بە گونجاو دەزانێ وەک نووسەری فارسی و هەر لەوێش زانستەکان تەواو دەکات(٢).

**ئەم زانیارییانەی سەرەوە، ئەگەرچی کەمن، بەڵام زۆر لایەنی ژیانی نەزانراوی ئەو شاعیرە ڕوون دەکەنەوە. لەوانە:**

١. تا ئێستا تەنیا دەزانرا کە ناوی سلێمانە، بێ ئەوەی ناوی باوک و باپیری بزانرێ.

٢. تەنیا دەگوترا ساڵی ١٢٦٦ی کۆچی بەرامبەر ١٨٥٠ی میلادی، ناوبراو شاعیر بووە. بێ ئەوەی ساڵی لەدایکبوونەکەی بزانرێ. لەم زانیارییەی عارف حیکمەتدا ساڵی لەدایکبوونەکەی دەوروبەری ١٢١٧ی کۆچی واتە ١٨٠٢ی میلادییە.

٣. بەم زانیارییانەی سەرەوە، گومان دەکەوێتە سەر بۆچوونی مامۆستا حیرەتی سەججادی لە کتێبی (شاعران کرد پارسی گویی)ی کە مامۆستا شێخ عەلی قەرەداغیش لە پێشەکیی دیوانی کاتبدا هێناویەتییەوە، چونکە ئەو پێیوایە کاتب پارچە شیعرێکی بۆ کۆچی دوایی تاهیر بەگی جاف نووسیوە کە بە حیسابی ئەبجەدی دەکاتە ساڵی ١٣٣٧ی کۆچی. واتە لەو کاتەدا کاتب تەمەنی ١٢٠ ساڵ بووە، ئەمەش زۆر ئاسایی نییە کە ئەو تەمەنەی هەبووبێ و لەو تەمەنەدا شیعری نووسیبێ.

ئومێد هەیە کە بە شەنوکەوکردنی هەموو بەرهەمەکانی عارف حیکمەت و تەزکیرەکانی سەردەمی عوسمانی، زانیاریی دیکە لەوبارەوە دەستبکەون و بەشێک لە ناڕوونیی ژیانی ئەم شاعیرەمان ڕوونتر بکەنەوە.

**مەلا محەمەدی خاکی**

لەبارەی زانا و شاعیر مەلا محەمەدی خاکی، لە ساڵانی ١٩٧٨-١٩٨٠ شێخ محەمەدی خاڵ بەشێک لە شیعرەکانی مەلا محەمەدی خاکی لە بەرگی شەشەم و هەشتەمی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد بڵاوکردەوە و پاشان لە دوو توێی کتێبێکیشدا چاپی کرد، کە

تێیدا وێڕای کورتەیەک لە ژیانی ناوبراو، بەشێک لە شیعرەکانیشی بڵاوکردۆتەوە. شێخ محەمەدی خاڵ لە کتێبەکەیدا مەلا محەمەدی خاکی بە خەڵکی گوندی ئەحمەدبرِندە زانیوە و ساڵی لەدایکبوون و مردنیشی بە (١٢٥٥- ١٣٢٦)ی کۆچی داناوە، کە ساڵی مردنەکە دەکاتە بەرامبەر ساڵی ١٩٠٨ی میلادی.

سەبارەت بە ژیانەکەی، شێخ محەمەدی خاڵ دەنووسێ: لە حەوت ساڵیدا دەستیکردووە بە خوێندن تا قورئان و چەند کتێبێکی فارسی و سەرەتایی خوێندووە، ئینجا هاتووەتە سلێمانی لای مەلا محەمەدی مەحوی و چەند مەلایەکی تر خوێندوویەتی، لە پاشاندا چووە بۆ سنە خوێندنی تەواو کردووە. لەدواییدا گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی. وا دەرئەکەوێ کە مزگەوتێکی دەست نەکەوتووە تا بە ئیمام یا بە مودەڕیس لەسەری دانیشێ. لەبەرئەوە هەر لە ماڵی خۆیدا بووە. خانووشی نەبووە، بەڵکو هەر ماوەی لە ماڵێکدا بووە بە کرێ. ئینجا بۆئەوەی بژیی، قوتابیی ڕاگرتووە و دەرسی فارسی و کتێبی سەرەتایی پێ وتوون، وەک مەلا مەحموودی بێخود و شێخ سەلام و مەلا محێدینی خواجە ئەفەندی و مەلا حەمەسەعیدی کوڕی حاجی مەلا ئەحمەدی دێلێژەیی و مەلا خالیدی مەحوی و حاجی مەلا عارفی مستۆ و گەلێکی تر. زۆرترینی قوتابییەکانی دواتر بوون بە شاعیر(٣).

دوای گەڕانمان لەنێو ئەرشیڤی عوسمانیدا، تەنها دوو بەڵگەمان سەبارەت بە مەلا محەمەد خاکی دۆزینەوە، کە بریتین لە:

یەکەم: لە بەڵگەنامەیەکدا کە مێژووی ١٣٣١/٤/١١ی کۆچی بەسەرەوەیە، کە دەکاتە بەرامبەر ١٩١٣/٣/٢٠ی میلادی. وەزارەتی ئەوقافی هومایۆن نووسراوێک بۆ وەزارەتی مەعاریف دەکات، تێیدا هاتووە کە لە سنجاقی سلێمانی، لە گوندی کۆستەی عولیای سەر بە سەرچنار مەلا محەمەد خاکی ئەفەندی وێڕای ئەوەی ئیمامەتی بۆ مزگەوتەکە دەکات، لەهەمانکاتیشدا مامۆستای مەکتەبیشە، بۆیە لە بەرامبەر ئەو خزمەتەی دەیکات بڕی ١٠٠ قرووشی بۆ ببڕنەوە. نووسراوەکەش بە ئیمزای ڕاوێژکاری وەکیلی گشتیی وەزارەتی ئەوقافە(٤).

دووەم: بەڵگەنامەیەکی تری وەزارەتی مەعاریف، لە شێوەی تەلەگرافنامەیە و تێیدا بە مێژووی ١٣٣١/٤/١٦ی کۆچی نووسراوی بۆ بەڕێوەبەرایەتی مەعاریفی ویلایەتی موسڵ کردووە و باسی ئەوەی کردووە کە لە گوندی کۆستەی عولیا لە سەرچناری سلێمانی، مەلا محەمەد خاکی بڕی ١٠٠ قرووشی بۆ تەرخانکراوە و تکایە فەرمانەکە جێبەجێ بکەن(٥).

ئەگەر ئەم مەلا محەمەد خاکییەی کە لە بەڵگەنامەکاندا ناوی هاتووە، هەمان ئەو مەلا محەمەد خاکییە بێ کە شێخ محەمەدی خاڵ باسی دەکات، ئەوا خاڵی لێکنزیکی هەردوو خاکییەکە ئەمانەن:

یەکەم: شێخ محەمەدی خاڵ باسی ئەوە دەکات کە مەلا محەمەدی خاکی خەریکی دەرسدانەوە بووە و «بۆئەوەی بژیی، قوتابیی ڕاگرتووە و دەرسی فارسی و کتێبی سەرەتایی پێ وتوون.»(٦) لە بەڵگەنامەکەشدا ئەوە پشت ڕاست دەکاتەوە کە وێڕای ئەوەی زانای ئاینییە، لەهەمانکاتدا مامۆستای مەکتەبە. بۆیە لەگینە کە مەبەست لە مەکتەبەکە دەرسدانەوەکەی بێ بە قوتابییەکانی.

دووەم: تا ئێستا ئەوەی زانرا بێ لەناو شاری سلێمانی و ئەو گوندانەی کە نزیکی سلێمانین وەک گوندەکانی سەرچنار، لە مەلا محەمەدی خاکیی شاعیر هیچ محەمەد خاکیی تر لەو شارە بەو ناوە نەبووە.

**زانیارییە سەرنجڕاکێشەکانی نێو بەڵگەنامەکان خۆیان لە چەند خاڵێکدا دەبیننەوە، لەوانە:**

یەک: ساڵی نووسینی بەڵگەنامەکە بەرامبەر ساڵی ١٩١٣ی میلادییە، لەکاتێکدا ئەو ساڵەی شێخ محەمەدی خاڵ بۆ مردنی خاکیی دایناوە ساڵی ١٩٠٨ی میلادییە. مامۆستای خاڵ هیچ بەڵگەیەک بۆ ساڵی مردنەکەی ناهێنێتەوە و تەنانەت هەڵوەستەیەک و وردەکارییەکیش لەو بارەوە باس ناکات، بۆیە دەشێ ساڵی مردنەکەی جێی گومان بێ.

دوو: لە بەڵگەنامەکەدا دەردەکەوێ کە ناوبراو بە ڕەسمیی مەلای مزگەوت بووە، بۆیە ئەوقاف پشتگیریی دەکات و پێدەچێ مەکتەبەکەی کە دەرسی تێدا گوتووەتەوە ئەگەر ڕەسمیش نەبووبێ، بەڵام بە کردەیی ناوبراو مودەڕیس بووە، لەبەرئەوە ئەوقاف نووسراو بۆ وەزارەتی مەعاریف/ پەروەردە دەکات و داوای یارمەتیدانی ناوبراوی لێ دەکات و دواتریش وەزارەتی مەعاریف بڕی سەد قڕووشی بۆ تەرخان دەکات.

سێ: ناوی گوندی کۆستەی عولیا لە بەڵگەنامەکەدا هاتووە، وادیارە مەلا محەمەدی خاکی لەوێ هەم مەلا و هەم مودەڕیس بووە. ئەمەش بۆ مێژووی پەروەردە و خوێندن لە کوردستان بەگشتی و ئەو گوندە بەتایبەتی گرنگیی خۆی هەیە.

**سەرچاوە و پەراوێز:**


١. دیوانی کاتب، دۆزینەوە و پێشکەشکردنی محەمەد عەلی قەرەداغی، بڵاوکراوەی ئاراس، ٢٠٠٨، ل ١٠.

٢. دەستخەتی تذکرة الشعراء ی عارف حیکمەت، پارێزراو لە کتێبخانەی سلیمانیة، ئەستەنبوڵ.

٣- مەلا محەمەدی خاکی، شێخ محەمەدی خاڵ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٨، ل٩.

MF.İBT. 418 - 55 (4)

MF.İBT 419 – 93 (5)

٦. مەلا محەمەدی خاکی، سەرچاوە و لاپەڕەی پێشوو.

# ڕەگەزەکانی پەیڤین لە دەقە پیرۆزەکاندا (قورئان وەک نموونە)



**د. کامەران محەمەد**

ساڵی ١٩٧٦ لە سلێمانی لەدایکبووە. هەڵگری بڕوانامەی دکتۆرایە لە فەلسەفەی مێژوو. هەشت کتێبی چاپکراوی هەیە. چەندین توێژینەوەی بڵاوکردووەتەوە.

بۆ ئەوەی پەیڤین لە زیندویتی خۆیدا بژیی و پرۆسەیەکی بەرهەمدار بێت لە ژیاندا و ژیان بەرەو باڵابوون بەرێت و نەزۆک نەبێت لە شێوە و ناوەرۆکدا و جیاوازیی و ماوە دووروردرێژەکانی نێوان مرۆڤەکان فراوانتر نەکات. خودا لە میانەی ئایین و پەیامبەرەکەیەوە ویستوویەتی کەشێکی ئەوتۆ برەخسێنێت و هێڵە سەرەکیی و گشتییەکانی ئەو پەیڤینە دیاری بکات. تا مرۆڤەکان لە مرۆڤایەتیبوونی خۆیاندا بژین و کێشە لاوەکیی و ئاکارە دزێوەکان باڵ نەکێشێت بەسەر ژیاندا و سەرئەنجام مرۆڤ و مرۆڤایەتی بەرەو هەڵدێر و لەناوچوون نەچێت.

گرنگترین ئەو ڕەگەزانەی بۆ پەیڤین پێویستن و کرداری پەیڤینی لەسەر دەوەستێت لە ئاییني ئیسلامدا بریتین لە:

١. کەسێتی پەیڤینکاران. ٢. پسپۆڕیی و شارەزابوون. ٣. بابەتی پەیڤین. ٤. کەشێکی لەبار و گونجاو. ٥. شێوازی پەیڤین

لێرەدا و لەچوارچێوەی جیهانبینی قورئاندا هەوڵدەدەین بە وردی تیشک بخەینەسەر هەریەکێک لەو ڕەگەزانە.

**١. پەیڤینکاران**

هەموو پەیڤینێک لە نێوان دوو تاک، کۆمەڵ، ئایدیۆلۆژیا، ئایینزا، وڵات، ژیار،... تاد ئەنجام دەرێت. بۆئەوەی پەیڤین بگاتە قایلبوونە هاوبەش و ئەنجامە بەرهەمدار و چاوەڕوانکراوەکان، ئەوا دەبێت هەریەک لەو دوو لایەنە پەیڤینکارە خۆیان بە کۆمەڵێک خەسڵەتی جوان برازێننەوە. لەو تایبەتمەندییانەش کە پێویستە لە کەسێتی هەریەکێکیاندا بوونی هەبێت، بریتین لە بوونی گیانی پەیڤینکردن و بزوتنەوەی پەیڤین تێیاندا، واتە لە ناخەوە هەریەکەیان وەک کانی بۆ پەیڤینکردن هەڵبقوڵێن و عەوداڵی ڕاستیی بن، هاوکات ویستی گەیشتن بە ئەنجامە ئیجابییەکانیان هەبێت. بەبێ بوونی ئەو تایبەتمەندییەش ناتوانرێت پەیڤینێکی دروست و بەرهەمدار ئەنجام بدرێت. واتە گەر ئەم تایبەتمەندییە نەبێت ئەوا گرێ دەروونییە پێشینەییەکان تەحەکوم بە پەیڤینەکەوە دەکات و جگە لە بەفیرۆدانی کات و ئاڵۆزکردنی کاروبارەکان ئەنجامێکی تری لێناکەوێتەوە. ئەوەش لە میانەی وروژاندنی هەندێ برگە کە واقیع تێکدەدات و هەستی خراپ بەدیدەهێنێت. بەوەش ڕەگەزەکانی نائارامیی و هەڵچوون لە کەشی ناوچەکەدا بڵاودەبێتەوە.

هەروەها ئەو کەسەی دەچێتە کرداری پەیڤینەوە، دەبێت کەشی ناوەوەی خۆی ئامادەکردبێت، بۆ قایلبوون بەو ئەنجامە یەکلاکەرەوانەی کە پێی دەگات. ئەگەر ئەو ئامادەییەی نەبێت ئەوا هەڵوێستەکە بۆ جەدەلێکی نەزۆک دەگۆڕێت، کە جگە لە دەرخستنی بەهێزی گوفتار و موزایەدە جەدەلییەکان شتێکی تری لێناوێت، بەشێوەیەک نەدەچێتە

پێشەوە و نە پاشکەشەش دەکات.

هەروەکو قورئانی پیرۆز جەختی لەسەر ئەم لایەنە کردووەتەوە و دەربارەی ئەو کەسانەی کە نایانەوێت لەسەر بنەڕەتێکی زانستیی و بابەتی باوەڕبەخۆبوون دەفەرموێت: (وَمِنْهُمْ مَنْ يَسْتَمِعُ إِلَيْكَ وَجَعَلْنَا عَلَى قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَنْ يَفْقَهُوهُ وَفِي آذَانِهِمْ وَقْرًا وَإِنْ يَرَوْا كُلَّ آيَةٍ لَا يُؤْمِنُوا بِهَا حَتَّى إِذَا جَاءُوكَ يُجَادِلُونَكَ يَقُولُ الَّذِينَ كَفَرُوا إِنْ هَذَا إِلَّا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ. وَهُمْ يَنْهَوْنَ عَنْهُ وَيَنْأَوْنَ عَنْهُ وَإِنْ يُهْلِكُونَ إِلَّا أَنْفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُون) (الأنعام : ٢٥ ، ٢٦). واتە هەندێکش گوێت بۆ دەگرن (لەکاتی خوێندنی قورئاندا، بەڵام چونکە مەبەستیان نیە شوێن حەقیقەت بکەون، ئێمە پەردەمان هێنا بەسەر دڵیاندا لە تێگەیشتنیان بۆ قورئانەکە و گوێمان سەنگین و گران کردوون، ئەگەر هەرچی نیشانە و بەڵگەیەکیش هەبێت ببینن ئەوان بڕوای پێناکەن، هەتا کاتێکیش کە دێن بۆ لات دەیکەنە موجادەلە و دەمەدەمێ و دەڵێن سەرئەنجام ئەم قورئانە هیچ نییە جگە لە داستانی پێشینان نەبێت!! ئەوان ناهێڵن کەس گوێ بۆ قورئان بگرێت و خۆشیانی لێ دوور دەخەنەوە، جا بەو کارەیان جگە لە خودی خۆیان کەس لەناو نابەن و هەستیشی پێناکەن.

پەیامبەریش (د.خ) وەک پەیامهێنی ئیسلام و لە میانەی تەعالیمەکانی قورئانی پیرۆزەوە ئەو مەرجەی جێبەجێکردووە و هەوڵیشیداوە بۆ ئەو کەسانەی فەراهەمبکات کە لەگەڵیاندا گفتوگۆی دەکرد. سەرباری ئەوەی چەندین جار جەختی لەسەر لایەنی مرۆییبوونی خۆی دەکردەوە، کە ئەویش مرۆڤێکی وەک ئەوانە و لە تەکوینی تایبەتیی خۆیدا هیچ هێزێکی نائاسایی نییە و ناتوانێت موعجیزە بکات، کە پێشنیازیان بۆ دەکرد و غەیب نازانێت و هەموو کاروبارەکە ئەوەیە نیگایەک لە خواوە بۆ مرۆڤایەتی دابەزیوە، ڕۆڵی ئەویش لەو نیگایەدا بریتییە لە ڕۆڵی مرۆڤێک کە دەیەوێت بە هەموو ئامرازێکی قاییلکەر بە خەڵکی ڕابگەیەنێت، بەبێ ئەوەی فەرمانی سەپاندنی بەسەریاندا هەبێت و هیدایەتیان بدات، بەوپێیەی خاوەن وزەیەکی ئەفسوناویی و موعجیزە ئاسابێت، کە باوەڕ بهێنن بەوەی بانگیان دەکات بۆی و ئەوان نەتوانن بەرگری بکەن و دەسەوسان بن یان نەتوانن بە باش یان خراپ بیری لێبکەنەوە، بەڵکو ئازادیی ئەوان بۆ خۆیان ماوەتەوە، ئەگەر وەڵامیان دایەوە و قایلبوون بەوەی کە بانگیان دەکات بۆی، ئەوا دەگاتە مەبەستەکەی لە گەیاندنی پەیامەکەیدا، بەڵام ئەگەر وەڵامیان نەدایەوە ئەوا ئەوەی بەسە کە هەستاوە بە ڕاگەیاندنی پەیامی پەروەردگار و ئەرکی سەرشانی خۆی جێبەجێکردووە.

پەروەردگار دەفەرموێت: (قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَى إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ فَمَن كَانَ يَرْجُو لِقَاء رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلا صَالِحًا وَلا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا) (الكهف ١١٠) واتە: (ئەی پەیامبەر (د.خ) پێیان بڵێ: بەڕاستی من تەنها ئادەمیزادێکم وەک ئێوە، بەڵام ئەوەندە هەیە من وەحی و نیگام بۆ دێت (ئەم ڕاستییەتان تێبگەیەنم) کە بێگومان خوای ئێوە خوایەکی تاک و تەنهایە. جا

ئەوەی دەیەوێت بە دیداری پەروەردگار شاد بێت بە خۆشنودییەوە با کار و کردەوەی چاک و دروست ئەنجامبدات و بەهیچ شێوەیەک لە پەرستنیدا هیچ کەسێک نەکاتە هاوەڵ و شەریک بۆی). هەروەها دەفەرموێت: **(قُلْ لَا أَمْلِكُ لِنَفْسِي نَفْعًا وَلَا ضَرًّا إِلَّا مَا شَاءَ اللَّهُ وَلَوْ كُنْتُ أَعْلَمُ الْغَيْبَ لَاسْتَكْثَرْتُ مِنَ الْخَيْرِ وَمَا مَسَّنِيَ السُّوءُ إِنْ أَنَا إِلَّا نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ)**. (الاعراف ١٨٨). واتە: (ئەی محەمەد (د.خ) پێیان بڵێ: کە من ناتوانم هیچ قازانج یان زیانێک بە خۆم بگەیەنم مەگەر ویستی خودای لەسەر نەبێت، خۆ ئەگەر غەیب و شاراوەکانم بزانیبایە ئەوا چاکەی زۆرم بۆ خۆم کۆدەکردەوە و هیچ ناخۆشییەکیشم تووش نەدەبوو، من هیچ شتێک نیم تەنها ترسێنەرم بۆ (یاخییەکان) و موژدەدەریشم بۆ کەسانێک کە باوەڕ دەهێنن).

ئەوە وێنەیەکی زیندووە بۆ ئەوانەی گوێ بۆ بانگەواز دەگرن، بەڵام دڵ و هۆشیان داخستووە، ئەوەش کە بۆیان باس دەکرێت گوێیەکانیان نایبیستێت، بۆیە دڵەکانیان ناکەنەوە تا بیر بکەنەوە و گفتوگۆ بکەن، بۆئەوەی لەسەر بنەڕەتی بەڵگەهێنانەوە قایل ببن یان ڕەتیبکەنەوە، بەڵام ئەوان لە هەڵوێستی خۆیان بەردەوامبوون و ڕێ بە خۆیان و کەسانی دیکە نادەن دەربارەی هەر ئەزمونێکی هزریی یاخود پرۆسەیەکی پەیڤین سەبارەت بە هەڵەیی یاخود ڕاستیی هەڵوێستەکە دیاریی بکەن. بۆیە لێرەدا ئەنجامێک بەدەستنایەت، لەبەرئەوەی ئەو کەسانە هەڵوێستی خۆیان لەسەر کەسێتی و خۆبەگەورەزانین دیاریکردووە، نەک لەسەر بنەڕەتی هزر و باوەڕ. بەمشێوەیە داوادەکات لەگەڵ ئەو ئەزمونەدا نەڕوات، کە نەزۆکییەکەی چەسپاوە، بەڵکو هەوڵبدات بچێتە بوارێکی دیکەوە. کە بیر و ژیارییان پێوەری ڕەتکردنەوە یان وەرگرتنی هزر و بیروباوەڕ بێت.

لێرەدا پێویستە ئاگاداری ئەوە بین، کە زۆرجار هەڵە هزریی و لادانە بیروباوەڕییەکان کوفر بۆ قایلبوونێکی خودیی لەژێر ناونیشانی زانست یاخود دژی دەگۆڕێت. بەڵام بێئاگایی لە ڕەگەزەکانی تر لە هزری باوەڕ کە دەشێت چەندەها ئاسۆی نوێ بۆ ژیری بکاتەوە، کە لە مەعریفەی خواوە سەرچاوەی گرتبێت، بەڵام ئەو بێئاگاییە و تەنها لە یەک گۆشەوە پەیبردن بەسەر چاوگ و شوێنەکانی تری زانیارییەوە ئاسۆکانی بیرکردنەوەی مرۆڤ سنوودار و بەرتەسک دەکاتەوە.

لەم سنووردارییەدا نمونەیەک دەژی، کە لە دۆخێکی ئینکاریکرن و سوربوون لەسەر لادان و لەسەر پێکهاتە ناوخۆییەکەوە دەردەچێت و ئاڕاستەی دەکات. جا ئەوە بەرەوڕووی ژیان دەبێتەوە بە عەقڵیەتێکی بەرژەوەندیی، هەڵپەیی و ئارەزووە خودییەکانەوە. بەوپێیەی ئەوانە هێڵەکانی کاروانەکەی لە ڕاستیی و چەوتی بۆ دیاری دەکەن، واتە لێرەدا پێوەرەکان ژیریی و بیرکردنەوەیەکی ئەبستراکت نین، بەڵکو پاڵنەر و

حەزە دەروونییەکان و پێشینە کۆمەڵایەتییەکان ڕاستیی و ناڕاستیی هەڵبژاردن و ڕەوتی ژیانیان بۆ دیاری دەکەن. بۆیە دەبێت پەیڤینکاران زۆر بە وردی هەوڵی ڕازاندنەوەی خۆیان بەو ئاکارە جوانانە بدەن، کە ڕێگە خۆش دەکات بۆ گەیشتن بە ڕاستیی و چارەسەرە هاوبەشەکان و خۆشیان لەو ئاکارانە دووربخەنەوە کە پەیڤین دەپوکێننەوە و گیانی نەیارێتی لە ناخیاندا دەچێنێت و نەزۆکی بەرهەم دەهێنێت.

**٢. پسپۆڕیی و شارەزابوون**

ڕەگەزێکی سەرەکی تری پەیڤین لە ئیسلامدا بریتییە لە پێگەیشتوویی، ڕۆشنبیریی و شارەزابوون لەو بابەتەی کە وتووێژی لەسەر دەکرێت. بۆیە دەبێت پەیڤینکاران لەو بابەتەی کە دەیانەوێت پەیڤینی لەبارەوە بکەن، شارەزاییان دەربارەی هەموو لایەنەکانی هەبێت، بۆئەوەی پەیڤین لە هزرەوە دەربچێت و بیانگەیەنێتە ئەنجامی یەکلاکەرەوە و لەسەر وشەی هێمن و دانایی لە شێوازدا و قوڵیی لە هزردا کۆمەکیان بکات. ئەمەش ڕێگەی زانا هۆشیارەکانە لە هەمبەر زانست و پەیامەکەی. بەڵام ئەگەر پەیڤینکاران شارەزاییەکی ئەوتۆیان دەربارەی ئەو بابەتە نەبوو، کە دەیانەوێت لەبارەیەوە بدوێن، ئەوا هەڵوێستەکە لایان دەگۆڕێت بۆ چەلەحانێ و وتەی نەشیاو و تۆمەتی بەتاڵ، کە لاوازەکان هەوڵی شاردنەوەی لاوازییەکەیانی پێدەدەن. بەوەش پەیڤین ناگاتە ئەنجامێکی دروست، بەڵکو دەبێتە هۆی زیاتر ئاڵۆزبوون و ناکۆکیی و ڕۆچوون لە ناڕەوایەتیدا.

هەربۆیە گرنگە هەڵگرانی هەر ئایدیۆلۆژیایەک کەسێتییە لێهاتووەکان لە بواری هزر و شێوازی تێڕوانینی قوڵیی کراوە بەسەر واقیعدا هەڵبژێرن. هەروەک پەروەردگار دەفەرموێت: (هَا أَنْتُمْ هَٰؤُلَاءِ حَاجَجْتُمْ فِيمَا لَكُمْ بِهِ عِلْمٌ فَلِمَ تُحَاجُّونَ فِيمَا لَيْسَ لَكُمْ بِهِ عِلْمٌ ۚ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنْتُمْ لَا تَعْلَمُونَ)، (ال عمران ٦٦).واتە: (ئەوە ئێوەن موجادەلە و باس و خواستان لەسەر ئەو شتانە دەکرد، کە زانیاریتان دەربارەی هەبوو، کەواتە بۆچی دەم لەو شتانەش دەدەن کە هیچ زانیاریتان دەربارەی نییە).

واتە ئەی خاوەن کتێبەکان موجادەلەتان لەسەر ئەو شتانە دەکرد، کە زانیاریتان دەربارەی هەبوو لە میانەی ئەوەی لە تەورات یان ئینجیلدا خوێندوتانەتەوە و ئەوەش مافی خۆتانە، وەک چۆن مافی هەموو کەسێکە پەیوەندارێتیی بۆ هەر هزرێک هەبێت و زانیاریی دەربارەی هەبێت، کە لەگەڵ خەڵکیدا گفتوگۆی لەسەر بکات.

هەروەها پەروەردگار دەفەرموێت: (إِنَّ الَّذِينَ يُجَادِلُونَ فِي آيَاتِ اللَّهِ بِغَيْرِ سُلْطَانٍ أَتَاهُمْ ۙ إِنْ فِي صُدُورِهِمْ إِلَّا كِبْرٌ مَا هُمْ بِبَالِغِيهِ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ)، (الغافر ٥٦). واتە: بەڕاستی ئەوانەی کە موجادەلە دەکەن و بە ناشارەزایی لە ئایەتەکانی خوا دەدوێن، بێ ئەوەی بەڵگەیەکی بەهێزیان پێ بێت، ئەوانە تەنها لە سینەیاندا خۆبەزلزانییان هەیە و هیچکات ناگەنە ئەو

ئامانجەی کە هەیانە، کەواتە تۆ پەنا بە خودا بگرە، چونکە بەڕاستی ئەو زاتە بیسەر و بینایە.

یاخود دەفەرموێت: (بَلْ كَذَّبُوا بِمَا لَمْ يُحِيطُوا بِعِلْمِهِ وَلَمَّا يَأْتِهِمْ تَأْوِيلُهُ ۚ كَذَٰلِكَ كَذَّبَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ ۖ فَانْظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الظَّالِمِينَ)، (یونس ٣٩). واتە: بەڵکو سەرەڕای ئەو هەموو بەڵگانە ئەوانە بڕوایان بە قورئان نەکردووە کە هیچ شتێکیان نەزانیوە دەربارەی، هێشتا بۆیان نەهاتووە سەرئەنجامی ئەو بەڵێنانەی کە بەڵێنی پێدراون، هەر بەوشێوەیەی ئەوانەی پێش ئەمان بەرنامەی خوایان بە درۆ زانی و بڕوایان پێی نەبوو، دە تەماشا بکە و سەرنج بدە بزانە سەرئەنجامی ستەمکاران چۆن بووە. بەمشێوەیە لەم ئایەتانەوە ئەوە ڕوون دەبێتەوە، کە ئەوانەی دەچنە گۆڕەپانی پەیڤینەوە بێ چەکن، لەبەرئەوەی دارای زانست یاخود بەڵگە نین و شارەزاییەکی ئەوتۆیان دەربارەی ئەو بیروبۆچوونە نییە کە ڕەتیدەکەنەوە. بۆیە ئەمەش وای لە جەدەلەکەیان کردووە، کە کێشەیەکی (میزاج)ی یاخود گرێیەکی دەروونیی بێت کە ئاڕاستەیان دەکات. بۆیە هەندێکجار بەبێ بەڵگە بە درۆی دەخەنەوە! بەوشێوەیەش ڕێگە خۆش ناکات بۆ هەر ئەنجامێک لە بەرژەوەندیی مەعریفە و حەقیقەت بێت.

**دەبێت پەیڤینکاران لەو بابەتەی کە دەیانەوێت پەیڤینی لەبارەوە بکەن، شارەزاییان دەربارەی هەموو لایەنەکانی هەبێت، بۆئەوەی پەیڤین لە هزرەوە دەربچێت و بیانگەیەنێتە ئەنجامی یەکلاکەرەوە.**

ڕەنگە لە واقیعی ئەو ململانێیەی کە ئیسلام لەگەڵ بەرانبەرەکانیدا بەڕێوەی دەبات، زۆر نموونەی لەو شێوەیەمان بەرچاو بکەوێت، کە دەچنە بواری ململانێکەوە بەبێ ئەوەی سروشتی ئەو هزرە بزانن کە بەرگریی لێدەکەن یان هێرشی دەکەنەسەر. جا لەوانە بن کە بەناوی ئیسلامەوە قسەدەکەن یان لەوانەبن کە بە ناوی ئایدیۆلۆژیا جیاوازەکانەوە دەدوێن، کە شتێکی ئەوتۆ لە هزرەکانیان و هزری بەرامبەرەکانیان نازانن! جگە چەند چەمکێکی گشتیی نەبێت. بەمشێوەیە بەرامبەر زنجیرەی تەواوی هزرەکە بێئاگان. بۆیە ستەم لەو هزرە دەکەن، کاتێک هەندێکی لێدێنن و ئەوی دیکەی فەرامۆش دەکەن. واتە ڕەگەزە سەرەکییەکانی لەدەستدەدەن کە هێز و زیندوویێتی پێدەبەخشێت.

لێرەدا کاتێک هەڵگری هەر هزرێک لەگەڵ بەرامبەرێکی لاوازدا دەکەوێتە پەیڤین کە خۆشی شارەزاییەکی کەمی هەیە، بەڵام لەبەرئەوەی بەرامبەرەکەی لاوازترە، هەڵوێستی

ئەم بەهێزتر دەبێت، بۆیە زۆرجار ئەمە وایلێدەکات، لە دەروونیدا باوەڕبەخۆبوونێک بەدیبێت، ئەم باوەڕبەخۆبوونەش لەجیاتی ئەوەی هانیبدات بۆئەوەی زیاتر هەوڵی شارەزابوون و خۆهۆشیارکردنەوە بدات، سەبارەت بەو هزرەی کە خۆی بڕوای پێیەتی و هزرەکانی تری گۆڕەپانەکە، بەڵام ئەو حەزی پەیڤینکردن و جەدەلی تێدا تۆخ دەبێتەوە و نابەرپرسیارانە خۆی دەخاتە ناو هەموو ڕوبەڕووبوونەوەیەکەوە، تا لەکۆتاییدا ڕووبەڕووی کەسێکی شارەزا دەبێتەوە و هەرەسی پێدەهێنێت، ئەمەش تا ئاستێکی فراوان لەسەر خودی هزرەکە دەکەوێت. بۆیە دەبێت هەموو ئەو کەسانەی پەیڤین دەکەن، شارەزاییەکی قوڵیان لەسەر بیروباوەڕەکانی خۆیان و بەرامبەرەکانیان هەبێت، تا بتوانن لەڕێگەی پەیڤینەوە بگەنە ئەنجامی ڕاست و پاشانیش هیچیان ستەم لە بیروباوەڕەکەیان نەکەن. بەمشێوەیە شارەزابوون و بوونی زانست دەربارەی ئەو بابەتەی کە پەیڤینی لەسەر دەکرێت، بە ڕەگەزێکی سەرەکیی کرداری پەیڤین دادەنرێت.

### ٣. بابەتی پەیڤین

ئیسلام وەک چۆن جەخت لەسەر وروژاندنی پرس و پەیڤینی خود دەکات، لەسەر ئەو بنەڕەتەی کە ژێریی لوتکەی باوەڕهێنان بێت، سروشتیشە جەخت لەسەر پەیڤین لەگەڵ مرۆڤی تردا کە هەڵگری هزرێکی دژە بکات. ئەوەش ناوەڕۆکی بانگەوازی پەیامی پەیامبەران بووە، کە بۆ پەیڤینی تاک و کۆمەڵ خستوویانەتەڕوو، لەپێناو ئەوەی خەڵکیی بچنە گفتوگۆیەکی (جدی)ەوە سەبارەت بەو بیروباوەڕانەی کە دەیخەنەڕوو. کاتێک چیرۆکی پیغەمبەران لە قورئاندا دەخوێنینەوە، دەبینین ئەوان پەیڤینکار بوون. ئەوانەشی کە لە دژیان وەستان بێ بەڵگە بوون و توانای سەلماندنیان نەبوو. ئەوەش نیگای ئەوەدەکات، کە پرسی پەیڤین لە ئایین و کرانەوە بەسەر ئەوی تردا و ڕەتنەکردنەوەی لەلایەن بەرانبەرەکانەوە شتێکی نوێ نییە لە ئاییندا، بەڵکو لەگەڵ دەستپێکرنی ئاییندا دەستییپێکردووە. جا لە چەمکە ئیسلامییەکاندا (بابەتێکی دیاریکراو) بۆ پەیڤین نەخراوەتەڕوو و هەموو شتێک شایستەی پەیڤین لەسەرکردنە، لە پەیڤیندا پیرۆز و حەرامکراو بوونی نییە، تەنانەت لە بوونی خودا و کەسێتی پەیامبەریشدا.

ئێمە دەزانین قورئانی پیرۆز هەمان ئەو برگانەی باسکردووە کە لە کەسێتی و پەیامەکەی پەیامبەر محەمەد (د.خ)ی پێ تۆمەتبار کراوە، پاشان بەوپەڕی بابەتیی و (جدی)یێتییەوە چارەسەری کردووە، ئایا شێتە یان شێت نیە؟ جادوگەرە یان پەیامبەر؟ درۆزنە یان ڕاستگۆیە؟ قورئانەکەی مرۆییە یاخود خوداییە؟ **(وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُ بَشَرٌ ۗ لِسَانُ الَّذِي يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِيٌّ وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِيٌّ مُبِينٌ)**، (النحل ١٠٣). واتە: ئێمە بە ڕاستیی دەزانین ئەوان دەڵێن: ئەم قورئانە تەنها کەسێک فێری دەکات.

یاخود (وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ مَاذَا أَنْزَلَ رَبُّكُمْ ۙ قَالُوا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ)، (النحل ٢٤). واتە: خۆئەگەر بە (بێباوەڕان) بوترێت ئەوە پەروەردگارتان چی دابەزاندووە؟ ئەوا دەڵێن چیرۆک و داستانی کۆن و خەیاڵی پێشینان. هەروەها ڕەنگە ئاڵنگاریی گەورە کە قورئان هەوڵیداوە وەڵامی بداتەوە، گوتەی شێتێتی بێت (انه لمجنون)، جا با بڕوانین بزانین چۆن لەو بوارەدا ڕەوتی پەیقین بەڕێوەدەچێت. وەک قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: (قُلْ إِنَّمَا أَعِظُكُمْ بِوَاحِدَةٍ أَنْ تَقُومُوا لِلَّهِ مَثْنَىٰ وَفُرَادَىٰ ثُمَّ تَتَفَكَّرُوا مَا بِصَاحِبِكُمْ مِنْ جِنَّةٍ إِنْ هُوَ إِلَّا نَذِيرٌ لَكُمْ بَيْنَ يَدَيْ عَذَابٍ شَدِيدٍ)، (سبا ٤٦).

واتە: پێیان بڵێ بەڕاستی من هەریەک ئامۆژگاری ئێوە دەکەم، کە بۆ خوا و لەبەر خوا دوو قۆڵی یان بە تەنهایی، هەڵوێستە بکەن و پاشانیش بیربکەنەوە ئەم هاوەڵەی ئێوە محەمەد (د.خ) شێت نییە، بەڵکو تەنها ترسێنەری ئێوەیە و هیچی تر، پێش ئەوەی سزایەکی قورس ڕووبەڕووتان ببێتەوە. لێرەدا پرسیارە بنەڕەتییەکە ئەوەیە: بۆ خودا بە پەیامبەر دەڵێت، لەو کەشە جەنجاڵییە کە مرۆڤـ لەخۆی دادەبڕێت، خۆتان کەنارگیر بکەن و بگەڕێنەوە بۆ لای خۆتان (ناخ و دەروون). لەبەرئەوەی ژیریی کۆیی (العقل الجماعی) ئەگەر لێرەدا ژیرییەکی کۆ هەبێت! (پەراوێزی الاسلوب صفقه) ناهێڵێت مرۆڤ بیرکردنەوەیەکی بێلایەن و سەربەخۆی هەبێت. بۆیە دوو دوو یان بە تەنها بڕۆن، باش بیر لە وشە و هەڵسوکەوتەکانی بکەنەوە، دواتر دەبینن، کە ئەم هاوەڵەی ئێوە شێت نییە.

جارێکی دیکە جەخت لەسەر ئەوە دەکەینەوە کە لە پەیقیندا حەرامکراو نییە، قورئانی پیرۆز ئەو دەرگایەی بۆ ئاوەڵا کردووینەتەوە، تەنانەت لە کەسێتی پەیامبەر (د.خ)یشدا. جا ئەوەی کە ئەو تۆمەتانەی بە زیندوویی بۆ هێشتووینەتەوە تاکو ئەوەی دەربارەی دێت پەیقینی لەسەربکەین، وەک ئەوەی لە ڕابردوودا بەڕێوەی دەبرد، بۆیە هەموو بابەتەکان شیاوی پەیقینن. تەنانەت لە ئوسوڵە عەقیدەییە بنەڕەتییەکان کە باوەڕ و کوفری بەدوادا دێت، هەروەها دەربارەی ڕۆژی دوایی بۆ نموونە دەگەین بەم دوو ئایەتە: (وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِيَ خَلْقَهُ قَالَ مَنْ يُحْيِ الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ)، (یس ٧٨). واتە: (نموونەی بۆ ئێمە هێناوەتەوە و بەدیهاتنی خۆی لەبیرکردووە، دەبێ کێ ئەم ئێسکانە زیندوو بکاتەوە، لەکاتێکدا کە ڕزیو و پتروکاون؟).

### ٤. کەشێکی لەبار و گونجاو

ڕەنگە لە پێویستیترین کاروبارەکانی گەیشتنی پەیقین بە ئامانجەکەی، بوونی کەشێکی هێمن بێت، بۆ بیرکردنەوەی خودیی، کە تێیدا مرۆڤ دووربکەوێتەوە لەو کەشانەی کە هەڵچوون سیمایەکی دیاری بێت. بۆئەوەی لەو ساتانە لەگەڵ خۆیدا ڕابوەستێت، ڕابمێنێت و بیربکاتەوە. ئەو کەسەی کە پەیامدارە و هەڵگری هەر هزر و بۆچوونێکە و لە بزاڤی پەیقیندایە و دەیەوێت لەگەڵ بەرامبەرەکەیدا بگاتە ئامانج، دەبێت هەڵچوونە دەروونییەکان بۆ بیرکردنەوە عەقڵانیی و بابەتییەکان ملکەچ پێبکات، کە هەموو ڕەهەندەکانی واقیع

و جموجوڵەکانی خەڵکانی دەورووبەری بە هەند وەربگرێت. بۆئەوەی بەرامبەرەکەی تێبگات کەسی پەیڤینکار لە بازنەی هەڵچوونە خودییەکاندا ناجولێت، بەڵکو لە هێڵی ئەو پەیامەدا دەجولێت. بەبنەماکانی پەیامەکان پەیڤین دەکات، لەژێر کاریگەریی هەڵچونەکانیدا ناژی، بەڵکو لە بازنەی ژیریی و جوڵاو بە ئاڕاستەی ڕەگەزەکانی سەرکەوتن و واقیعی پەیامەکەدایە.

زۆرجار کێشەی پەیڤین لەوەدایە، کە پەیڤینکاران بزوتنەوەی بانگەواز و پەیامەکەیان دەخەنەژێر هەڵچوونە خودییەکانەوە، لەبەرئەوە دەبینین کاتێک لە بەرامبەر هێزە نەیارەکانیانەوە شکست دەهێنن، ئەوا دەڕوخێن و خۆیان بە سەرشۆڕ دێتەپێش چاو، ئەمەش وایان لێدەکات، پەیڤینەکە بە ئاڕاستەی نائاسایی و نابابەتی بگۆڕن و دەستدەکەن بە تۆمەتبارکردنی ناڕەوا و بەکارهێنانی وشەی نەشیاو بۆ بەرامبەرەکانیان و لە کۆتاییشدا دەبێتە مایەی دەمەقاڵێ و ململانێ و جەنگ. لێرەوە هەڵچوون بەهیچ شێوەیەک لە ئیسلامدا جێگای نابێتەوە و ئیسلام ئایینێک نییە دوور بێت لە بزووتنەوەی ژیریی و گیانی زانستەوە. بۆیە توندوتیژی ڕێگەی ئیسلام و پەیڕەوانی نییە، بەڵکو بابەتیبوون، عەقڵانییەت و پەیڤینکردن بە باشترین شێوە و جوانترین و هێمنترین کەش ئەو موفرەداتانەیە کە پەیڤینکاری ئیسلام لە دۆزە ڕۆشنبیرییەکاندا دەستی پێوەدەگرێت.

قورئانی پیرۆز وێنەی شێوازی ئەو پەیڤینەی پەیامبەر (د.خ)ی بۆ کێشاوین، کە لەگەڵ نەیارەکانی بیروباوەڕەکەیدا ئەنجامیدەدا. کاتێک بە تۆمەتی شێتێتی ڕووبەڕووی ببوونەوە! ئەو پێمان ڕادەگەیەنێت، ئەگەر ویستمان هزرێک وەربگرین یان ڕەتیبکەینەوە یان لەگەڵ هەڵوێستەکەدا بگونجێین یاخود لێی دووربکەوینەوە، ئەوا دەبێت لەو کەشە هەڵچوونییە دابڕێین. پەروەردگار دەفەرموێت:( **قُلْ إِنَّمَا أَعِظُكُمْ بِوَاحِدَةٍ أَنْ تَقُومُوا لِلَّهِ مَثْنَىٰ وَفُرَادَىٰ ثُمَّ تَتَفَكَّرُوا ۚ مَا بِصَاحِبِكُمْ مِنْ جِنَّةٍ ۚ إِنْ هُوَ إِلَّا نَذِيرٌ لَكُمْ بَيْنَ يَدَيْ عَذَابٍ شَدِيدٍ**) (سبا ٤٦)

بۆیە قورئانی پیرۆز تۆمەتی پەیامبەر (د.خ) بە شێتی دەگەڕێنێتەوە بۆ ئەو کەشە هەڵچوونییەی کە کۆبوونەوەیەکی نەیارانە لەلایەن نەیارەکانی ئەوکاتە پێکهاتبوو و وایلێکردوون شتێکیان پێ نەبێت تا بتوانن ڕاستیی و خراپی کێشەکانی پێهەڵسەنگێنن، بەڵکو هزرەکانیان بووەتە سەدایەک بۆ هزری کەسانی تر. هەربۆیە داوایان لێدەکات لەو کەشە هەڵچوونییە دابڕێن. دوو دوو یان بە تەنها لە هەڵوێستی هزر و ڕامانیاندا بیر و کەسێتی خۆیان بۆ بگەڕێتەوە. تا بەزوترین کات بگەنە ئەنجامێکی یەکلاکەرەوە، لەبەرئەوەی سروشتی هزری هێمنی هۆشیار کە ڕووبەڕووی کەسێتی پەیامبەر (د.خ) و هزر و تەعالیم و پەیامەکەی دەبێتەوە. ئەوا کێشەکە لە شوێنی سروشتی خۆی دادەنێت و ئەو تۆمەتە بە تەواویی ڕەتدەکاتەوە.

جا ئەو کەشە هەڵچوونییە بەرامبەر بە ئیسلام هەر لە سەرەتای هاتنی ئایینی

ئیسلامەوە لەلایەن بێباوەڕان و هاوەڵپەیداکەر و...تاد و تا ئەمڕۆش درێژەی هەیە. جارێک بە کۆنەپەرست و جارێک بە دژایەتیکردنی نەتەوایەتیی و پاشانیش بە هاوکاریکردنی دوژمنان لە چوارچێوەی کێشەی ڕزگاریخوازیی نیشتیمانی و سیاسیی و هەندێکجاریش بەوەی کە یاساکانی ئیسلام دڕندانەن و مافەکانی مرۆڤ پێشێل دەکەن، لەوانەش دەستبڕینی دز و بەردبارانکردنی زیناکەر و...تاد بە نموونە دەهێننەوە، لەبەرئەوە لەگەڵ یاساکانی سەردەم و نوێ ناگونجێن. بۆیە بەڕێگەی زانستیی و لەسەر ڕێسا زانستییەکانی دەروونناسیی و کۆمەڵناسیی داوای چارەسەرکردنی کێشەکان و نەهێشتنی تاوان دەکەن، بەبێ ئەوەی گوێ لە یەکتر بگرن و ڕاوبۆچوون بگۆڕنەوە و کەشێکی وا فەراهەم بهێنن کە تێیدا بابەتیبوون و ژیریی و بێلایەنی باڵادەست بێت، نەک هەر لە دوورەوە قسە فڕێ بدرێت و ڕەخنە و تۆمەت ئاڕاستە بکرێت و ئامادەی بچوکترین ڕوونکردنەوە نەبێت، کە لە بەرامبەرەکەیەوە پێشکەشی بکرێت. وەک ئەوەی کە ئیسلام دینی کوشتن و تۆقاندن و تیرۆرە، ئەمە لە کاتێکدا لە چوار خەلیفەی ڕاشیدین، سیانیان لە ماڵ و مزگەوتدا تیرۆر کران. واتە ئەو تۆمەتانە زادەی گرێ و هەڵچوونە تایبەتییەکانە و جگە لە بەدیهێنانی ڕق و کینە و دوژمنایەتیی ناتوانێت شتێکی تر بەدیبهێنێت. سەرباری ئەوەی هەر لە سەرەتاوە ڕەتکردنەوەی بەرامبەری هەڵگرتووە، واتە پێش ئەوەی بیەوێت ڕوونکردنەوەی پێشکەش بکرێت، ئەوا ئەو حوکمی خۆی لەسەر داوە.

لێرەوە دەبێت پەیڤینکاری ئیسلام کاری (جدی) و بەردەوام بکات، بۆ دوورخستنەوەی پەیڤین لەو کەشە هەڵچوونییەی کە ڕێگە خۆشدەکات بۆ ڕەخساندنی کەشێکی دوژمنکارانە و جەنگ. تا سەرلەنوێ بیانگێڕێتەوە بۆ ڕەگ و ڕیشەکانی هزر. بۆ ئەوەی گەشتی پەیڤین لە سەرەتاوە دەستپێبکات نەک لە کۆتاییەکەیەوە.

هەروەها فەراهەمبوونی ئازادیی پەیڤینکاران ڕەگەزێکی بنەڕەتیی ڕەخساندنی زەمینەی گونجاوە بۆ پەیڤین، چونکە ئەگەر مرۆڤ لە دەسەڵاتەکانی کەسانی تر و ئەو کۆت و بەندانەی کە خراوەتە گەردن و دەستییەوە ئازاد نەکرێت، ئەوا ناتوانێت خۆی بێت. واتە بۆئەوەی کەشێکی گونجاو بڕەخسێت تا پەیڤین بە ئامانجی سروشتیی و دروستی خۆی بگات، ئەوا دەبێت پەیڤینکاران ئازاد بن، ئازادی بزووتنەوەی هزرییان کە لەگەڵیاندا متمانەیان بە کەسێتی هزریی سەربەخۆی خۆیان هەیە و دەتوانن وەک سروشت و کرۆکی خۆیان گوزارشت لە هزر و بیروباوەڕەکانیان بکەن. بۆیە نابێت لەژێر بەزەیی و تۆقاندنی هزریی و دەروونییدا بن، بەشێوەیەک لە بەرامبەر پەیڤینکارەکانی بەرامبەریان هەست بە تێکشکان بکەن.

بۆیە ئیسلام هات لەگەڵ خۆیدا ئازادیی بۆ مرۆڤەکان هێنا (**وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالْأَغْلَالَ الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ**)، (الاعراف ١٥٧ ) واتە: (ئەو کۆت و بەندانەی کە لە سەریان بوو لایدەبات).

پەیامبەریش (د.خ) بۆ ئەوەی مرۆڤەکان هەستێکی نەرێنییان لادروست نەبێت و بە ئازادانە لە مرۆڤایەتیبوونی خۆیاندا بژین و لە دەورووبەرەکانیان ببڕوانن و مامەڵەی لەگەڵدا بکەن، ئەوا تێیدەگەیاندن، کەوا من مرۆڤێکی وەک ئێوە نیم و فریشتە نیم و ناتوانم سود بەخۆم بگەیەنم و زیان لە خۆم دووربخەمەوە. هەروەک پەروەردگار دەفەرموێت: (قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ)، الكهف ١١٠).

(قُلْ لَا أَمْلِكُ لِنَفْسِي نَفْعًا وَلَا ضَرًّا إِلَّا مَا شَاءَ اللَّهُ ۚ وَلَوْ كُنْتُ أَعْلَمُ الْغَيْبَ لَاسْتَكْثَرْتُ مِنَ الْخَيْرِ وَمَا مَسَّنِيَ السُّوءُ إِنْ أَنَا إِلَّا نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ)، (الاعراف ١٨٨)

هەروەک لە ڕەگەزی سێیەمیشدا ئەوەمان ڕاگەیاند کە لە ئیسلامدا هیچ بابەتێک حەرام نییە تا پەیڤینی لەسەر بکرێت و مرۆڤەکان ئازادن لەسەر چ بابەتێک پەیڤین دەکەن. بەهەمان شێوەش لە ئیسلامدا مرۆڤەکان ئازادن کە لەگەڵ کێدا پەیڤین دەکەن، واتە کەسانێک نین کە پەیڤینکردن لەگەڵیاندا قەدەغە بێت. پەروەردگار پەیڤینی لەگەڵ ئیبلیسدا کردووە و ڕێگەی بە فریشتەکان داوە دەربارەی بەدیهێنانی ئادەم پەیڤینی لەگەڵدا بکەن. (وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الْأَرْضِ خَلِيفَةً قَالُوا أَتَجْعَلُ فِيهَا مَنْ يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ الدِّمَاءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ قَالَ إِنِّي أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ)، (البقره ٣٠). لێرەدا وەڵامی خودا چی بوو؟ ئایا سەرزەنشت و هەڕەشەکردن بوو؟ یان پێیان دەفەرموێت (إِنِّي أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ).

لەسەر ئەو بنەڕەتە دەڵێین: ئەگەر خوای بەدیهێنەری مەزن لە میانەی گوتارە قورئانییەکانەوە پەیڤینی لەگەڵ ئیبلیس و فریشتەکان و پەیامبەران و تێکڕای مرۆڤەکان کردبێت، ئەوا ئێمە دەگەینە ئەو ڕاستییەی کە بێگومان ئیسلام هیچ مرۆڤێک بە بەرزتر لە ئیسلام دانانێت، جا هەر پلەوپایەیەکی هەبێت. بۆیە لێرەدا کەسێک نامێنێت بانگەشەی ئەوە بکات و بڵێت من گەورەترم لە پەیڤینکردن!

## ٥. شێوازی پەیڤین

ڕەگەزێکی گرنگی دیکە لە کرداری پەیڤیندا بریتییە لە شێوازی پەیڤینکردن، واتە چۆنێتی ئەنجامدانی ئەو کردارە زیندووە، شێواز لە پەیڤیندا ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت لە سەرخستن و بە ئامانج گەیشتنی پەیڤینەکە. لەهەمانکاتیشدا ئەگەر بە شێوازی پێچەوانە ئەنجامبدرێت، ئەوا ڕۆڵێکی بنەڕەتیی لە شکستهێنانی پرۆسەی پەیڤیندا دەبینێت.

هەندێکجار لە ژیانی گشتیماندا بە مرۆڤێک دەبینین، کە دەیەوێت کێشەیەک یان هزر و ڕووداوێکمان پێبگەیەنێت، بەڵام ناتوانێت قایلبوونی ئێمە بەدەستبهێنێت و بەپێچەوانەوە ڕەتیدەکەینەوە، بەرپەرچی دەدەینەوە و بەرهەڵستی دەکەین. بەڵام جارێکی دیکە بە هەمان کێشە یاخود هزر ئاشنا دەبین لە گوفتاری مرۆڤێکی دیکەوە، بەوپەڕی دڵئارامیی و خۆشیی و ملکەچییەوە وەریدەگرین. ڕەنگە بچینە ناو ماڵێکیشەوە کە کەلوپەل و

ئامرازەکانی ماڵەوەی تێدا پەرش و بڵاو بێت و سەرنجمان ڕانەکێشێت، بەڵام هەمان کەرەستە و کەلوپەل لە ماڵێکی تردا ببینین، کە جێگەی تێڕامان و خۆشنودی بێت و هەست بە کرانەوە بکەین.

بێگومان ئەو جیاوازییە لە هزرەکەدا نییە، چونکە هزرەکە هەر هەمان هزرە لە جوانی و ناشرینیدا، بەڵکو ئەوە شێواز (الاسلوب)ەکەیە وامان لێدەکات، هزرێک لە کەسێک وەربگرین و لە کەسێکی دیکەی ڕەتبکەینەوە. یەکەمیان زانیویەتی کە چۆن بچێتە ئەو شوێنەی دەیەوێت بچێت و لە ژیانی کەسانی تردا درکی بە شوێنە لاواز و بەهێزەکان کردووە. بۆئەوەی بگاتە ئامانج و مەبەستەکانی گوێگرتنی کەسانی تری قۆستووەتەوە. لەکاتێکدا کەسی دووەم پەی بەم ڕاستییانە نەبردووە و لە دۆخێکی پێچەوانەی ئەو دۆخەوە هەنگاوی ناوە، کە بە خراپی بەسەر هزرەکەیدا دەشکێتەوە. لە ماڵەکەشدا بینیمان کە چێژی جوانی جۆرێک لە ڕێکخستن و ڕازاندنەوە دەسەپێنێت، کە ڕەونەقێکی ناوازە بەدەستدەهێنێت، لە میانەی ڕێکخستنی کەلوپەلەکان و گونجانیان لە ڕەنگەکانیاندا. ئەمە لەکاتێکدا لەوەی ترياندا ڕەچاو ناکرێت، چونکە خاوەنی چێژی جوانیی نییە. بێگومان لە هزرەکەدا شێوازی خستنەڕوو و ئەداکردن و لە ماڵەکەشدا شێوازی ڕێکخستن و گونجاندن یەکلاکەرەوەبوون. ئێمە لە هەردوو شوێن و بارەکەدا بە شێواز دەگەین، بەڵام شێوازێکی جوان لە یەکێکیاندا و ناشرین لە ئەوی دیکەدا. لە میانەی خوێندنەوەیەکی هۆشیارانە بۆ شێوازەکانی پەیڤین لە قورئانی پیرۆزدا بە دوو شێوازی زۆر جیاواز دەگەین، لە پەیڤینی هزریی و ململانێ لە بوارە جیاوازەکاندا:

یەکەم- شێوازی توندوتیژ: لێرەدا ڕووبەڕووی نەیارەکەی بە توندترین وشە دەبێتەوە، بەشێوەیەک هەموو توانایەکی خۆی لەوەدا چڕدەکاتەوە، کە ئازاری بدات و ڕێزی بشکێنێت و هیچ بوارێک بۆ ڕەچاوکردنی هەست و سۆزی قسەکردن لەگەڵیدا لەسەر بنەڕەتی تێگەیشتنی واقیع و هەلومەرجی ژیانی ناهێڵێتەوە، بەڵکو ئاڵنگاریی بنەڕەتە لە نواندنی ئەم شێوازەدا.

لێرەدا پێویست بەوە ناکات، جەخت لەسەر ئەوە بکەینەوە، کە ئەو شێوازە جگە لە ڕق و کینە و دژایەتیی زیاتر و دوورکەوتنەوە لەو کەشانەی کە هزرەکانیان لە یەکتر نزیکدەبێتەوە، شتێکی دیکە بەرهەم ناهێنێت.

دووەم- شێوازی میانڕە و یان ئاشتیی: لە ململانێدا نەرم و نیانی و خۆشەویستی بە بنەڕەت دادەنێت، واتە ئەو شێوازە کە هەموو وشە جوان و ناسک و باشەکان بەکاردەهێنێت، دڵەکان لە بەرامبەر ڕاستیدا والا دەکات و دوور لە هەموو واتا شەڕەنگێز و توندڕەو و خراپەکان هزرەکان لە بازنەی چەمک و حوکمەکانی نزیک دەکاتەوە.

ئیسلامیش جەختی لەسەر ئەو شێوازە کردووەتەوە لەسەر بنەڕەتی دوو ئامانج:

- ئامانجی گەیشتن بە زانین و مەعریفە.
- ئامانجی گەیشتن بە هەڵوێستی ڕاست.

(وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِمَّنْ دَعَا إِلَى اللَّهِ وَعَمِلَ صَالِحًا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ الْمُسْلِمِينَ (٣٣) وَلَا تَسْتَوِي الْحَسَنَةُ وَلَا السَّيِّئَةُ ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ فَإِذَا الَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ عَدَاوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِيٌّ حَمِيمٌ (٣٤) وَمَا يُلَقَّاهَا إِلَّا الَّذِينَ صَبَرُوا وَمَا يُلَقَّاهَا إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ)، (فصلت ٣٣-٣٥). واتە: (جا کێ لەو کەسە جوان گوفتارتر و قسەی بەجێتره کە بانگەوازی کردووە بۆ لای خوا، کار و کردەوەی چاکیشی ئەنجامداوە و وتوویەتی: بەڕاستی من لە ڕیزی مسوڵمانانداm. بێگومان چاکە و خراپە وەک یەک نین، (تۆ ئەی باوەڕدار) بە جوانترین و چاکترین شێوە بەرەنگاری خراپە و نادروستی بکە، ئەوکاتە ئیتر دەبینین ئەوەی کە لە نێوان تۆ و ئەودا دوژمنایەتیی و ساردییەک هەیە و دەبێتە دۆستێکی دڵسۆزی گیانی بە گیانی. جا کەسیش ناتوانێت بەو ڕەفتارە هەستێت جگە لەوانەی ئارامیان گرتووە، هەروەها کەسیش ناتوانێت هەڵوێستێکی وا بنوێنێت جگە لەو کەسەی خاوەن بەهرەیەکی گەورەیە.

لە میانەی خوێندنەوەی دەقە قورئانییەکەی سەرەوە تێبینی ئەوە دەکەین، کە شێوازی میانەڕەو هەڵدەبژێرێت و ئاماژە بۆ ئەنجامە باشەکانی دەکات، کە خۆی لە گۆڕینی دوژمن بۆ هاوڕێ دەبینێتەوە و هەمان هزر هەڵدەگرن و بەرگریی لێدەکەن و کاری پێدەکەن.

جا بۆ پشت ئەستووریی ئەو شێوازی دانایی میانڕەوییە بە دوو ئایەت دەگەین کە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ جەخت لەسەر شێوازی پەیڤین دەکات، ئەوانیش:

- (ادْعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ ۖ وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ ۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِ ۖ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ)، النحل ١٢٥). واتە: (بانگەواز بکە بۆ لای بەرنامە و ڕێبازی پەروەردگارت بەحیکمەت و دانایی و ئامۆژگاریی جوان و بەجێ و گفتوگۆ و موجادەلە بە جوانترین شێوە، چونکە بەڕاستی پەروەردگارت هەر خۆی زانایە کە کێ گومڕایە و هەر خۆشی زانایە بە هیدایەت وەرگران.
- (وَلَا تُجَادِلُوا أَهْلَ الْكِتَابِ إِلَّا بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِلَّا الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْهُمْ ۖ وَقُولُوا آمَنَّا بِالَّذِي أُنزِلَ إِلَيْنَا وَأُنزِلَ إِلَيْكُمْ وَإِلَٰهُنَا وَإِلَٰهُكُمْ وَاحِدٌ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ)، (العنكبوت ٤٦). واتە: ( گفتوگۆ و (مجادلە) مەکەن لەگەڵ خاوەن کتێبە ئاسمانییەکاندا، مەگەر بە جوانترین شێوە نەبێت، جگە لەوانەیان کە ستەمیان کردووە و پێیان بڵێن: ئێمە باوەڕمان هێناوە بەوەی بۆ ئێمە و ئێوە دابەزێنراوە و خوای ئێمە و ئێوە یەکێکە، ئێمە فەرمانبەرداری ئەو زاتەین).

لە ئایەتی یەکەمدا بانگەوازە بۆ جەدەل بە باشترین و جوانترین شێوە، ئەوەش ئەوە دەخوازێت جوانترین و نموونەیترین شێواز بگیرێتەبەر بۆ قایلکردنی بەرانبەرەکە بەو هزرەی کە پەیڤینەکەی لەسەر دامەزراوە. واتە لێرەدا بانگخوازیی لە ڕێگەی خوادا دەبێت بەوپەڕی هۆشیارییەوە و هەموو ئەو شێوازانەی کە خراونەتەڕوو،

باشترینیان هەڵدەبژێرێت، واتە چ لەو وشانەی کە بەکاریان دەهێنێت و ئەو واتایانەی کە گوزارشتیشیان پێ لێدەکات. بەڵام لە ئایەتی دووەمدا بانگەوازە بۆ پەیڤین لەگەڵ خاوەن کتێبە ئاسمانییەکاندا، لەسەر بنەمای شوێنە بەیەکگەیشتوو و خاڵە هاوبەشەکانە لە هزر و پەیامدا. بۆیە لێرەدا دەبێت ئەوە ڕابگەیەنین کە بەهای مەزنی ئیسلام لەوەدایە باوەڕێکی ڕاستگۆیانەی بە هەموو پەیامە ئاسمانییەکان هەیە و هەموو پەیامبەران بە نێردراوانی خودا دادەنێت و ملکەچییش تەنها بۆ پەروەردگارە، ئەوانەش هەموو خاڵی هاوبەشن لەگەڵ خاوەن کتێبە ئاسمانییەکان. جا لەسەر ئەو بنەڕەتە بانگەوازکردن بۆ دەستپێکردن بە پەیڤین لە پرسی باوەڕدا لە بنکەیەکی هاوبەشەوەیە، نیگای ئەوەش دەکات کە لە شوێنی تردا و کێشەکانی تردا بەیەک بگەنەوە.

تەنانەت ئیسلام شارستانێتیترین شێوازی پەیڤینی ڕاگەیاندووە لەمیانەی ئایەتی (وَإِنَّا أَوْ إِيَّاكُمْ لَعَلَىٰ هُدًى أَوْ فِي ضَلَالٍ مُبِينٍ)، (سبا ٢٤). واتە: (بێگومان ئێمە یان ئێوە لەسەر ڕێگەی ڕاست و دروستی هیدایەتین، یاخود لە گومڕاییەکی ئاشکرادا ڕۆچووین).

ئەم ئایەتە خۆی بەسەر هەموو مەملەکەتی پەیڤیندا دەسەپێنێت و گومان لە هزردا بە هەڵوێستێکی هاوبەش لە نێوان لایەنەکاندا دادەنێت. ئیلهامی ئەوە بە هەریەکەیان دەبەخشێت، کە دەبێت جارێکی تر لە کێشەکە بڕواننەوە و سەرلەنوێ هەوڵی ڕووبەڕوبوونەوەی بدەن، وەک ئەوەی لەوەوپێش ڕووبەڕوونەبوویێتەوە، بەمشێوەیە لێرەدا حوکمێکی پێشینە نییە لەلایەن هەریەکەیان بەسەر نەیارەکەیدا بە هیدایەت یان گومڕایی بوون. بەڵکو ئەوە هەڵوێستێکی هاوبەشە کە دەیەوێت بگاتە ڕاستیی لەمیانەی پەیڤینێکی ڕاوەستاو لەسەر هۆشیاریی و هەستکردنێکی قوڵ بە وەستان لەگەڵ هێڵی باوەڕهێنان ئەگەر هەرچییەک بێت. بۆیە تێبینی ئەوە دەکەین، کە پەیامبەر وەک خوا فێری کردووە–لەو شێوازەیدا سیفەتی هیدایەتی بەخۆی نەبەخشیوە، لەگەڵ ئەوپەڕی بڕوای قوڵی بەوەی کە پرسەکە لەوەوە دوور نییە بۆئەوەی واز لە پەیڤین بهێنێت، کە ڕەوتی خۆی وەربگرێت، بەبێ هیچ ئاڵۆزییەک بە مەبەستی گەیشتن بە ئەنجامێکی یەکلاکەرەوە.

ڕەنگە بەهای ئەو شێوازە لەوەدا بێت، کە هەڵوێستەکە لە هەرچی حەساسەتیەتێکی ئیجابی لە تێڕوانین بۆ خود و بۆ کەسانی تر دادەبڕێت. بەوپێیەی کە هەریەکەیان پێشتر ڕای خۆی بەڕاست دەزانێت، واتە جیاواز لەو ڕێگە ناسراوەی شێوازی زانستیی کە بۆ پەیڤین خراوەتەڕوو، کە دەڵێت: (رای صواب یحتمل الخطا و رای غیری خطا یحتمل الصواب) واتە: (ڕاو و بۆچوونەکانم ڕاستن و شیمانەی هەڵەی تێدایە و ڕای غەیری خۆشم هەڵەن و شیمانەی ڕاستی تێدایە). بەڵام قورئان کە لە ترۆپکی مرۆڤایەتیبوون و بێلایەنیدایە، دروشمی (رای و رای غیری یحتمل الخطا و الصواب فی درجه واحدة) بەرزکردووەتەوە. ئەوە ڕێنیشاندانێکە لەلایەن خوداوە بۆ پەیامبەرەکەی بۆ دیدار لە

زانستەکان و غەیری زانستەکانیشدا. ئەوەش لەبەرئەوەیە ئەگەر یەکێک لە پەیڤینکارەکان بە ئەوی تریان گووت ئەوەی کە تۆ دەیڵێیت هەڵەیە و تۆ کەوتوویتەتە هەڵەوە، ئەوا یەکسەر تورە دەبێت و لەکاتی تورەبوونیشدا تیژی هزر نامێنێت و هەڵپە بۆ تێگەیشتن دەوەستێت و مەبەستەکە لەناودەچێت.

ئەوە ئەو شێوازە مرۆڤایەتییە ناوازەیە لە جوڵاوی کەشەکانی پەیڤیندا و لەسەر هێڵی بێلایەنی هزردا. بەوپێیەی کە پەیڤینکاری باوەڕدار هزرەکەی خۆی دەخاتەڕوو لە چوارچێوەی بازنەی شیمانە (احتمال)دا کە گریمانەی هەڵە و ڕاست یان ڕێنمونی و گومڕایی یەکسان دەکات. بۆئەوەی بە گیانی توێژینەوە و گەڕان بەدوای ڕاستیی لە چوارچێوەی هزردا بەیەکسانیی بچێتە پێشەوە. جا پرسەکە لە گۆڕەپانی گومان دەخاتەڕوو و وەک لەلایەنی باوەڕیشەوە عەودالی ئەو وشانەیە کە شوێنە هەڵەکانی بۆ ئاشکرا دەکەن، لەو شوێنە ڕاستانەی کە پێوەی پابەندە یاخود کەسانی تر پێوەی پابەندن.

لەبەر ڕۆشنایی ئەوە، تێدەگەین لە بزوتنەوەی پەیڤین لە ئیسلامدا لەسەر ئەو بنەڕەت و ڕێسا زانستییەی کە وادەبینێت گومان ڕێگەیەکە بۆ دڵنیابوون (لليقين) ڕادەوەستێت و ئەو قایلبوونانەی کە لەسەر بنەڕەتی پشتگوێخستنی پەیڤین و فەرامۆشکردنی هزر و سوربوون لەسەر سەرکەشی ڕەتدەکاتەوە، بەوشێوەیەی وا لە پەیڤینی هزریی دەکات، کە بزوتنەوەیەکی پۆزەتیڤ بێت لە وەڵامدانەوەی پرسیارە کراوەکان لەسەر هەموو بنەماکانی ئازادیی لە زانیندا، بەوەی کە ژیریی لە کێشە و گرفت و بۆچوونەکاندا دەیوروژێنێت.

ئەو ئایەتەش بۆ ئەوە هاتووە تا جەخت لەسەر ئەو ڕێسا هزرییە پەیڤینییە بکاتەوە، کە شێوازی کرداریی دروست ئەوەیە پشتدەبەستێت بە بەتاڵکردنەوەی هەڵوێست لە هزرە پێشوەختەکان کە هەڵوێستەکە بۆ گرێ (عقدە)یەک دەگۆڕێت.

# قەڵا و شوراکانی زەڵم خان ئەحمەدخان دروستی نەکردوون



حەسەن مەحمود حەمەکەریم

له دەیان شوێندا بەرچاوم کەوتووە دەڵێن قەڵای زەڵم قەڵای خان ئەحمەدخان بووە و ئەو دروستیکردووە، لەڕاستیدا قەڵای زەڵم پێش خان ئەحمەدخان بە هەزار ساڵ زیاتر هەبووە و ئەو نۆژەنی کردووەتەوە، بەڵکو باپیرە هەرە گەورەی خان ئەحمەدخان کە بابا ئەردەڵانە لە سەردەمی مەغۆلەکان ساڵی ٦٢٠ک ١٢٢٢ز هاتە قەڵای زەڵم و کردییە بنکەی دروستکردنی میرنشینەکەی و ٤٢ ساڵ لەو قەڵا کۆنە حوکمی کردووە، واتە پێش بابا ئەردەڵانیش هەبووە، لە (توحفەی ناصر)ی میرزا شوکراللە سنندجی و (تاریخ الاکرادی) مەستورەدا هاتووە کە ساڵی ٥٦٤ک ١١٩٧ز بابە ئەردەڵان دەسەڵاتی گرتووە دەست و ساڵی ٦٠٦ک ١٢٠٩ز مردووە، حەسەن کوڕی خدر کوڕی ئیلیاس کوڕی کلۆڵ کوڕی بابا ئەردەڵان قەڵای حەسەن ئاوای لە سنە دروستکرد و وازی لە قەڵای زەڵم هێنا، کەواتە قەڵای زەڵم قەڵای خان ئەحمەدخان نییە و ئەو دروستی نەکردووە ..

دوای گەمارۆدانی قەڵای زەڵم لەلایەن سوڵتان حسێنی ئامێدیی و سوپای عوسمانی، سورخاب بەگ داوای یارمەتی لە شا تەهماسبی سەفەوی(١٥٢٤-١٥٧٦) کرد، ساڵی ٩٥٠ک ١٥٤٤ز سورخاب بەگ قەڵای مەریوانی دروستکرد، دەسەڵاتی لە زەڵمەوە بۆ ئەوێ گواستەوە، کاتێک ئەلقاز میرزا برای شاتەهماسب ساڵی ٩٥٥ک ١٥٤٨ز هەڵهات بۆ لای دەوڵەتی عوسمانی، ساڵی ٩٥٦ ز ١٥٤٩ ئەلقاز نێوانی لەگەڵ عوسمانی تێکچوو هەڵهات بۆ لای سورخاب بەگی میری ئەردەڵان، سورخاب بەگ ئەلقازی لەگەڵ شا تەهماسبی برای ئاشتکردەوە، سورخاب بەگ ٣٠ ساڵ فەرمانڕەوا بوو، یانزە کوڕی هەبوو، دوای مردنی سورخاب بەگ، سوڵتان عەلی بەگی کوڕی جێگەی گرتەوە، دوای ئەویش ئەمیر تەیمورخانی یەکەمی کوڕی سوڵتان عەلی ٩٨٦ ـ ٩٩٨ ک ١٥٧٨ـ ١٥٨٩ز هات و پەیوەندی بە عوسمانییەوە کرد، سوڵتان موراد زۆری خۆش دەویست و ساڵانە سێ هەزار تمەنی ئێرانی دەدایە، ئەویش کرماشان و سونغور و زەڕین کەمەر واتە گەڕۆس و دینەوەری گرت و ئاڵای سەربەخۆیی هەڵکرد، بەڵام لە هێرش بۆ قەڵای زەرین کەمەر تەیمورخان کوژرا، چوار کوڕی هەبوو، شارەزوور بۆ عەلی بەگ، قەرەداغ بۆ بوداق بەگ، مەریوان و سەقز بۆ موراد بەگ، شارباژێڕ و قەڵای سرۆچک بۆ میر عەلەمەدینی کوڕی، بەڵام دوای کوژرانی تەیمورخان، هەڵۆخانی برای هاتە سەر حوکم، ئەوکاتە بەهۆی هێرشی ئۆزبەگەوە پشێویەکی زۆر لە ئێران هەبوو، عوسمانیش هێرشی هێناو تا قەزوین ڕۆیشت، ئەم ڕووداوانە هەڵۆخانی هاندا و قەڵای زەڵم و پاڵنگان و مەریوان و حەسەن ئاوای نۆژەنکردەوە و حەسەن ئاوای سنەی کردە پایتەخت.

دۆستایەتی لەگەڵ عوسمانی پتەوکرد و تەپڵی سەربەخۆیی لێدا، هەڵۆخان سوننی مەزهەب و ڕقی لە شیعە بوو، شاعەباس ناکۆکی ناوخۆی لەناوبرد و بووبە شایەکی بەهێزی سەفەوی، بەڵام هەڵۆخان گوێی نەدایە شا عەباس و شارەزووری داگیرکرد و

کێشەی بۆ عوسمانی و سەفەوی دروستکرد، ناچار سەفەوی و عوسمانی ڕێکەوتن، لەو ڕێکەوتننامەیەی ساڵی ١٠٢٢ک ١٦١٣ز نێوان عوسمانی و سەفەوی ناوی هەڵۆخان لە برگەی (و)دا هاتووە کە دەڵێ: (کاتێک دەوڵەتی عوسمانی هەڵۆخان لە فەرمانڕەوایەتی شارەزوور لابدات، نابێ سەفەوی یارمەتی ماددیی و مەعنەوی هەڵۆخان بدات) .. ساڵی ١٠١٩ک ١٦١٠ز حوسەین خان حاکمی لوڕستان هێرشی هێنایە سەر حەسەن ئاوای پایتەختی هەڵۆخان، بەڵام شکا، شاعەباس ترسی لێنیشت و خۆی هێرشی هێنایە سەر هەڵۆخان، بەڵام ئالی بەگی زەنگەنە ڕێکی خستن و شەڕ نەبوو، شا عەباس داوایکرد هەڵۆخان (خان ئەحمەدخان)ی کوڕی وەک بارمتە بۆ دڵسافی بنێرێتە دەرباری شا عەباس. شا زانی تازە خان ئەحمەدخان هی خۆیەتی و لەبارە دژی هەڵۆخانی باوکی بەکاری بهێنێ، هەڵۆخان لە قەڵای پاڵنگان و زەڵم و هەورامان زوڵمی زۆری کرد، ئەم هەواڵە دەگاتەوە شا عەباس، ئەویش بانگێشتی دەکات بۆ ئەسفەهان، بەڵام ناڕوات و یاخی دەبێت، شاعەباس خان ئەحمەدخان بانگ دەکات و دەڵێت: ئەگەر باوکت بهێنی بۆ ئێرە بۆ ئەسفەهان دوو قسەی لەگەڵ دەکەین و لێرە دەیهێڵینەوە، پاشان کڵاوزەڕی خوشکمت دەدەمێ و دەتکەم بە حاکمی کوردستان، پەیمانی ئەوەشی دەداتێ کە باوکی ناکوژێ، خان ئەحمەدخان بە فێڵ لەگەڵ هەندێ لە خزمانی لە ئەسفەهانەوە دێت بۆ قەڵای پاڵنگان بۆ لای باوکی کە گوایە هاتووە خوا حافیزی لە باوک و دایکی بکات بۆ سەفەری حەج دەچێت، باوکی فێڵەکە دەزانێ و ڕێی نادات بچێتە قەڵا، خان ئەحمەدخان دیاریی و پارە و شێخ و مەلای ناردە لای باوکی هەتا ڕازی بێت و سەر لە شا عەباس بدات، هەڵۆخان قەناعەتی نەکرد، خان ئەحمەدخان داوای لە دایکی کرد یارمەتی بدات بێتە ناو قەڵا، دایکی ڕەحمی جۆشی و زۆری لە هەڵۆخان کرد دەرگای قەڵای بۆ کردەوە، خان ئەحمەد خان دێتە قەڵاو تەکلیف لە باوکی دەکات کە هەرچی کردووە خۆی لەشەڕ لابدات و بچێتە خزمەت شا عەباس و دەڵێ پەیمانیشی پێداوم کە ناتکوژێ و دەبێتەوە بە حاکمی کوردستان...

بەم جۆرە بەفێڵ و تەڵەکە هەڵۆخانی باوکی دەخەڵەتێنێ و ساڵی ١٠٢٥ک ١٦١٦ز چووە ئەسفەهان بۆ لای شا عەباس، شاعەباس پەیمانی دابوو نەیکوژێ، بەڵام هەردوو چاوی ئەو پیرە پیاوە هەشتا ساڵە دەردێنێ و لە ئەسفەهان دەیهێڵێتەوە، خان ئەحمەدخان دەکرێتە حاکمی کوردستان و نازناوی لە میر و سوڵتانەوە کرا بە والی و کڵاوزەڕی خوشکی شاعەباسی گواستەوە بۆ قەڵای پاڵنگان و شیعەبوونی خۆشی ڕاگەیاند، خان ئەحمەدخان دەسکەلایەکی ئاسانی دەستی شاعەباس بوو، شەڕی زۆری بۆ کرد و موسڵ و بەغدادی بۆ گرت، لە خان ئەحمەدخانەوە میرانی ئەردەڵان سەربەخۆییان ونکرد و بونە ئەڵقە لەگوێی پاشایانی سەفەوی ئێران.

خان ئەحمەدخان لەسەر داوای شا عەباس پەلاماری کوردە ڕاپەڕیوەکانی قەڵای

دمدم دەدات و خراپ سەرکوتیان دەکات، (سەرەتای نۆکەرایەتی و ئەڵقە لەگوێی میرانی ئەردەڵان بۆ شاکانی سەفەوی لە خان ئەحمەدخانەوە دەستی پێکرد)، بەڵام گلەیی زۆر دێتە سەر خان ئەحمەدخان لەسەر ئەو خیانەتەی دەرهەق بە باوکی کردی، ویژدانی لە ناخەوە ئازاری دەدات بۆئەوەی کە بەسەر باوکی هێنای، شا عەباس بەوە دەزانێت، داوا لە خان ئەحمەدخان دەکات کە زیرەکترین کوڕەکانی بنێرێتە دیوەخانی شا تا پەروەردەی دروستی بکەن بۆ حوکمداری کوردستان، ئەویش ناتوانێ لە سەی دەربچێت و بەناچاری جوانترین و زیرەکترین کوڕی خۆی دەنێرێتە کۆشک، بەڵام بوو بە بارمتە. خان ئەحمەد خان لە هەموو لایەکەوە گیری خوارد، بۆ پەردەپۆشکردنی ئەوەی بەسەر باوکیدا هێنای، ناچار بوو قەڵای پاڵنگانی جێهێشت و هەڵهات بۆ قەڵا کۆنەکەی یەزگورد کە ناوی قەڵای زەڵمی لێنرابوو، بەرز و بەهێزی کرد و لە دەوڵەتەکانی سەفەویی و عوسمانی یاخی بوو، بەشێکی زۆر لە سنوری هەردولای دابڕی، لە ڕۆژهەڵاتەوە کوردستان و لوڕستان و کرماشان و هەمەدانی لە ئێران دابڕی، لە ڕۆژئاواشەوە شارەزوور و موسڵ و هەولێر و حەڵەب و دیاربەکری لە عوسمانی دابڕێ بێئەوەی لە ناوەوەی وڵات پشتگیرێکی وای هەبێت، چونکە پیاوێکی خائین و ستەمکار بوو بەرامبەر باوکی و میللەتەکەی و خەڵک نەیاندەویست....

سەرەتا ویستی ناکۆکی ناوەوە نەهێڵێ، بەربەستی گەورەی بەهرام میرزا بەگ و سانەکانی هەورامان بوو کە لەلایەن شاعەباسەوە بە حاکمی هەورامان دەستنیشان کرابوو، زاوای شاوێردی گەورە پیاوی دەوڵەتی شاعەباس و حاکمی لوڕستان بوو، خان ئەحمەدخان نەچووە حەسەن ئاوا و کەمتریش لە زەڵم بوو، بەڵکو لەسەر ڕێگەی دەرەوکێ و هەواری پیر ڕۆستەم نزیک هەورامانی تەخت لە دالانی بینایەکی گەورەی دروستکردبوو بۆ ئیدارە و حوکم و ئیشوکاری دەوڵەتەکەی، نزیک بوو لە هەوارەکانی پیر ڕۆستەم و هەواری گەچانی و کەماڵاو کە هەواری نادر سان و حەمەد سان و هەسەن سان بەگەکانی هەورامانی تەخت بوون. خان ئەحمەدخان لە کانی هانە قوڵەوە بە بۆری گڵی سورەوەکراو ئاوی هێنا بوو بۆ هەوار و عەمارەتەکەی کە شوێنی ئیدارە و حوکمی بووە و هاوینان لەوێ بووە نەک زەڵم. خان ئەحمەد خان شەڕی سانەکانی هەورامانی ڕاگەیاند و گەمارۆی قەڵای هەورامانی تەختیدا و سێ بۆ حەوت ساڵ هەموو ڕێگە و دەروازەکانی گرت کە دەچوو بۆ قەڵا، گەمارۆ چەند ساڵی خایاند و زۆربەی خەڵکی ناو قەڵا لە برسا مردن، هەندێک سەرکردەی ناو قەڵا هەڵهاتن و چوونە لای خان ئەحمەدخان، هەندێ هەورامیش کە لای خان ئەحمەدخان بوون چوونەوە لای بەهرام میرزا، خان زۆر ڕقی لە شاوێردی خان حاکمی لوڕستان و خەزوری بەهرام میرزا بوو، بەهرام میرزا کە زانی چاری نییە، دوو ڕێگەی دیاریکرد، یان بە دزییەوە بچێت بۆ لای

شاوێردی خەزوری و بچنە لای شا عەباس و سوپا بەرنە سەر خان ئەحمەدخان، یان بە نهێنی لە قەڵا هەڵبێت بۆ شارەزوور، بەڵکو خان ئەحمەدخان واز لە قەڵا بێنێت، شەو بە نهێنی لەگەڵ چەند کەسێکدا لە قەڵا هاتنە دەر و لە ڕێی قاچاخەوە چووە شارەزوور و دێی هەرەشەل و لەبەر ماندویێتی بێ خەم خەوتن و گومانی نەبوو کەس پێی زانیبن، نیازی وا بوو دوای دوو سێ ڕۆژ خۆی ئاشکرا بکات تا واز لە قەڵا بهێنێت، بەڵام هەر ئەو شەوە پیاوێکی بەهرام میرزا بە نهێنی لە قەڵا دێتە دەرەوە و دەچێتە لای خان ئەحمەدخان و هەواڵی هەڵهاتنی فەرهاد میرزا دەدات، ئەوانیش هەر بەیانی زوو دوای دەکەون و هەواڵ بە هەواڵ دەڕۆن و هەر خەڵکی ئەو دێیەش هەواڵ دەدەن کە شەو خەڵکی غەریبە هاتوون و گەمارۆی دێیەکە دەدەن، شەڕێک ڕوودەدات بەهرام بەگ بریندار دەبێ و دەمرێ، سلێمان بەگ سەرکردەی قەڵای هەورامان دەگرێتە دەست و شەوانە پەلاماری لەشکری خان دەدات و زۆریان لێ دەکوژێ و شپرزیان دەکات، ئەمە زیاتر لە ساڵێک دەخایەنێت...

> **لە خان ئەحمەدخانەوە میرانی ئەردەڵان سەربەخۆییان ونکرد و بونە ئەڵقە لەگوێی پاشایانی سەفەوی ئێران.**

خان ئەحمەدخان ناچار دەبێ بە فێڵ بیانخەڵەتێنێ، بە چەند پیاوماقوڵێکدا نامەیەک بۆ سلێمان بەگ دەنێرێ و دەنووسێ کە ئیتر با شەڕ و کوشتار بەس بێ و ئەوەی مەبەستمان بوو کوژرا، بۆ ئەمە چەند نامە دەگۆڕنەوە و پەیمان و سوێند دەخۆن و قازی هەردوولا دادەنیشن و ڕێکەوتن دەنووسن کە سلێمان بەگ حاکمی هەورامانە، سلێمان بەگ وا هێوردەکەنەوە خۆی دەچێت بۆ میوانی خان لە قەڵای زەڵم و پێکەوە چەند جارێک ڕاو و شکار دەکەن، لە ڕاوێکدا سلێمان بەگ و هاوڕێ و پاسەوانەکانی دەکوژن و دەچنە ناو قەڵای هەورامان و سەراپایان بەماڵ و منداڵەوە سەردەبڕن و تۆڵەی هەڵۆخان و سورخابی کوڕی لە سانەکانی هەورامان دەکاتەوە و ناهێڵێ هیچ وەچەیەک لە (هۆزی باوانم) دەربچێ جگە لە چەند کوڕێکی بەهرام بەگ کە لەوکاتەدا لە لوڕستان لای ماڵی عەلەمەدینی باپیریان بوون، پرسە لە لوڕستان ماوەیەک دەخایەنێت، دوایی کوڕەکانی بەهرام بەگ، حەسەنقولی بەگ و عەباس قولی بەگ لەگەڵ باپیریان دەچنە ئەسفەهان بۆ لای شای سەفەویی و چیرۆکەکەی بۆ دەگێڕنەوە، ئەویش ناوچەیەکی لوڕستان دەدا بە

حەسەنقولی خان و هەورامانیشیدا بە عەباس قولی خان..

لە هەموو ناخۆشتر بۆ خان ئەحمەدخان خیانەتی کڵاوزەڕی خێزانی بوو، چونکە خان ئەوەندە خەریکی شەڕ و ئاژاوە نانەوە بوو لە ماڵ دوور بوو، کڵاوزەڕی خێزانی کە خوشکی شاعەباس بوو خیانەتی لێکرد و حەزی چووە سەر کوڕێکی گەنجی قۆزی شاعیر کە ناوی (یۆسۆ ئاسکە) بوو هەمیشە شیعری جوان و ناسکی پیاهەڵگووتووە و وەسف و سەنای لەش و لاری لە ڕادە بەدەر دەکات، ئەمانە دەبنە هۆی ئەوەی کڵاوزەر چەند جار بانگی بکات و لێک نێزیک ببنەوە تا ئاستی عەشق، ئەویش شیعرەکانی تەڕوپاراو و نەرم و ناسکتر دەکات و هەست و سۆزی خۆی تێکەڵ دەکات، کڵاوزەر چەندین جار یۆسۆ ئاسکەی شاعیر بانگهێشت دەکات و دەست و دیاری پێدەبەخشێت و زۆر کەس هەست بەو عەشق و شیعر و سەردانانە دەکەن و ئەم هەواڵە دەدەن بە خان ئەحمەد، بەڵام هەمووجار کڵاوزەڕ بە شتێک ئەو پاگەندانە ڕەتدەکاتەوە و دەڵێ تەنها شیعرە و نوسینە و ئەو کوڕە گەنجە و لە من منالترە، خان ئەحمەدخان چاودێر دەخاتە سەریان و چەند کەس شایەتی دەدەن کە ئەو باسە لە شیعر و ئەدەب دەرچووە و سەری بۆ شتی خراپ کێشاوە، خان ئەحمەدخان سەرەتا لەبەر شاعەباس ناوێرێت هیچ بکات، بەڵام کە شاعەباس چاوی سورخابی کوڕی خان ئەحمەدخان دەردێنێ، ئەویش ڕقی هەڵدەسێ و شێت دەبێ و بە دەستی خۆی هەردووکیان زیندەبەچاڵ دەکات.

ئەوان ئێستە گۆڕیان دیار نییە، بەڵام لە گەشتەکانم بۆ هەورامانی تەخت و داڵانی و تەتە، هەمووجار باسی شەڕپێگێڕانی خان ئەحمەدخان بە هەورامییەکان و قەتڵ و عامی بنەماڵەی باوانم دەپرسی، ئەوانیش باسی ئەو خیانەتەیان دەکرد و دوو قەبریان نیشاندەدام کە گوایە گۆڕی ئەو دوانە بێت، دوو گۆڕ لە پاڵ یەکدا لەسەر ڕێگەی دەرەوکێ و عەمارەتی خان ئەحمەدخان و هەواری پیر ڕۆستەم کە چەند ئەفسانە و هەقایەت و ڕازیشیان بە دەوروبەردا هەیە و لە باسی ئەوان دەچێت، گۆڕەکان بەناوی (گۆڕی زەڕین گوڵ و ئاسکە) یان (گوڵزەڕین)، گۆڕی پیاو و ژنێکە بەتەنیشت یەکەوەن، کێلەکان لە بەردی هەورامان تاشراون و نوسراویان لەسەر بووە ئێستە شکاون و تێکچووە، یەکێکیان کێلێکی سورە بەردەکە نوسراوە (استاز ئیبراهیم الحداد ساڵی ١٠٤٠ ک) مردووە، ئەوی تریان کێلێکی سپیە بەردە و نوسراوە (قبر المرحومە) و ئەوی تری خوارەوەی شکاوە نازانرێ کێیە، هەنێک دەڵێن ڕوداوی زیندەبەچاڵکردنی ئەم دووانە لە قەڵای حەسەن ئاوا ڕوویداوە، گوایە لە چاڵەزیندان ماوەیەک بەندکراون تا خان لە شەڕ گەڕاوەتەوە دواتر زیندەبەچاڵی کردوون، بەڵام من لە هیچ سەرچاوەیەکدا نەمدیوە کە خان ئەحمەدخان قەڵای حەسەن ئاوای کردبێتە پایتەخت و هیچ کات لەوێ مابێتەوە، بەڵکو ئەو بەزۆری لە مەریوان و پاڵنگان و داڵانی و زەڵم بووە و چیرۆکی یوسف ئاسکە و کڵاوزەڕ هەر لە هەورامان ڕوویداوە.

به بڕوای من دوو یوسف ئاسکه هەبووە، یەکێکیان شاعیر ئەمەی کە لەگەڵ خاتوو کڵاوزەڕ بووە و پێکەوە لەناوچوون، یوسف ئاسکەیەکیش بووە وسو ئاسکان یان وسو ئاسکەشیان پێ گووتووە، سەرکردە و سەرکاری خان ئەحمەدخان بووە لە ناوچەی پشدەر و دەربەندی ڕانیە، یوسو ئاسکە قەڵایەکی نزیک قەڵا کۆنەکە دروستکرد لەبەری ئاسۆس ئێستەش شوێنەواری ماوە و دیومە، دیوارەکانی بە بەردی گەورە دروستکراون، هەتا ئێستاش پێی دەوترێت قەڵای وسو ئاسکان وسو ئاسکە. هەندێک دەڵێن چیرۆکی یوسف ئاسکە دوژمنان هەڵیان بەستووە، بەڵام ئەوە ڕاستەقینەیە و چوار لە مێژوونووسانی ئەردەڵانی دووسەد ساڵ لەمەوبەر و مێژوونووسانی ئەمڕۆش باسیان کردووە، مەستورە کە مێژوونوسێکی دڵسۆز و هەق بێژو موفەسیر و شەرعزان بووە باسی کردووە ..

دوای مردنی شاعەباس ساڵی ١٠٣٩ک/ ١٦٢٩ز و هاتنی شا صەفی، سوڵتان مورادی چوارەمی عوسمانی خوسرەو پاشای سەدری ئەعزەمی بە یارمەتی خان ئەحمەدخان نارد بۆ گرتنی عێراق و کوردستان داریکرد و شارەزوور و مەریوانی گرت، شاصەفیش زەینەڵ خانی سوپاسالاری نارد ئەو هێرشە بوەستێنێ، بەڵام لە مەریوان شکا، شا صەفی زەینەڵی کوشت و سوپای عوسمانی گەیشتنە ناو شاری سنە و هەمەدان، ناچار شا سەفی خۆی هاتە مەیدان و عوسمانی گێڕایەوە بۆ بەغداد، ساڵی ١٠٣٩ ک ١٦٢٩ز شا صەفی بۆئەوەی جەرگی خان ئەحمەد خان بسوتێنێ، هەردوو چاوی سورخاب بەگی کوڕی خان ئەحمەدخانی دەرهێنا و دونیای ڕۆشنی لێ تاریک کرد، خان ئەحمەد بەو هەواڵە سەختە شێت و هار بوو، دەستی کرد بە هاوار و ناڵە و فیغان و دایە پاڵ دەوڵەتی عوسمانی، سوڵتانی عوسمانی خۆی هاتە شارەزوور و کرماشان و سەنغور و هەمەدان و خۆی و گەڕۆسی بۆ گرت و هەموو ئەو ناوچانەی تەسلیم خان ئەحمەدخان بۆ ئاژاوە کرد.

دواتر خان ئەحمەدخان سکەی بەناوی خۆیەوە لێدا و وتار بەناوی ئەوەوە خوێنرایەوە و بۆ ماوەی پێنج ساڵ بە ڕەسمی پاشایەتی ناوچەکەی کرد، قەڵایەکی نوێی لە گوندی سنە دروستکرد کە گوندێکی بچوکی تایفەی زێڕین کەوش بوو کە کۆنترین بنەماڵەی ناوچەکەن بەر لە ئەردەڵانیش، دوای ئەوە بە شاری سنە ناسرا، سەفەوییەکان هێرشیان بۆ هێنا و زۆربەی ناوچەکانیان گرتەوە و خان ئەحمەدخان هەڵهات بۆ موسڵ، خان ساڵی ١٠٤٦ک ١٦٣٦ز بە یارمەتی عوسمانی هێرشی هێنایەوە بۆ مەریوان، بەڵام شکا و گەڕایەوە موسڵ و لەوێ مرد و لە مزگەوتی نەبی یونس بەخاک سپێررا، هەندێک دەڵێن خۆی فڕیدایە ناو ئاوی زەڵم و ئاو بردی، هەندێک دەڵێن بەدەستی عوسمانی کوژرا، شا سەفی فەرمانی دەرکرد کە هەرچوار قەڵاکەی زەڵم و مەریوان و پاڵنگان و حەسەن ئاوا بڕوخێنن هەتا هیچ هەڵگەڕاوەیەک پەنای بۆ نەبات.

سلێمان خان کوڕی عەلەمەدینی میری ئەردەڵان کە دوای خان ئەحمەدخان هات هەمووی ڕووخاند، ساڵی ١٠٤٨ ک ١٦٣٩ز پەیماننامەی زەهاو مۆرکرا، شارەزوور و گەرمیان کەوتە قەڵەمڕەوی عوسمانی و لاپەڕەیەکی نوێیان هەڵدایەوە لەسەر حیسابی نەفامی و کەم زەینی و زەینی عەسکەرتاری کورد، بۆ یەکەم جار کوردستان لە نێوان عوسمانی و سەفەوی بەڕەسمی دابەش کرا، ئەردەڵان بەم جۆرە عەقڵە لاوازانە ٧٠٠ ساڵ حوکمی کرد، کێشەی گەورەی ئەردەڵان پێنج شت بوو : (ناکۆکی نێوان میرزادەکان، کێشەی نێوان سانەکانی هەورامان و میرانی ئەردەڵان کە بەردەوام شەڕ بوو، خەڵک پشتیوانی میرە توندەکانی ئەردەڵانیان نەدەکرد، زۆر میری لاواز هاتن، گەندەڵی دارایی) ..

**سەرچاوەکان**


١. نەوشیروان مستەفا: کورد و عەجەم مێژوی سیاسی کوردەکانی ئێران، سەنتەری ستراتیژی کوردستان، چاپی سییەم، سلێمانی، ٢٠٠٥.
٢. عومەر خدر خدر: میرنشینی ئەردەڵان، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢.
٣. ڕەسوڵ بۆسکێنی: شوێنەوارەکانی بیتوێن، چاپخانەی حەمدی، سلیمانی، ٢٠١٨.
٤. شەمسی محمد ئەسکەندەر: مێژووی کورد لە سەدەی ١٦ هەمدا، و. شکور مستەفا، چاپخانەی ئاراس.
٥. میرزا شکرالله سنندجی: هۆز و تیرەی تایفەی کورد لە کوردستانی ئەردەڵان (فخر الکتاب)، و. ئەنوەر سوڵتانی، بنکەی ژین، سلیمانی، ٢٠٠٦.
٦. کلۆدیوس جەیمس ڕیچ: گەشتنامەی ڕیچ بۆ کوردستان ١٨٢٠، و. حەمەی حەمەباقی، دەزگای موکریان، چاپی پێنجەم، هەولێر، ٢٠١٢.
٧. مەستورەی کوردستانی: مێژووی ئەردەڵان، و. هەژار، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٢.
٨. سعد بشیر اسکندر: سەرهەڵدان و ڕووخانی سیستەمی میرنشینی لە کوردستان، وەرگێڕانی: جەوهەر کرمانج، چاپی دووەم، چاپخانەی حەمدی، سلیمانی، ٢٠٠٩.
٩. شکر الله میرزا سنندجی: تحفەی ناصری در تاریخ جغرافیای کردستان، تصحیح دکتر حشمت الله تەبیبی، انتشارات امیر کبیر.
١٠. مزەفەر بەهمەن سوڵتانی هورامی: تاریخ هورامان، تەعلیقات: دکتر نادر کریمیان سردشتی، چاپ اول، چاپ مهارت نشر احسان، تهران، ١٣٨٦شمسی.